# خوا پەرستی
# نەك
# شەخس پەرستی

وریا کردنەوەی موسلمانان
لە بیروباوەڕی کافر و موشریکان

نووسینی
مامۆستا عبد اللطیف أحمد مصطفى
ئیمام و خەتیبی مزگەوتی گەورەی چوار قورنە





دار احياء التراث العربي
بيروت - لبنان

**ناوی کتێب : خوا پەرستی نەك شەخس پەرستی ...**

**ناوی نووسەر :** مامۆستا عبد اللطیف أحمد مصطفی .

**ژمارەی سپاردن :** ژمارە ( ١٨٢ )ی ساڵی (٢٠٠٢) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حوکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .

**زنجیرە :** زنجیرەی (١) یەکەم لە زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست .

**بنکەی بڵاوکردنەوە :** کتێبخانەی سوننە / سلێمانی / کوردستانی عێراق .

**ساڵی چاپ :** (١٤٢٧ هـ / ٢٠٠٧) .

**نۆرەی چاپ :** چاپی دووەم .

**دار إحياء التراث العربي** — للطباعة والنشر والتوزيع

DAR EHIA AL-TOURATH AL-ARABI — Publishing & Distributing

بيروت – لبنان – شارع دكاش – هاتف ٥٤٠٠٠٠ – ٥٤٤٤٤٠ – ٤٥٥٥٥٩ – فاكس ٨٥٠٧١٧ – ص.ب. ١١/٧٩٥٧

Beyrouth - Liban - Rue Dakkache - Tel: 540000 - 544440 - 455559 - Fax: 850717 - p.o.box 7957/11

# پێشەكی



إن الحمد لله ، نحمده ، ونستعينه ، ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ، ومن سيئات أعمالنا ، من يهد الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له .

وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له.

واشهد أن محمداً عبده ورسوله .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴾ (آل عمران:١٠٢).

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾(النساء:١)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا؛ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ (الأحزاب:٧١/٧٠).

أما بعد : فإن خير الحديث كتاب الله ، وأحسن الهدي هدي محمد ﷺ ، وشر الأمور محدثاتها ، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار .

**موسڵمانی بەڕێز، خوێنەری ژیر:**

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

**داواكارم له خوای پەروەردگارمان هیدایەتمان بدات بۆ ڕێگای ڕاستی خوا بە تەنها پەرستی، وە بمانپارێزێت لە ڕێگای چەوتی شەخس پەرستی، وە حەقمان بە حەق نیشان بدات و پابەندیشمان بكات پێی، وە ناحەقیشمان بە ناحەق نیشان بدات و دووریشمان بگرێت لێی.**

**بێگومان خوای گەورە بەندەكانی خۆی بە پاكی دروست كردووە، واتە ئەگەر شەیتانەكانی جنۆكەو مرۆڤ لێی گەڕێن، ئەوە بە پاكی دەمێنێتەوە لە سەر ڕێگای ڕاستی خوا پەرستی. وە بۆ ئەوەی بەندەكانی خوا بەردەوام بمێننەوە لەسەر ڕاستە ڕێ، خوای گەورە**

ڕوحمێکی زۆر گەورەی پێ کردوون بە دابەزاندنی پەڕاوەکانی و ناردنی پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) بۆ ئەوەی شوبهەو داوەکانی شەیتانەکان هەڵوەشێننەوەو بەندەکانی خوا پێیان نەخەڵەتێن و گومڕا نەبن.

بەڵام لە فەترەکانی نەمانی پێغەمبەران و کەمبوونی زانا میرات گرەکانیان بە ڕاستی ـ ئەوانەی کە بەڕاستی شوێن کەوتەی قورئان و سوننەتن ـ لەو کات و شوێنانەدا شەیتانەکان بازاڕیان گەرم دەبێت و شوبهەکانیشیان ڕەواجیان دەبێت و تەرازووەکانیش پێچەوانە دەبنەوە بە شێوەیەکی وەها کە :

حەق بە ناحەق دەبینرێت و ناحەقیش بە حەق، وە شەیتانەکان شیرك دەڕازێننەوەو بە تەوحید نیشانی دەدەن، وە تەوحیدو خوا بەتەنها پەرستیش لە پێش چاوی خەڵکی دەبێزێنن و بە خراپ نیشانیانی دەدەن، وە سوننەت لایان دەبێت بە بیدعەو بیدعەش بە سوننەت و دین دەزانن، وە حەرامیان لا حەڵاڵ دەبێت و حەڵاڵیش قەدری نامێنێت. خوا پەرست و پیاو چاکان بە خراپ لە قەڵەم دەدرێن و نەفام و خراپکارانیش بەچاك!، وە ڕاستگۆیان بە درۆزن و دروزن و قۆڵبڕانیش بە ڕاست دادەنرێن، ڕۆژگار دەبێتە ڕۆژی فاڵچی و ساحیرو شەخس پەرستان، وە دوژمنایەتی دەکرێن تەنها خوا پەرستان!.

**وە ڕاستیێتی ئەم باسانەش لەم فەرموودە پیرۆزانەدا دەردەکەوێت:**

- **ئەنەسی کوڕی مالك فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((إن من أشراط الساعة أن يرفَع العلم ويظهر الجهلُ))[١] .

واتە: لە نیشانەکانی کۆتایی دونیاو هاتنی دوا ڕۆژ، بەرز بوونەوەو نەمانی زانستی شەرعی و دەرکەوتن و بڵاو بونەوەی نەزانین و نەفامیە.

- **عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:**

((إن الله لاينتزع العلم من الناس انتزاعاً، ولكن يقبض العلماءَ فيَرفع العلمَ معهم. ويَبْقي في الناس رُؤُوساً جُهَّالاً يُفتونهم بغير علمٍ، فيَضِلُّون ويَضِلُّون))[١].

(١) البخاري: ٨٠ و مسلم٢٦٧١.

واتە: خوای گـەورە یەکـسەر ڕاسـتەو خـۆ زانـستی شـەرعی هەڵناگرێتـەوە، بـەڵکو بەهەڵگرتنەوەو مراندنی زاناکان زانست نامێنێت، وە دوای ئـەوانیش پێـشەوای نـەزان و نەفام بە قورئان و حەدیس دەمێنن، کە بێ بەڵگە فـەتوا دەدەن و، خۆشـیان و خـەڵکیش گومڕا دەکەن.

- وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((سَيأتِي على الناس سنواتٌ خـدّاعاتٌ: يُـصَدَّقُ فيهـا الكـاذبُ، و يُكـذَّبُ فيهـا الصادق،ويَؤتمن فيها الخائن، ويُخوَّنُ فيها الأمينُ، وينطق فيها الرُوَيْبضةُ. قيل وما الرويبـضةُ؟ قال: الرجل التافه يتكلَم في أمر العامة))[٢]

واتە: لە نزیکبوونەوەی کۆتایی دونیادا ساڵانێکی فێڵاوی بەسەر خەڵکیدا دێـن: کـە تیایاندا مرۆڤی درۆزن بە ڕاست دادەنرێت و ڕاستگۆش بە درۆزن. وەهـەروەها خیانـەتکار بە ئەمیندار دادەنرێت و ئەمینداریش بە خیانەتکار!.

- وە پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((خوای پەروەردگار فەرمویەتی:

وإنِّي خلقت عبادي حنفاءَ كلَّهم، وإنهم أتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم: وحرّمـتْ عليهم ما أحللتُ لهم، وأمرَتْهم أن يُشركوا بالله ما لم أُنزِلْ به سلطاناً))[٣].

واتە: خوای پەروەردگار فەرمویەتی: من بەندەکانی خۆمم بە پـاکی دروسـت کـردوون لەسەر خوا بەتەنها پەرستی، بەڵام شەیتانەکان بۆ لایان دەچن و فێڵیان لێ دەکەن و دەیان خەڵەتێنن و لە ڕێی ڕاست لایان دەدەن، وە ئەوەی کە من بۆم حەڵاڵ کردون لێیـان حـەرام دەکەن، وە هەروەها فەرمانیشیان پێ دەکەن کە هاوەڵ و شەریکم بۆ دابنێن!.

- وە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ فەرمویەتی:

((كيف بكم إذا لبستْكم فتنة يربو فيها الصغير، ويهرم فيها الكبير، وتُتَّخَذُ سُـنّةً؛ فـإن غيّرت يوماً، قيل هذا منكر !

(١) مسلم:٢٦٧٣ و البخاري: ١٠٠.

(٢) ((صحيح الجامع الصغير وزيادته)).الترتيب(٤/١٤١رقم:٣١).

(٣) صحيح مسلم: ٢٨٦٥.

قيل ومتى ذلك؟ قال: إذا قلّتْ أُمناؤُكم، وكثرت أمراؤكم، وقلّت فقهاؤكم، وتُفُقّه لِغير الدين، والتُمستِ الدنيا بعمل الآخرة))[١].

واتە: حاڵی ئێوە چۆن دەبێت کاتێك کە فیتنەیەك باڵی کێشا بە سەرتانداو دایپۆشین کە ئەوەندە دەمێنێتەوە لە ناوتاندا تا بچوك تیایدا گەورە دەبێت و گەورەش تیایدا پیر دەبێت، وە بە سوننەت دادەنرێت و وەك ئەو حیسابی بۆ دەکرێت!!. وە ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان یەکێك ئەو فیتنەو بیدعەو شتە داهێنراوە بگۆڕێت، خەڵکی دەڵێن: ئەوە شتێکی خراپی کردو دینەکەی گۆڕی!!.

هاوەڵانی عەبدوڵڵاش وتیان ئەوە کەی دەبێت؟

وتی: کاتێك کە ئەمیندارانتان کەم بوون، وە ئەمیرو لێپرسراوانتان زۆر بوون، وە زانایانتانی دینیتان کەم بوون، وە خەڵکی دەرسی شەرعی خوێند بەڵام نەك لەبەر خاتری خوا، وە کەسابەت بەدین کراو دینداریتی بۆ دونیا کرا !!.

- **وە سەهلی کوڕی عەبدوڵڵ فەرمویەتی:**

((عليكم بالأثر والسُّنَّةِ ، فإنّي أخاف أنه سيأتـي عن قليل زمان إذا ذَكر إنسانٌ النبيَّ ﷺ والاقتداء به في جميع أحواله، ذمّوهُ ونفروا عنه وتبرّأوا منه وأذلّوه وأهانوه))[٢].

واتە: دەست بگرن بە سوننەت و شوێنەواری پێغەمبەرﷺ هاوەڵانی ﷺ ؛ چونکە من دەترسم ڕۆژێك بێت کە یەکێك باسی ئەوە بکات شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەون لە هەموو حاڵەتەکانیدا، ئەوە خەڵکی نەفام ، زەمی ئەو کەسە دەکەن و خەڵکی لێ دەڕەتێنن و بەڕائەتی لێ دەکەن و زەلیلی دەکەن و سوکایەتی پێ دەکەن لە ناو کۆمەڵدا !!.

بەڵێ ئێستا ئەو ڕۆژگارەمان تووش بووەو شوێن کەوتانی سوننەت غەریبن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای پەروەردگار خستویەتیە سەر شانی میراتگرانی پێغەمبەر ﷺ ئەرکی فەرمان بە چاکەو جڵەو گیری لە خراپەو، بانگەوازی کردن بۆ ڕێگا ڕاستەکەی و

(١) بڕوانە: (الأجوبة النافعة عن أسئلة لجنة مسجد الجامعة ــ الألباني ــ ص:٤).

(٢) بڕوانە: ((فتح المجيد شرح كتاب التوحيد: الباب الأول)).

هەوڵدانی گێڕانەوەی خەڵکی بۆ سەر فیترەتە پاکەکەیان و ئیسلامە دێرینەکەیان کە پێغەمبەران پێی هاتوون، بۆ ئەوەی حەق و ناحەقیان لێ تێکەڵاو نەبێت و گومرا نەبن.

وە بۆ ئەوەی منیش هەڵسم بە ئەرکی سەرشانم بە گوێرەی توانا. وە خزمەتی ئەو گەلی کوردە بکەم لە پێناوی خوا، ئەوە بە زمانی کوردی پوختەیەك دەخەمە بەر دەستی خوێنەران کە تیایدا چەند بابەتێکی گرنگ ڕوون کراونەتەوە کە ئەمانەن:

بەشی یەکەم: خوا پەرستی، بەتەنهایی و بێ شەریکی.

- پێناسەی عیبادەت.
- ڕوکنەکانی عیبادەت.
- مەرجەکانی عیبادەت.
- بۆچی خوا بپەرستین بەتەنها ؟
- عیبادەتەکان چین و، بۆ کێ دەکرێن ؟.
- گرنگی خوا بە تەنهایی پەرستن و دووری لە شیرك.

بەشی دووەم: شەخس پەرستی و شەریك بۆ خوا دانان.

- زیان و مەترسی شەریك بۆ خوا دانان لەسەر ئادەمیزاد.
- شیرك دوو جۆری هەیە:
  ١. شیرکی گەورەو ئاشکرا ( شركٌ أكبرٌ جَلِيّ ).
  ٢. شیرکی بچوك و ون ( شرك أصغر خفيّ ).
- جیاوازی لە نێوان شیرکی گەورەو شیرکی بچوك.
- چەند بەڵگەیەکی قورئانی لەسەر بە شیرك دانانی هاوارکردنە غەیری خوا.

بەشی سێهەم: شوبهەکانی شەخس پەرستان: شوبهەی یەکەم تاوەکو شوبهەی بیستەم. وە هەڵوەشێنەرەوەی شوبهەکانیان یەك لە دوای یەك، وە پوچەڵ کردنەوەیان لە لایەن خوا بە تەنها پەرستان.

- ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە چ کاتێك مرۆڤ بە تەواوی دەبێتە موسڵمانێکی ڕاست.

- وە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە بە چ شتێك مرۆڤ لە دین دەردەچێت.
- ڕوونکردنەوەی ماناو جۆرەکانی وەسیلەو واسیتەو شەفاعەت.
- وەلی خوا کێیە ؟ وە سیفەتەکانی چین ؟.
- جیاوازی لە نێوان ﴿ أولياء الرحمن وأولياء الشيطان ﴾.
- جیاوازی لە نێوان ڕێزلێنانی خوایی و گومڕاکردنی شەیتانی.
- دیاردە سەیرە ناعادەتیەکانی دۆستانی شەیتان چەند جۆرن و چۆن دەیکەن؟.
- کێ دینێکی تازەی داهێناوەو وازی هێناوە لە دینی دێرینی ئیسلام کە پێشینە چاکەکانمانی لە سەر بووە، وە کێش لەسەر دینە پاکەکە ماوە.

وە چەندان باسی تریش کە لە میانەی بابەتەکاندا ڕوون کراونەتەوە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت، بە گوێرەی لێکدانەوەی زانا میرات گرەکان.

وە ئەو بابەتانەی کە لێرەدا ڕوونکراونەتەوە پێویستە هەموو موسڵمانێکی باڵغی عاقل (المكلف) تێیان بگات ، بۆئەوەی بۆ خۆی خوا پەرست بێت نەك شەخس پەرست. وە نەشخەڵەتێت بە شوبهەی شەخس پەرستان.

وە زۆر زەروریشە موسڵمان بزانێت جیاوازی چیە لە نێوان :

حەق و ناحەق،

وە خواپەرستی و شەخس پەرستی،

وە دۆستانی خواو دۆستانی شەیتان،

وە لە نێوان بانگەوازکارانی تەوحیدو سوننەت و بانگەوازکارانی شیرك وبیدعەت !.

جا داواکارم لە خوای پەروەردگار بەرەکەت بڕێژێ بەسەر ئەم کتابەدا، وە سوود بکەیەنێت بە نوسەرو خوێنەرو پێڕاکەیەنەری. وە ڕەحمەتی خوا لەو موسڵمانەی کە زیاتر ئەم کتابەو بابەتەکانی پتەو دەکات و ڕای دەکەیەنێت. خوایەکیان پاداشتی خێرم بدەیتەوە لەسەری و لێم قەبووڵ بکەیت و لە هەڵەم ببوریت و بیکەیت بە بەڵگەو توێشووی دونیاو دوا ڕۆژم.

والحمد لله رب العالمين

# پێشەکی

# گرنگترین و لە پێشترین زانست ئەوەیە ئادەمیزاد بزانێت بۆچی دروست کراوە



الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله وآله. وبعد:

**برایان و خوشکانی موسڵمان:** ((السلام عليكم ورحمة الله وبركاته)).

**ئێمە دەزانین کە تەنها یەك پەروەردگار ئێمەی دروست کردوەو، تەنها ئەویش ڕزق و ڕۆزیمان دەدات و، قازانج و زەرەرو، خۆشی و ناخۆشی خەڵکی بەدەستەو، پەروەردگاری هەموو بوونەوەرە (ربُّ العالمين)ـە.**

**بەڵام پێویستە پێش هەموو شتێك بشزانین کە ئەو مەبەستە چییە کە پەروەردگارمان ئێمەی بۆ بەدی هێنانی دروست کردووە. وە کتاب و بەرنامە ئاسمانیەکانی لە پێناودا دابەزاندووەو، پێغەمبەرانی پێ ناردووە، وە هەروەها ژیان و مردن و، بەهەشت و دۆزەخیشی بۆ ئەو پێناوە داناوە ؟!.**

**چونکە هەر کەسێ نەزانێت بۆچی دروست کراوەو وژیانی پێ بەخشراوەو پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە، وە هەدەف و حیکمەتی ئەم شتانەی پێشوو نەزانێت؛ ئەوە مرۆڤێکی وێڵ و سەرگەردان و گومڕاو زەرەرمەندە، پەنا بەخوا.**

**وە باشترین و ڕاست ترین سەرچاوەی زانستیش، کە لێیەوە ئەو مەبەست وهەدەف و حیکمەتە بزانین، بریتییە لە قورئانی پیرۆز، کە وتەو کەلامی ئەو پەروەردگارە یە کە دروستی کردوین.**

## لە ئایەتەکانی قورئاندا، بە چەندان شێوە دەردەکەوێت، کە مەبەست و هەدەف ئەوەیە: خوا بە تەنها بپەرسترێ،

**بۆ نمونە :**

١. تاکە مەبەستی پەروەردگار لە دروست کردنی مرۆڤ و جنۆکە، ئەوەیە کە بە تەنهاـ بێ شەریك ـ بیپەرستین: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذريات:٥٦)

واتە: دروستم نەکردووە جنۆکەو مرۆڤ، تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە بەتەنهاـ بێ شەریك ـ بم پەرستن.

٢. تاکە مەبەستی پەروەردگار لە ناردنە خوارەوەی پەڕاوو کتابە ئاسمانیەکان بە گشتی و قورئانیش بەتایبەتی ـ ئەوەیە کە بە تەنهاـ بێ شەریك ـ بیپەرستین:

﴿يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ﴾ (النحل:٢)

﴿الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ. أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنَّنِي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ﴾ (هود:١-٢)

٣. یەکەم فەرمان کردنی قورئان بە ئێمە ئەوەیە کە بە تەنها بیپەرستین. وە یەکەم نەهی قورئانیش لە ئێمە ئەوەیە کە هیچ شەریکی بۆ دانەنێین:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ. الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ، فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة:٢١-٢٢).

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ﴾ (الاسراء: ٢٣)

٤. تاکە مەبەستی پەروەردگار لە ناردنی پێغەمبەران ـ عليهم الصلاة والسلام ـ ئەوەیە کە بە تەنهاـ بێ شەریك ـ بیپەرستین:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ (الانبياء:٢٥)

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ (النحل: ٣٦).

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (الأعراف:٥٩)

﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ (الأعراف:٦٥)

﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ﴾ (الأعراف:٧٣)

﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ (الأعراف: ٨٥)

# گرنگی خوا بە تەنهایی پەرستن و دووری لە شیرك لەوەدا دەردەكەوێت كە

## كێشەی نێوان پێغەمبەران و موشریكەكانی گەلەكانیان تەنها لەسەر ـ تەنها خوا پەرستن ـ بووە:

* قەومی نوح:

﴿ وَقَالُوا لا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلا تَذَرُنَّ وَدّاً وَلا سُوَاعاً وَلا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْراً. وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيراً وَلا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلالاً ﴾ (نوح:٢٣-٢٤).

* عادی قەومی هود:

﴿ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللَّهَ وَحْدَهُ. وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا . فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴾ (الأعراف:٧٠).

﴿ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴾ (الأحقاف:٢٢).

* ئەمودی قەومی صالح: (هود:٦٢)

﴿ قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنْتَ فِينَا مَرْجُوّاً قَبْلَ هَذَا أَتَنْهَانَا أَنْ نَعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾

باوكی ئیبراهیم و قەومەكەی:

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَداً حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ﴾ (الممتحنة: ٤)

﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنْتَ عَنْ آلِهَتِي يَا إِبْرَاهِيمُ لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيّاً ﴾ (مریم: ٤٦)

﴿ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَى أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيّاً ﴾ (مریم: ٤٨).

* مەدیەنی قەومی شوعەیب: (هود:٨٧).

﴿ قَالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلاتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ إِنَّكَ لَأَنْتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ ﴾

* ئەهلی مەشورەتی فیرعەون بەرامبەر موسا هارون:

﴿ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا الْكِبْرِيَاءُ فِي الْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴾ (يونس:٧٨).

﴿ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴾ (غافر: ٨٤).

* موشریكەكانی قورەیش بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ :

﴿ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي الْقُرْآنِ وَحْدَهُ وَلَّوْا عَلَى أَدْبَارِهِمْ نُفُوراً ﴾ (الاسراء:٤٦)

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ (الزمر:٤٥).

﴿ذَلِكُمْ بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِنْ يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا . فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ﴾ (غافر:١٢).

﴿ وَعَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ. أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ. وَانْطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَى آلِهَتِكُمْ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ. مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ ﴾ (ص:٤-٧).

﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِنْ يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولًا. إِنْ كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا لَوْلَا أَنْ صَبَرْنَا عَلَيْهَا وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ الْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا. أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنْتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا. أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ (الفرقان:٤١-٤٤)..

## حەقی خوا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە
## بە تەنها بیپەرستن و شەریکی بۆ دانەنێن

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم:
ئەی موعاز، دەزانیت حەقی خوا لەسەر بەندەکانی چیيە؟.
موعاز وتی: خواو پێغەمبەری خوا شارەزاترن.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەیە بیپەرستن وە شەریکی بۆ دانەنێن.
دوایی فەرمووی ﷺ وە ئایا دەزانی حەقی (پاداشت دراوەی) بەندەکانیش لەسەر خوا چیيە؟!.
وتی: خواو پێغەمبەری خوا شارەزاترن.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەیە کە سزایان نەدات کە حەقی ئەویان بەجێ گەیاند[1].
* کەواتە مرۆڤی باش ئەوەیە کە حەقی خوا بەجێ دەگەیەنێت و خۆی بە زل نازانێت لە ئاستی پەرستن و بەندایەتی کردن بۆ خوا، وەك پێغەمبەران و فریشتەکان و پیاوچاکان:

﴿ إِنَّ الَّذِينَ عِنْدَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ ﴾ (الأعراف:٢٠٦).

﴿ وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ عِنْدَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ﴾ (الانبياء:١٩).

* وە هەر کەسێ خۆی بەزل بزانێ لە ئاستی مل کەچی نواندن و پەرستنی خوا، ئەوە خراپترینی خەڵکیيەو، بە زەلیلی و سەرشۆڕیشەوە دەچێتە دۆزەخەوە:

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ؛ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر: ٦٠).

---

(1) صحيح البخاري: ٧٣٧٣.

**پەرستن و بەندایەتی بۆ كردن، تەنها مافی پەروەردگارەو، نابێت بۆ غەیری خوا بكرێت؛ چونكە شیركەو، مرۆڤ پێی لە دین دەچێتە دەر**

پەوەردگار فەرمانمان پێدەكات:﴿ واعْبُدُوا اللَّهَ ولا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً ﴾(النساء: ٣٦).

واتە: بەتەنها عیبادەتی (الله) بكەن و لە هیچ شتێكدا شەریكی بۆ بڕیار مەدەن.

كەواتە پێویستە مرۆڤ هیچ جۆرێكی عیبادەت بۆ غەیری خوا نەكات؛ نە بۆ فریشتە (الملائكة)، وە نە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە نە بۆ جنۆكە، وە نە بۆ پیاوچاكان (الأولیاء والصالحین)، چونكە ئەگەر عیبادەتی خوای كرد، بەلاّم لەگەڵ خوا پەرستنیدا، پەرستنی بۆ غەیری خواش كردو، هەندێك لە جۆرەكانی عیبادەتی بۆ غەیری خوا كرد؛ ئەوا ئەو غەیری خوایەی كردوە بە شەریكی خوا لە پەرستن بۆكردنداو، وە بە كافرو موشریك حیساب دەكرێت و، خوا پەرستیەكەی بێ كەڵك دەبێت و، لێی وەرناگیرێت و، بەوە ئیسلامەتیەكەی هەڵدەوەشێتەوەو،، وە بەرەو دۆزەخ دەچێت بە هەتا هەتایی، ئەگەر دوای ئاگادار كردنەوەش تۆبە نەكات و پەشیمان نەبێتەوە.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ؛ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهاً وَاحِداً؛ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (التوبة: ٣١).

واتە: جولەكەو گاورەكان زاناو خواپەرستەكانی خۆیانیان كردبوون بە پەروەردگار؛ بەوەی كە بە پێچەوانەی شەرعی خوا حەلاّڵ و حەرامیان لێ وەردەگرتن، وە هەروەها پێغەمبەر عیساشیان كردبوو بە پەرستراوو، پەرستنیان بۆ ئەنجام دەدا؛ لە حاڵەتێكیشدا كە فەرمانیان پێ نەكرابوو بەوە نەبێت كە تەنها یەك پەرستراو بپەرستن، كە هیچ پەرستراوێكی حەق نیە تەنها خۆی نەبێت، وە پاك و بەرزو دوورە لەوانەی كە دەیانكەنە هاوشێوەو شەریكی ئەو.

كەواتە ئەگەر پەرستن بۆ پێغەمبەران و پیاوچاكانیش بكرێت، هەر بە شیرك دادەنرێت و، مرۆڤ پێی لە دین دەچێتە دەر.

وە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ، إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، وَمَأْوَاهُ النَّارُ، وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾ (المائدة: من الآیة٧٢).

واتە: ئەوەی شەریك بۆخوا دابنێت لە عیبادەتدا، ئەوە پەروەردگار بەهەشتی لێ حەرام كردوەو، شوێنی دۆزەخەو، كەسیش پشتیوانی ئەو زاڵمەی پێ ناكرێت كە شەریكی بۆ خوا بڕیار داوە.

# پێناسەی عیبادەت:

**عیبادەت لە زمانی عەرەبیدا بەمانای:(الذُّلُّ والخُضُوعُ) دێت، واتە: زەلیلی وملكەچی.**

**وە لە شەرعدا عیبادەتکردن (التعبُّد) بریتییە لـە:** ((التذلل لله محبّةً وتعظيماً، بفعل أوامره واجتناب نواهيه، على الوجه الذي جاءت به شرائعُه)) [1].

**واتە: زەلیلی و ملكەچی نواندن بۆ خوا، زەلیلییەك کە لە خۆش ویستن و بە گەورەدانانـەوە بێت، بە بەجێ گەیاندنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنـەوە لـە نەهیـەکانی، بـەو شـێوەیەی کـە شەرعەکەی پێی هاتووە.** [2]

**بەڵام خودی عیبادەت لە شەرعدا بریتییە لە:**

(اسم جامع لِكُلِّ ما يُحِبُّهُ الله، ويرضاه؛ من الأقوال والأعمال الظاهرة والباطنة، مع كمال المحبَّة والذل والخضوع، والبراءة مما يُنافي ذلك ويُضادُّهُ) [3].

**واتە: وشەی عیبادەت ناوێکی کۆو گشتییە، بۆ هەموو ئـەو گوفتـارو کـردارە، دەرەکـی و ناوەکییانەی، کە پەروەردگار پێی خۆشـن و، پێیـان ڕازییـە. وە بەجێگەیاندنی ئەوشـتانەی پێشوو بەو پەڕی خۆشویستنەوە بۆ خوا، لەگەڵ تەواوی زەلیلی و ملكەچی نواندن تیایانـدا بـۆ خوا. وە هاوکات دووریش کەویتـەوە لە هەموو ئەو کردارو گوفتارانەی کە ئـەوەی پێـشوت لـێ لاواز بکات، یا هەڵێ وەشێنێتەوە.**

(1) ((شرح ثلاثة الأصول)) ص: ٣١. للشيخ ابن عثيمين -رحمه الله-.

(2) **تێبینی: دوو جۆر بەندە هەیە؛ چونکە بەندایەتی دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەم: بەندایەتییەکی بێ ویست و ئیرادە بۆ پەروەردگارێتی خوای گەورە (عبدٌ لربوبيَّته). واتـە بەنـدەی کراو بەبەندە(عبدٌ بمعنى مُعَبَّد) بێ هەڵبژاردن و ویست ومەبەستی بەندە خۆی.**

**ئەو جۆرە بەندایەتییەش هەموو بونەوەر دەگرێتەوە، بە گیاندارو بێ گیان. موسڵمانان و کافر. هـەر هـەموویان مـل کەچ و ژێرباری ویستە قەدەریە بونەوەریەکانی پەروەردگارن و، پەروەردگارێتی خوای گـەورە زاڵـە بەسـەریانەوە، کـەس ناتوانێت ویست و ئیرادەی قەدەری خوا ڕەت کاتەوە. واتـە کـەس ژیـان ومـردن وتەمـەن کـورتی و درێـژی و، نێرێتـی ومێیەتی و، سپێتی ورەشێتی و، سـاغی وناساغی خۆی بەدەست نییە:** ﴿ إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً﴾.

**واتە هیچ یەكێك نیە لەئاسمانەکان وزەویدا ئیللا بەسیفەتی بەندە دەگەڕێتەوە بۆلای خوا**

**جـۆری دووەم: بەندایەتیەك بە ویست و ئیرادەی بەندە خۆی بۆ لایەنی پەرستارێتی خوای گەورە (عبـدٌ لأُلوهيَّتـه). ئەوەش بەندایەتی ئەوانەیە کە خۆیان بە ویست وئیرادەی خۆیان، ئیرادەی شەرعیی دینی خوا بەجێ دێنن (عبدٌ بمعنى عابد). بەندایەتی کردنێکە ئەوپەڕی زەلیلی و، تەواوی خۆش ویستنی تێدایە بۆ پەرسـتارێتی بەخـشندەی خـاوەن نـاوە جوان وسیفاتە بەرزەکان. ئەو بەندایەتییـەش تایبەتـە بـە بـڕواداران؛ لـە پێغەمبـەران و پیـاو چـاکان و دۆسـتان و خۆشەویستانی خوا.**

(3) ((المدخل لدراسة العقيدة الإسلامية على مذهب أهل السنة والجماعة))ص: ١١٤. د. إبراهيم البريكان.

**ڕوون كردنەوەیەك:**

(١) گوفتاری دەرەكی بریتییە لەو عیبادەتانەی كە بە زمان دەكرێن، وەك شایەتمان هێنان و بانگەوازی و فەرمان بەچاكەو نەهی لە خراپە و زیكرو دوعاو پاڕانەوەو، داوا لێ كردن و، داوای بەفریاكەوتن و، داوای پەناداں و، داوای یارمەتی لێ كردن و،..(الدعاء والاستغاثة والاستعاذة والاستعانة و الاستغفار و..).

(٢) كرداری دەرەكی بریتییە لەو عیبادەتانەی كە بە لاشە ئەنجام دەدرێن وەك: ڕكوع و سوجدە بردن و ڕۆژوو گرتن و هیجرەت كردن و جیهاد بەدەست و لاشەو، حەجی ماڵی خوا كردن. وە هەروەها ئەو عیبادەتانەش كە بە ماڵ دەكرێن وەك: زەكات و خێرو قوربانی و نەزرو سەربڕین (النذر والنحر و...).

(٣) گوفتاری ناوەكی بریتییە لەو عیبادەتانەی كە لە دڵدا دەبن، وەك: ئیعتیقاد پێ بوون و، بە ڕاست زانین.

(٤) كرداری ناوەكی بریتییە لەو عیبادەتانەی كە بە دڵ ئەنجام دەدرێن: وەك خۆش ویستن و، لێ ترسان و، پشت پێ بەستن و، دڵ پێ خۆش بوون و...:

**كەواتە عیبادەت بە (دڵ و زمان و لاشە و ماڵ) دەكرێت**

جا كاتێك مرۆڤ موسڵمانەو تەنها بەندەی خوایە، كە ئەو عیبادەتانەی بە دڵ و زمان و لاشەو ماڵ دەكرێت، هەمووی تەنها بۆ ئەو پەروەردگارە بكات كە؛ دروستی كردوەو نیعمەتی بەسەردا ڕشتووەو سوودو قازانج و ژیان و مردن و بەهەشت و دۆزەخی بەدەستە. وە لە هیچ جۆرێكیاندا كەس نەكاتە شەریكی خواو، هیچیشیان بۆ غەیری خوا نەكات: هەروەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەكەوێت: (الأنعام:١٦٢-١٦٣).

﴿ قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾

واتە: بفەرموو: (١) نوێژەكەم (كە نوێژیش بە دڵ و زمان و لاشە دەكرێت). (٢) وە سەربڕین و قوربانیەكەشم (نُسُكي) (كە ئەمەش عیبادەتێكە بە ماڵ دەكرێت). بڵێ هەموو عیبادەتی دڵ و زمان و لاشەو ماڵم، (٣) وە هەموو ژیانم و(٤) مردنیشم؛ تەنها بۆ ئەو (الله) یەیە، كە پەروەردگاری جیهانیانەو، شەریكی نییە. وە منیش بەوە فەرمانم پێكراوەو، من یەكەمی موسڵمانانم.

الإمام الطبري لە تەفسیرەكەیدا بۆئەم ئایەتە: **﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ، وَأَنْ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾** فەرمویەتی : (( يقول: وألم

أعهد إليكم أن اعبدوني دون كل ما سواي من الآلهة والأنداد، وإيّايَ فأطيعوا؛ فإن إخلاص عبادتي، وإفراد طاعتي، ومعصية الشيطان هو الدين الصحيح والطريق المستقيم)).

## مەرجەكانی عیبادەت

لە پێناسەی بەندایەتی و پەرستن بۆكردن لە شەرعدا كە بریتی بوو لـە: (التـذلُّل لله محبّـةً وتعظيماً، بفعل أوامـره واجتنـاب نواهيـه، علـى الوجـه الـذي جـاءت بـه شـرائِعُه). بۆمـان دەردەكەوێت كە عیبادەت چەند مەرجێكی تێدا پێویستە:

١. (**صدق العزيمة**): بوونی عەزیمەتێكی ڕاست لە سەر گوێڕایەڵی كردنێكی كردەوەیی و واقیعی، بـە بـەجێهێنانی فەرمانـەكان و دووركەوتنـەوە لـە قەدەغـەكراوەكان. كـە ئەمەش مەرجی بوونی عیبادەتە(شرطٌ لوجود العبادة). ئەم مەرجەش لـەم بڕگەیـەدا دەردەكەوێت كە خەتی بە ژێـردا هـاتووە: (التـذلل لله محبّـةً وتعظيمـاً، بفعـل أوامـره واجتناب نواهيه...)

٢. (**الإخلاص لله**): بوونی ئیخلاسێكی پاك و تەواو بۆ خوا لە پەرستندا، دوور لە ڕیایی و شەریك بۆ خوا دانان. وە ئەم مەرجەش لەم بڕگەیەدا دەردەكەوێت كە خەتی بە ژێـردا هاتووە: التذلل لله محبّةً وتعظيماً، بفعل أوامره واجتناب نواهيه،...)

٣. (**موافقة الـسنة**): بـوونی پێكاوپێكییـەكی(الموافقـه) تـەواو لەگـەڵ سـوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە خواپەرستنەكەدا. بۆ ئـەوەی خواپەرسـتیەكە دوور بێـت لـە بیدعـەو داهێنراو. وە ئەم مەرجەش لەم بڕگەیەدا دەردەكەوێت كە خەتی بە ژێردا هـاتووە:(....، على الوجه الذي جاءت به شرائعُه).

وە دوو مەرجی دواییش مەرجی گیرابوونی عیبادەتەكەن، واتە كە هەركام لـەم دوو مەرجـە نەبن؛ ئەوە عیبادەتەكە گیراو قەبوڵ نابێت.

وە ئەم ئایەتەش (الكهف:١١٠) بەڵگەیە لەسەر هەرسێ مەرجەكە:

﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ:

١. فَلْيَعْمَلْ (صدق العزيمة)

٢. عَمَلًا صَالِحًا (موافقة السُّنّة)

٣. وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ (الإخلاص لله)

## بۆچی خوا بپەرستین بەتەنها ؟

ئایا بۆچی پێویستە خوا بپەرستین؟!.

وە کە بشیپەرستین، بۆ دەبێت تەنها بۆ ئەو پەرستن بکەین و هیچ یەکێکی تر لەگەڵ ئـەودا نەپەرستین، وە تـەنها داوای یارمـەتی و بـە فریاکـەوتن و پـەناگرتن هـەر لـەو بکـەین و ئیعتیقادمان هەر بەو بێت بە تەنها ؟.

ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکانیش، خۆشەویست و دۆسـت و (أولياء الله) نـین؟. کەوابوو بۆچی دروست نیە لەگەڵ خوای گەورە هاواریش بکەینە ئەوان و ناوی ئەوانیش بهێـنین لەگەڵ خوا، وە نەزریان بۆ بکەین و ئیعتیقادمان پێیان بێت؟

### وەڵامـی ئەم پرسیارە لەم چەند ڕوانگەیەکەوە دەدەینەوە:

### ڕوانگەی یەکەم:

لە پێناسەی بەندایەتی و پەرستن بۆکردن لە شەرعدا، بۆمان دەردەکەوێت کـە لـە پەرستن کردندا چەند ڕوکنێك پێویستە: ئەگەر بوونیان نەبێت، ئەوە پەرسـتنیش بـوونی ڕاسـتەقینەی نابێت، کە ڕوکنەکانیش بریتین لە:

١. زەلیلی و ملکەچی نواندنی تەواو.
٢. خۆشویستنێکی تەواو[1].
٣. گوێڕایەڵی کردن؛ بە بەجێهێنانی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان.

---

(1) تێبینی: عیبادەت دوو ڕوکنی سەرەکی و بنەڕەتی هەیە، کە بریتین لە:
كمالُ الحب وغايته، مع غاية الذل.

واتە: تەواوی خۆش ویستن، لەگەڵ ئەو پەڕی زەلیلی و ملکەچی نواندن بۆ ئەو زاتەی کە کردارو گوفتارەکەی بۆ ئەنجام دەدرێ.

کەواتە هەر کردەوەیەك کە ئەم دوو ڕوکنەی تێدا بێـت، ئـەوە عیبادەتـە؛ جـا کـە بـۆ خـوا بکرێـت، ئـەوە پەرستنێکی تەوحیدی و پیرۆزە، وە کـە بـۆ غـەیری ئـەویش بکرێـت، ئـەوە پەرسـتنێکی شـیرکی وکـوفرەو، خاوەنەکەی دەبێتە ئەهلی دۆزەخ بە بەردەوامی.

قال الحافظ الحكمي -رحمه الله-: ((وأنَّ مناطها- يعني العبادة- الذي لاقوام لها إلاّ به هو: كمال الحب وغايته، مع غاية الـذل، ولا تسمى عبادة إلاّ مع ذلك كلّه... فإذا اجتمعا في العمل كان عبادة: إن كانت لله فهو التوحيد الذي هو أشرف المطالب، وإن كانـت لغيره فالشرك الأكبر المخلد صاحبه في النار، والعياذ بالله)) . (معارج القبول) ١/٢٥٩.

جا کەبەندایەتیکردن ئەم شتانە بێت؛ ئەوە گومانی تێدانیيە کە تەنها زاتی خوای پەروەردگار شایستەو شیاوی ئەوەیە ئەم جۆرە بەندایەتیەی بۆ بکرێت بەتەنها؛چونکە:

١. زەلیلی و ملکەچی بۆ یەکێك دەنوێنرێت کە ئەوپەڕی تواناو دەسەلات و گەورەیی و تۆڵـەو سزای هەبێت. ئەم سیفەتانەش تەنها لە خوای پەروەردگاردا هەن کە ئـەوە: ﴿المجید، الكبیر، العظيم، الجليل، العليُّ الأعلى، العزيز، القويُّ، المتينُ، الجبّار، المتكبِّر، الرقيبُ، المحيطُ، القهّــار، ذو الجلال والإكرام، القابِض الباسط، المعطي المانع ﴾

٢. وە خۆشویستنی تەواو تەنها بۆ یەکێك دەکرێت، کە خۆی لە خۆیدا جوان و تەواوو سیفەت بەرز بێت لە لایەکەوە، وە لە لایەکی تریشەوە بەخشندەو میهرەبـان و خـاوەن چـاکە بێـت لەگەڵ خەڵکی بێ بەرامبەر. وە هیچ یەکێکیش ئەم دوو لایەنەی تێدا نین بەتەواوی جگـە لە خوای بەبەزەیی کە ڕەحمەتەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوەو، خـاوەنی چـەندین سـیفەتی بەرزو جوانــە وەك: ﴿ الصمد، الحميد، العفوُّ، الغفور، التواب، الودود، الفتاح، الرزاق، الغنيُّ، المُغني، الحليم، الشاكر، القريب، المجيب، الكافي﴾.

٣. وە گوێڕایەڵی یەکێك دەکرێت، کە فەرمانەکانی هەموو عەدل بن، وە فـەرمان بـە چـاکەو شتی پاك و سوودبەخش بکات، وە نەهیەکانی لە شتی خراپ وپیس و زەرەرمەند بێـت. وە هەروەها فەرمانەکانی بگونجێن لەگەڵ سروشتی مرۆڤ.

وە تەنها فەرمانی ئەو زاتە لە هەموو ڕوانگەیەکەوە عەدل و چاك و سوودبەخش و، گونجاوە لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد، کە ئادەمیزادی دروست کردووەو، بونەوەریش هەمووی لەسـەر نیزامی ئەو بەڕێوە دەچێت:

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾ (الأعراف:٥٤).

﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْأِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾(الأعراف:١٥٧).

وە هەر خوا خۆی خاوەنی ئەم سیفەتانەیە کە وادەخوازن تەنها ئەو مافی شەریعەت دانـانی هەبێت و هەر خۆی شیاوی بەرنامەو یاسا بۆ دانان بێت، وەك:

[الحكم، العدل، الهادي، الرشيد، الحق، الرب، الملك، العليم، الخبير، السميع، البصير، الخالق، الباريء، المصوِّر، المهيمن، الحيُّ القيُّوم، الأوَّل، والآخِر، والظاهِر، والباطِن]

## ڕوانگەی دووەم[1]: بێگومان:

١. هەموو زیندەوەرێك لەسەر ئەوە دروست بووەو ڕاهاتووە (مجبولٌ علَی) کە خۆشەویستێکی هەبێت و، ئەوی مەبەست بێت و، دڵی پێوەی بەند بێت و ئارام بگرێت و خۆشحاڵی تەواوی لێ وەدەست کەوێت.

٢. وە پێویستیشی بە یارمەتیدەرو گەیەنەرێك هەیە، بیگەیەنێتە داواکاریە مەبەست بووە خۆشەویستەکەی و ئەو خۆشیەی کە مەبەستیەتی.

٣. وە هەروەها مرۆڤ وا دروست بووەو، وا ڕاهاتووە کە لادان و دوورخستنەوەی زەرەرو ناخۆشی بەلاوە مەبەست بێت.

٤. وە دیسان بۆ لادانی ئەو ناخۆشیەش پێویستی بە وەسیلەو یاریدەدەرێك هەیە.

کەواتە هەموو مرۆڤێك ئەم چوار شتەی پێشووی پێویستەو، بوون و بەختەوەری نابێت بەبێ ئەم چوارە. بەڵام بابزانین ئەو چوارە چین ؟

(١) بێگومان دڵ ئەو زاتەی خۆش دەوێت و، ملکەچی بۆ دەنوێنێت و هۆگرو ئالودەی دەبێت، کە ئیعتمادی دەخاتە سەر، بۆ لێ وەدەست کەوتنی ڕزق و ڕۆزی و سەرکەوتن و سەرفرازی و بەختەوەری خۆشحاڵی. وە لەبەر ئەو هەموو بەرژەوەندیە سودبەخشانەی کە لەوەوە دەستی دەکەون.

(٢) جا کە هاتوو ئەو زاتەی کە سەرچاوەی خۆشی ئەو دڵەیە، هەر ئەویش توانای دەست خستنی خۆشیەکانی هەبوو بۆ ئەو دڵە، واتە بەیارمەتی خۆشەویستەکەی بگاتە خۆشیەکانی لە خۆشەویستەکەی. ئەوە زیاتر خۆشی دەوێت و پشتی پێ دەبەستێت و زەلیلی بۆ دەنوێنێت.

(٣) وە کە بزانێت دوورکەوتنەوە لەو زاتە، یا ڕەنجانی ئەو زاتە لێی، سەرچاوەی زەرەرمەندی و ژیان تاڵی بەردەوامی ئەو دڵەیە؛ ئەوە زیاتر دڵ پێوەی بەند دەبێت و بە گەورەی دادەنێت و، لە تووڕە بوونیشی دەترسێت.

---

(1) بۆ زیاتر سوود وەرگرتن لە ڕوانگەی دووەم تا دەیەم بڕوانە:(مجموع الفتاوی)١/٢٠-٣٦. وە(إغاثة اللهفان) ص:٢٥-٤٠.

(٤) وە دەگەڕێت بەدوای وەسیلەو یاریدەدەرێك کە لە تووڕەیی ئەو بیپارێزێت. بەڵام دوای گەڕان و پشکنین، دیسان کەسی دەست ناکەوێت بتوانێت لەو مەترسیە گەورەیە لای بدات و، تووڕەیی ئەو زاتەی لێ بەدوور بگرێت، جگە لە زاتەکە خۆی نەبێت.

کەواتە تەنها خوای پەروەردگار شیاوی ئەوەیە خۆشمان بوێت؛ لەبەر خودی خۆی لەبەر ئەوەی کە خۆی تەواوەو خاوەنی ناوو سیفەتی جوان و بەرزە. وە دیسان خۆشمان بوێت لەبەر بەخشندەیەتی و میهرەبانێتی و چاکە زۆرەکانی لەگەڵ بەندەکانی کە نایەنە ژمار.

وە پێویستە تەنها ئەو پشتیوان و یاریدەدەرمان بێت بۆ دەست کەوتنی ڕەزابوونی و بەخشندەیی و فەزڵ و نیعمەتەکانی.

وە هەر لەویش بترسین کە خاوەنی هێزو دەسەڵاتێکی گەورەو بێ سنورەو هەموو هێزەکان لە ئاستیدا بێ هێزو، بێ دەسەڵات و نەبوون.

وە تۆڵەو سزاو تووڕەیی ئەو زۆر سەختەو ئەگەر لێمان تووڕە بێت ئەوە ڕەنج بەخەسارو زەرەرمەندی بەردەوام دەبین.

وە هەر پەناش بەو بگرین، لە تووڕەیی ئەو، وەك لە حەدیسدا هاتووە:

(أعوذ: برضاك من سخطك. وبمعافاتك من عقوبتك. وأعوذ بك منك).

(اللهم أسلمت نفسي إليك و وجّهت وجهي إليك وفوضت أمري إليك، و ألجئت ظهري إليك، رغبةً ورهبةً إليك، لا ملجأ ولا منجا منك إلاّ إليك...).

(لبيك وسعديك و الخير كله في يديك والشر ليس إليك).

کەواتە لە کۆتاییدا زانیمان مرۆڤ دڵی بەخۆشەویستێکەوە دەنیشێت و زەلیلی و ملکەچی لە پێناودا دەنوێنێت و بە گەورەی دادەنێت. وە بۆ گەیشتنیشی بە خۆشەویستەکەی پێویستی بە یارمەتیدەرێك و ئاسانکارێك هەیە.

بۆمان دەرکەوت کە تەنها زاتی خوا شیاوی ئەوەیە خۆشەویستی مرۆڤ بێت و بە تەواوی دڵی پێوەی بەند بێت و، زەلیل و ملکەچی بێت و، بە گەورەی دابنێت؛ چونکە تەنها خۆشویستنی ئەو سودبەخش و بێ زیانە[٢] وە هەر ئەویش تەواوو جوانەو بەخشندەو میهرەبانەو

---

(٢) هەر یەکێکی ترت خۆش بوێت ئەگەر بۆ ئەو و لە پێناو ئەودا نەبێت. وە بۆ ئەوە نەبێت کە یارمەتیدەرت بێت بۆ زیاتر خۆشویستنی خوا، ئەوە زیان بەخشە بۆ بەندە و زەرەری زیاترە لە قازانجی.

خاوەنی سیفاتی بەرزو پاك و پیرۆزە. کە شیاوی ئەوەیە لە هەموو ڕوانگەیەکەوە خۆشمان بوێت. وە خۆشی و بەختەوەریش هەمووی لە خۆشویستنی ئەودایە.

وە تاکە زاتێکیش کە بتوانێت بە ڕەزامەندی ئەوت بگەیەنێت و خۆشیت بۆ دابین بکات و ناخۆشیشت لەسەر لابەرێت هەر تەنها خۆیەتی (سبحانە وتعالی).

کەواتە تەنها ئەو پەرستراومانەو داوای یارمەتیش هەر تەنها لەو دەکەین:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ (الفاتحة:٥).

## ڕوانگەی سێیەم:

بەڕاستی پێداویستی بەندەکان بەوەی کە تەنها (الله) پەرستراویان بێت و، پەرستنی بۆ بکەن. وەکو پێداویستییانە بەوەی کە پەروەردگاریان بێت و دروستیان بکات و ڕزقیان بدات و لەش ساغ و خۆشحاڵیان بکات.

واتە هەروەکو چۆن بەبێ ئەو پەروەردگارە نە بوونیان دەبێت، وە نە بەردەوامیش. بەهەمان شێوەش ـ بگرە زیاتریش لەمانەی پێشوو ـ ئەگەر بەندایەتی کردنیان نەبێت بۆ خوا؛ ئەوە ژیانی ڕاستەقینەیان لە دەست دەچێت و، ژیانی تاڵی دونیاو قیامەتیان تووش دەبێت. کەواتە بۆ ئەوەی خۆشحاڵی ڕاستەقینەو بەردەوامیان دەست کەوێت، ئەوە لە نان و ئاو زیاتر، پێویستیان بەوەیە کە خوا بپەرستن و لە هەموو یەکێك خۆشتریان بوێت و ڕازی بێت لێیان و لە تووڕەیی خۆی بیانپارێزێت.

چونکە فەقیریی دونیا ماوەکەی کورتەو بڕاوەیەو هەتا سەر نیە، بەڵام فەقیریی قیامەت هەرگیز ماوەیەو بەردەوام نەبڕاوەیە.

وە مرۆڤ گەر لاشەکەی ماوەیەکی کورت لە ناڕەحەتی دابێت لە ژیانی دونیای بڕاوە، ئاسانترە لەوەی دڵ و لاشەی بە بەردەوامی لە تاڵی و عەزاب و ئازاردا بێت لە دوارۆژی نەبڕاوە. پەنا بەخوا.

وە هەروەها دڵی مرۆڤ خۆش نابێت بە بەدەوامی و تەواوی لە هەموو ڕوانگەیەکەوە، تەنها بە خوا نەبێت.

بەڵام غەیری خوا ئەگەر ببێتە هۆی خۆشییەکیش بۆ دڵی مرۆڤ؛ ئەوە نە خۆشییەکی تەواوو بێ ناخۆشی دەبێت، وە نە تاسەرو بەردەوامیش دەبێت. وە بگرە زۆر جاری واش هەیە ئەو خۆشییە کاتییە، خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی ناخۆشی و ژیان تاڵی داهاتووی هەتاسەر.

وە نيشانەى ئەم ڕاستيانەش لە واقيعدا دەبينرێن زۆر بە ئاشكرا.

بۆ نمونە موسڵمانى تەنها خوا پەرست بە ڕاستى و لەسەر زانستى، بەردەوام دڵ خۆش و ڕوو گەشە. وە خۆشى و لەزەتى ئيمان و خوا پەرستيەكەى بە هەموو دونيا ناگۆڕێتەوە. وە بگرە ئەوكاتە بەلايەوە خۆشترين كاتە، كە هەموو دونياى دەكاتە قوربانيى خوا پەرستيەكەى، وە خۆشى لەو پێناوەدا بەخت دەكات.

وە تاوەكو زياترو چاكتر خوا پەرستى بكات، ئەوە زياتر لە هەموو كاتەكانى ترى خۆشحاڵترە، ئەگەر لە دونياشدا لە هەموو كەس هەژارترو بێ دەسەلات تريش بێت.

بەلام مرۆڤى دوور لەخوا، كە بەندايەتى و ملكەچى بۆ خوا ناكات و، دڵەكەى خۆشويستنى تەواوى خواى تێدا نيە، دەبينين ئەو مرۆڤانە ئەگەر خاوەنى هەموو سامان و دەسەلاتى دونياش بن، هەر دڵتەنگ و ژيان تاڵ و نا ئارام و نا مورتاحن، چونكە خۆشەويستى ڕاستەقينەيان ـ كە (الله)يە ـ لە دەست چووە، ، كە ئارامى تەواوو كامل بە دڵ دەدات : ﴿أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ ، بۆيە دەبينين هەر ڕۆژەى خۆشەويستێك دەگۆڕن و دڵيشيان هەر ناحەسێتەوە:

جا هەنديكيان خۆشەويستەكەى ماڵ و سامانە، كە لاى هەموو شتێكە، وە ئامادەش نييە دينارێك ببەخشێ بەبێ بەرامبەرو بەديل. بەلام ئامادەيە ناموس و شەرەفەكەى بفرۆشێت بە پارە.

هەندێكيشيان زەعامەت و دەسەلات وناو و شوهرەت خۆشەويسترين شتە بەلايەوە. وە لە پێناو دەست كەوتن و مانەوەى زەعامەتەكەى، ئامادەيە سەدان و هەزاران كەس بە كوشت بدات و بيانكاتە قوربانى دەسەلاتەكەى ئەگەر بە جۆگەى خوێنيش بێت !.

وە هەندێكيشيان ئافرەت سەرخۆشى كردووەو بەلايەوە گەورەترين ئاوات و مەبەستەو، خۆشويستنى ئافرەت دڵى داگير كردووەو، ئاگاى لە چاكەو مرۆڤايەتى و يادى پەروەردگارى نەماوە.

بەلام بێگومان هەر يەك لەم سێ خۆشەويستەى ئەوان، ئاكامێكى تاڵى دەبێت و ژيانى ناخۆشيشى بەدواوەيە.

وە جارى واش هەيە كە خۆشەويستەكەى دەست ناكەوێت، يان لە دەستى دەچێت، خۆى ئينتيحار دەكات و خۆى دەكوژێت. كەواتە خۆشەويستەكەى بووە هۆى ناخۆشحاڵى دونياو دوا ڕۆژى. وە لەزەتى خۆشەويستيەكەى وەكو خواردنێكى شيرينى ژەهراوى كراو وابوو، سەرەتا بە شيرينييەكەى خەڵەتاو، كۆتاييەكەيشى لەناوچوونى خۆى بوو بە ژەهرەكە.

کەواتە چۆن لاشە پێویستی بە خواردن و خۆراك و ئیسراحەت هەیە، بە هەمان شێوەش ـ بگرە زیاتریش ـ دڵ پێویستی بە خۆشی و ئیسراحەت هەیە. وە تاکە خۆشی و ئیسراحەت و ئارام و لەزەتی دڵ، لەوەدایە کە تەنها خوا پەرستراوی بێت و لە هەموو یەکێك زیاتر خۆشی بوێت و ڕەزا بوونی ئەوی دەست کەوێت و تووڕەیی و سزای ئەوی لێ بەدوور بێت.

## ڕوانگەی چوارەم:

لە دوو ڕوانگەی سەرەکییەوە بەندەکان بە دڵەکانیان دەگەڕێنەوە لای خوای پەروەردگاریان.

ڕوانگەی یەکەم: ئەوەیە کە مرۆڤ هیچ سوودو قازانجێکی تەواوو بێ زیانی بەردەوامی دەست ناکەوێت لە غەیری خوا؛ چونکە سوود و قازانجی تەواو تەنها لەوەوە دەست دەکەوێت و زیان و ناخۆشیش تەنها ئەو لەسەری لادەدات. لەبەر ئەوە داوای یارمەتی لێ دەکات و پشتی پێ دەبەستێت، وە ئەو داوای یارمەتی لێ کردن و پشت پێ بەستنەش وای لێ دەکات خۆشی بوێت و سوپاسی بکات و بەندایەتی بکات لە بەرامبەر ئەو هەموو نیعمەتە زۆرانەی کە لەگەڵیدا کردووە.

واتە پشت پێ بەستنی و داوا لێ کردنی دەیگەیەنێ بە خۆش ویستنیو بەندایەتی کردنی. کە ئەمەش ڕوانگەی دووەمە کە بریتییە لە:

بەندایەتی کردنی خوا لەبەر خۆش ویستنێکی تەواو بۆی کە هەموو دڵی پڕ کردووەو پێوەی شادو گەش و خۆشحاڵ بووە.

وە خوای پەروەردگار لە قورئانەکەیدا زیاتر لە ڕوانگەی یەکەمەوە بانگی بەندەکانی دەکات بۆ ڕوانگەی دووەم کە بریتی بوو لە بەندایەتی کردنی خوا لەبەر خۆش ویستنێکی تەواو بۆی و دڵ پێوە بەندبوون و ئاڵودە بوونی. هەروەك لەڕوانگەی یانزەهەم دەردەکەوێت.

وە نمونەی ئەم دوو ڕوانگەیەش وەك کەسێك وایە، کە بەڵایەکی گەورە، یان فەقیری، یان ترسێکی زۆری تووش بووبێت، ئەویش زۆر بە زەلیلی و ملکەچی و ئیخلاسیەوە ڕوو دەکاتە خواو داوای یارمەتی و فریاکەوتنی لێ دەکات، تا وای لێ دێت، خودی گەڕانەوەکەی بۆلای خواو موناجات و پاڕانەوەکەی لەخوا، بەلاوە خۆشتر دەبێت لەو داواکاریەی کە پێشتر هەیبوو، هەرچەندە لەسەرەتادا تەنها مەبەستیشی داواکاریەکەی بوو. نەك ئەو لەزەتی پاڕانەوە لە خواو گەڕانەوە بۆ لایی و دڵ شادبوون پێی.

## ڕوانگەی پێنجەم:

هەركەسێك یەكێكی تری ـ جگە لەخوا ـ خۆش بوێت زیاد لە پێویست، یان خۆش ویستنەكەی بۆ خواو لەپێناوی ئەودا نەبێت، ئەوە بێگومان تووشی زەرەرو ناخۆشحاڵی دەبێت بەهۆی خودی خۆشەویستەكەیەوە، لە دونیا پێش قیامەت، یان هەر لە دوا ڕۆژ، یا لەهەر دوولا. جا دەستی كەوتبێت یان نا؛ چونكە:

١. پێش دەست كەوتنی هەر لە عەزاب و غەم و پەژارەدایە، وە كە دەستیشی كەوت بەردەوام خەمی لە دەست چوونیەتی، چونكە تاكو سەر نابێت، وە كە لە دەستیشی چوو زۆر زیاتر غەمبارو دڵتەنگ دەبێت.

٢. وە ئەگەر دەستیشی نەكەوێت، ئەوە دائیم دڵی بریندارو غەمبارو تەنگە بە ئەندازەی هۆگری و گیرۆدەیی بە خۆشەویستەكەی. جا ماڵ بێت یان ئافرەت، یان ڕیاسەت وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿فَلا تُعْجِبْكَ أَمْوالُهُمْ وَلا أَوْلادُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾ (التوبة:٥٥).

ئەوە سزای دونیا، وە لە ڕۆژی دواییشدا:

﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْثَاناً مَوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا . ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُمْ بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُمْ بَعْضاً وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ نَاصِرِينَ﴾ (العنكبوت:٢٥).

﴿الأَخِلاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾ (الزخرف:٦٧).

## ڕوانگەی شەشەم:

پەروەردگار مرۆڤی بۆ ئەوە دروست كردوە كە بیپەرستێت، كە پەرستنی ئەویش بریتییە لە ناسینی و خۆش ویستنی و تەسلیم بوونی و ملكەچ بوونی و یادكردنی و بە گەورە دانانی. ئەم پەرستنەش خۆشحاڵی و بەختەوەری ڕاستەقینەی مرۆڤی تێدایە. چونكە دڵی مرۆڤ ئارام ناگرێت و خۆش نابێت و ئیسراحەت ناكات، تەنها بەوە نەبێت كە خوای پەروەردگار خۆشەویستی بێت و ئەمەل و هیواشی بە ئەو بێت و بەندەی ڕاستەقینەی ئەو بێت لە دونیا. وە لە دوا ڕۆژیشدا خۆشترین پاداشت بەلای خوا پەرستانەوە، بینینی زاتی پەروەدگاری خۆشەویستیانە.

کەواتە لە دونیا خۆشترین شت بەلای مرۆڤە عاقڵەکان ئەوەیە کە دڵەکانیان تەنها ڕوو لە خوا بن و خۆش ویستنی ئەو پڕی کردبنەوەو، یادی ئەو ئاوەدانی کردبنەوە. وە لە دوارۆژیش ڕەزا بوونی و بینینی خوا خۆشترین شتە بەلایانەوە:

(أسألك خشيتك في الغيب والشهادة... وأسألك نعيماً لا ينفد، وقرة عينٍ لا تنقطع، وأسألك الرضى بعد القضاء وبرد العيش بعد الموت، وأسألك لذّة النظر الى وجهك الكريم والشوق الى لقاءك في غير ضراء مضرة، ولا فتنة مضلة،).

وە پێچەوانەی ئەوە ئەگەر دڵ گیرۆدەی غەیری خوا بێت و، خۆشویستن و پەرستنی بۆ غەیری ئەو بێت، ئەوە سەرچاوەی هەموو ژیان تاڵی و زەرەرمەندیەکیەتی:

﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ.وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ (الانفطار: ١٣ــ١٤)

## ڕوانگەی حەوتەم:

لە پشت بەستنی مرۆڤ بە غەیری پەروەردگاری، زەرری پێ دەگات لە خودی پشت پێ بەستراوەکەی، بە پێچەوانەی هیواو ئومێدەکەی.

بۆ نمونە: مرۆڤی موشریك لە پەرستن و پشت بەستنی بەغەیری خوا، سەرکەوتن و بەختەوەربوونی مەبەستە، بەڵام پێچەوانەی ئاواتەکەی لێوە بە نسیب دەبێت، وەك دەبینین پەروەدگار لەم ئایەتانەدا ئەم ڕاستیەی ڕوون کردۆتەوە:

﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا . كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ (مريم:٨١-٨٢)

کەواتە زەرەرو ڕیسوایی مرۆڤ لەوەدایە کە غەیری خوا بپەرستێت و پشتی پێ ببەستێ، بەڵام سەرکەوتن و سەرفرازی و سەربەرزی و بەختەوەری لەوەدایە کە تەنها خوا بپەرستێت و داوای یارمەتیش تەنها هەر لەو بکات ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحة:٥).

## ڕوانگەی هەشتەم:

پێویستە مرۆڤ تەنها خوا بپەرستێت و ڕووبکاتە ئەو و ڕەجای ڕەحمەتی ئەو بکات و داوای هێنانی خێر و خۆشی و، لادانی شەڕو ناخۆشی هەر لەو بکات؛ چونکە ئەو پەروەردگارە سەرەڕای بوونی توانای لەسەر بەجێهێنانی داواکاریەکان، کە چاکەت لەگەڵ دەکات و یارمەتیت دەدات و خۆشیت بۆ دەهێنێت و شەڕت لەسەر لادەدات هەمووی تەنها بۆ خاتری خۆتە نەك بۆ خاتری خۆی. واتە خۆی لە خۆیدا دەوڵەمەند و بەڕێزو بەخشندەو میهرەبانەو بێ

پێویستە لە بەندەکانی، وە بۆ ئەوە چاکەت لەگەڵ ناکات تاوەکو تۆش ڕۆژێك لە ڕۆژان چاکەی لەگەڵ بکەیتەوە، یان بە فریای بێیت و پاداشتی بدەیتەوە.

بە پێچەوانەی مرۆڤەکان کە چاکە لەگەڵ یەکتری ناکەن بە بەرامبەر نەبێت، واتە هەر کەسێك یارمەتیت بدات ئەوە لەبەر موحتاجی و بەرژەوەندی خۆی یارمەتیت دەدات، بۆ ئەوەی پاداشتی ئەو یارمەتی و چاکە کردنەی وەربگرێتەوە لە دونیا، یان لە قیامەت، لەتۆ، یان لە پەروەردگار، بەگوێرەی نیەتی ئەو کەسە. کەواتە لە هەردوو حاڵەتدا مرۆڤ کە چاکەیەکت لەگەڵ بکات ئەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیەتی پێش بەرژەوەندی تۆ!.

کەواتە ئومێد بوونت بە چاکەو یارمەتی خوا سود بەخشەو هیچ باجێکی بەدواوە نیە. بەلاّم ئومێد بوون بە چاکەی غەیری خوا بێ باج و منەت و زەرەر نابێت؛ چونکە کەس چاکەت لەگەڵ ناکات بێ بەرامبەر تەنها خوا نەبێت کە هیچ پێویستیەکی بە بەندەکانی نیە، وە کە پەرستنیشی لەسەر داناوین بۆ بەختەوەر بوون و خۆشحاڵی خۆمانە نەك ئەو موحتاجی بەندایەتی ئێمە بێت بەڵکو ئەگەر هەموو خەڵکی خواپەرست بن هیچ لە خوایەتی خوا زیاد ناکات، وە ئەگەر هەموو خەڵکیش کافر بن هیچ لە خوایەتی ئەوکەم ناکات.

**ڕوانگەی نۆیەم:**

زۆربەی خەڵکی تۆی بۆ خۆی دەوێت نەك بۆ خۆتی بوێیت.

واتە دەیانەوێت لە تۆوە سودمەند بن، وە بەسەر تۆدا سەرکەون بۆ بەرژەوەندیەکانیان، ئەگەر چی بە زەرەری دین و دونیای تۆش تەواو بێت !.

بەلاّم پەروەردگار تۆی بۆ خۆت دەوێت، وە کە بەندایەتی لەسەر داناویت لەبەر پێویستی و موحتاجێتی خۆی نیە بەم پەرستنەی تۆ بۆ ئەو، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی تۆیەتی، تاوەکو بەختەوەری دونیاو دوارۆژ بیت. کەواتە چۆن هیوار ئومێدت بە غەیری خوا دەبەستیت و چۆن ئیعتیماد دەکەیتە سەر غەیری خوا.

**ڕوانگەی دەیەم:** ئومێد بوون بەغەیری خوا، وە پەرستن و داوا لێ کردن و پشت پێ بەستنی بێ سوودەو بگرە زەرەریشە؛ چونکە غەیری خوا:

١. نازانێت بەرژەوەندی تۆ لە چی دایە تاوەکو خوا فێری نەکات.

٢. وە ناشتوانێت یارمەتیت بدات و بەرژەوەندیەكەت بۆ دابین بكات تاوەكو خوا یارمەتی نەدات و توانای ئەوەی پێ نەبەخشێت.

٣. وەناشیەوەێت یارمەتیت بدات تاوەكو خوا وای لێ نەكات بیەوێت یارمەتیت بدات.

كەواتە هەموو شتەكان دەگەڕێنەوە بۆ خوا. كەوابوو دڵ بەستنەوە بەغەیری خواو ئومێد پێ بوون و پشت پێ بەستنی زەرەرە بۆ بەندە، نەك سود بەخش؛ چونكە وازی هێنا لەو زاتەی كە هەموو شتێكی بە دەستە، بۆ كەسێك كە هیچی بە دەست نیە تەنانەت بۆ خۆیشی.

وە ئەگەر هەموو دونیا كۆببێتەوە بۆ ئەوەی سودێك بە تۆ بگەیەنن، ناتوانن تەنها ئەوە نەبێت كە خوا بۆتی نوسیوە. وە ئەگەر هەموو خەڵكی سەر زەویش بیانەوێت زەرەرێكت لێ بدەن ناتوانن تەنها ئەوە نەبێت كە خوا لەسەری نوسیویت، وەك لە حەدیسی (ابن عباس) دا پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە[1].

## ڕوانگەی یانزەهەم[2]:

لە بەر ئەوە دەبێت تەنها خوا بپەرسترێت و سەربڕین و نەزر (لەخۆ گرتنی) بۆ بكرێت، و هاواری بكرێتێ و داوای یارمەتی و بەفریاكەوتنی لێ بكرێت؛ چونكە ئەو بەتەنها، پەروەردگارەو خالیقەو ڕازیقەو بیسەرەو بینایەو زیندووەو نەمرەو بەتواناو دەسەڵاتەو، خاوەنی هەموو بونەوەرەو، خێرو خۆشی و، زەرەرو زیان و، سودو قازانج و، هیدایەت و گومڕایی و، بەختەوەری و شەقاوەت و، دەوڵەمەندی و فەقیری و، عیززەت و زەلیلی و، مردن و ژیان، تەنها لای خوایەو بەدەست ئەوە بە تەنها. بەڵام غەیری(الله) هیچ شتێكی لەمانەی سەرەوەی بەدەست نیە بۆ خۆیشی، چجای بۆ خەڵكی.

وە پەروەردگار بە دوو ئایەت لە سورەتی (الفرقان)، ڕوونی كردۆتەوە كە تەنها خۆی شایستەی پەرستن و داوا لێ كردنەو، غەیری ئەو نا شایستەیە، وەك دەفەرموێت:

﴿ الذي له ملك السماوات والأرض. ولم يتخذ ولداً . ولم يكن له شريكٌ في الملك. وخلق كلَّ شيءٍ، فقدّره تقديراً . واتخذوا من دونه آلهةً لا يخلقون شيئاً وهم يخلقون ولا يملكون موتاً ولا حياةً ولا نشوراً﴾ الفرقان (٢ ـ ٣)

دەبینین (تەنها شایستەیی خۆی بۆ پەرستن) بە پێنج سیفات دەربڕیوە:

(1) سنن الترمذي: حديث حسن صحيح .

(2) بڕوانە (أضواء البيان)(٦ / ١٧٨ ـ ١٨٣ ) .

١ـ تەنها خۆی مەلیك و خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییەو موڵك تەنها هی خۆیەتی.
٢ـ هیچ منداڵی بۆ خۆی دانەناوەو بێ پێویستە لە جێگرو میرات گرو جێ نشین؛ چونکە خۆی بەردەوام زیندووەو خێزانی نیە. ٣ـ هیچ شەریکی نیە لە موڵکەکەیدا.
٤ـ خالیقی هەموو شتێکە. ٥ـ ئەندازەی بۆ هەموو دروستکراوێکی داناوە لەکات و شوێن و قەبارەو شێوەو چۆنیەتی، زۆر بە ووردی و ڕێکی و تەواوی.
وە لەبەرامبەر خۆیشیدا ، باسی ئە پەرستراوانە دەکات کە خەڵکی هاواریان دەکەن و نەزرو سەربڕین و پەرستنیان بۆ دەکەن، ﴿ واتخذوا من دونه آلهةً ﴾.
وە بەم سیفەتانەی خوارەوە ـ کە نیشانەی ناشایستەیین بە پەرستن ـ وەسفی ئەوانی کردووە. سیفەتەکانیش ئەمانەن:
١-﴿ لا يخلقون شيئاً ﴾ واتە: هیچ دروست ناکەن و توانای دروست کردنی هیچیان نیە.
٢- ﴿ وهم يُخْلَقُون ﴾: وە خۆیان دروست کراون و خوا دروستی کردوون.
٣- ﴿ ولا يملكون لِأنفسهم نفعاً ولا ضرّاً ﴾ واتە: هیچ سوودو زیانیان بۆ نەفسی خۆشیان بە دەست نیە.
٤-٦ ﴿ ولا يملكون موتاً ولا حياةً ولا نشوراً ﴾
واتە: بە دەستیان نیە نە مردن، نە ژیان، نە زیندوو بوونەوە.
کەواتە کەسێك یان شتێك کە ئەمە سیفەتەکانی بن، ئەوە شایستەی ئەوە نیە هاواری بکرێتێ و، هیچ جۆرە عیبادەتێکی بۆ بکرێت.
وە لە چەندان ئایەتی قورئاندا پەروەردگار بەم سیفەتانە بەراورد دەکات لە نێوان پەرستراوی حەق کە خۆیەتی و، لەنێوان پەرستراوە ناشایستەکان. هەروەك لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت:
* ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن شُرَكَائِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيْءٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ الروم : ٤٠.
واتە: (الله) کە پەرستراوی شیاوو ڕاستە ئەوەیە کە:
دروستی کردوون و، لەپاشان ڕزق و ڕۆزی داون و، لەپاشان دەتان مرێنێ و، لەپاشان زیندوتان دەکاتەوە. جا ئایا لە نێوان پەرستراوەکانی ئێوە کە کردوتانن بە هاوەڵی خوا، یەکێك هەیە ئەو کارانە بکات کە خوای پەروەردگار کردوونی.

(سبحانه وتعالى): واتە پاكی و بەرزی بۆ پەروەردگارە لەو پەرستراوانەی كە دەیانكەنە شەریك بۆ خوا.

* ﴿ والذين يدعون من دونه لا يَخلقون شيئاً وهم يُخلقون. أمواتٌ غير أحياءٍ. وما يشعرون أيّان يُبعثون﴾ النحل (٢٠ ــ ٢١).

واتە: ئەوانەی دەیان پەرستن و هاواریان دەكەنێ جگە لە خوا، هیچ دروست ناكەن و، خۆیان دروست كراون، مردوون و زیندوو نین، وە نازانن كەی زیندوو دەكرێنەوە.

* ﴿ ذلكم الله ربُّكم له الملكُ والذين تدعون مِن دونه ما يملكون من قِطمير﴾ فاطر (١٣).

واتە: ئەو(الله)یە پەروەردگارتانەو شایستەی پەرستن و هاوار لێ كردنە، كە (لَهُ الملك) واتە موڵك هەمووی هی ئەوە. وە ئەوانەی دەیان پەرستن و هاواریان دەكەنێ جگە لەو خوایە موڵكایەتیان بەدەست نیە، كەواتە یەكێك موڵكی نەبێت چۆن دەپەرسترێت ؟!

* ﴿ قُلِ ادعوا الذين زعمتم من دون الله: لا يملكون مثقالَ ذرّةٍ في السماوات ولا في الأرض وما لهم فيهما من شركٍ وما له منهم من ظهير ﴾ سبأ (٢٢).

واتە: ئەی محمد بفەرموو بە موشریكەكان: دەی هاوار بكەنە ئەو بت و سەنەم و فریشتەو پێغەمبەرو پیاوچاكانەی كە دەیان پەرستن و هاواریان دەكەنێ لەگەڵ خوا، بزانن ئایا وەڵامی داواكاریەكانتان دەدەنەوە ؟!

وەڵامتان نادەنەوە؛ چونكە:

١. ئەوانە خاوەنی كێشی زەڕڕەیەكیش نین، نە لەئاسمانەكان و، نە لە زەویدا،

٢. وە هەروەكو سەربەخۆ هیچ موڵكیان نیە. هەروەها بە شەریكایەتیش شەریكی خوا نین لەهیچ شتێكی ئاسمانەكان و زەویدا.

٣. وە هەروەكو شەریكیشی نین لە موڵكدا جێگرو یاریدەدەرو پاڵپشتیشی نین لە دروست كردن و بەڕێوەبردنی هیچ شتێك.

كەواتە لە ڕوانگەی یانزەهەم بە تایبەتی و ڕوانگەكانی پێشتریش بە گشتی بۆمان دەركەوت كە تەنها خوا شیاوی پەرستنە؛ چونكە تەنها ئەو سیفاتی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی تێدایە. وە بەختەوەری و ئاسودەیی و خۆشحاڵی وكامەرانی مرۆڤیش تەنها لەوەدایە كە بە تەنها ئەو پەرستراوە حەقە بپەرستێت. وە دڵ تەنگی و ژیان تاڵیشی لەوەدایە كە خوا بە تەنها نەپەرستێت و شەریكی بۆ دابنێت.

**پرسیار: عیبادەتەکان چین و، بۆ کێ دەکرێن ؟.**

**وەڵام: هەر کردارو گوفتارو بیروباوەڕێك،**
**کە خوای گەورە ﷻ فەرمانی پێکردبێت، یا پێی خۆش بێت؛**
**ئەوە عیبادەتەو، پێویستە تەنها بۆ ئەو ﷻ بکرێت،**
**وە لادانی بۆ غەیری الله شیرکە**[١]

١. **نوێژ کردن و زەکات بەخشین:**

﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ ﴾ (البينة:٥)

٢. **کڕنۆش بردن سەردانەواندن** (السجود والركوع):

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ (الحج:٧٧)

﴿ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ (فصلت:٣٧)

٣. **ڕۆژووگرتن:**

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (البقرة:١٨٣)

٤. **حەج کردن:**

﴿ وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴾ (آل عمران: ٩٧)

٥. **پاڕانەوەو داوا لێ کردن:**

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾ (غافر:٦٠)

٦. **ترسانێکی نهێنی بە ئیعتیقادەوە کە لە بیروباوەڕو ئیعتیقادی دڵەوە دروست دەبێت** (الخوف والخشية والرهبة):

﴿ إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ (آل عمران:١٧٥)

﴿ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ ﴾ (المائدة: ٣)

﴿ وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴾ (النحل:٥١)

٧. **خۆش ویستن (المحبة): کە ئەوپەڕی بە گەورە دانان و زەلیلیو مل کەچیو ژێر باری لەگەڵدایە بۆ خۆش ویستراو، واتە خۆش ویستنەکەی بە شێوەیەکی وابێت**

---

1) قال الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي-رحمه الله-: ((فكل اعتقاد أو قول أو عمل، ثبت أنه مأمورٌ به من الشارع؛ فصَرْفُه لله وحده توحيد وإيمان وإخلاص، و صرفه لغيره شرك وكفر)). (القول السديد شرح كتاب التوحيد) ص: ٤٦. و ((الضياء الشارق في رد شبهات الماذق المارق))ص: ٤٤٧ الشيخ سليمان بن سحمان.

کە زەلیل و مل کەچ و ژێر باریشی کردبێت و زۆریشی بەگەورە دابنێت. ئەمەش خۆش ویستنی بەندایەتییە (محبة عبادة):

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾ (البقرة: ١٦٥).

٨. ڕەجا لێکردن و ئومێد پێبوون (الرجاء والرغبة):

﴿أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ (الكهف: ١١٠)

٩. ئیعتیقاد پێبوون کە توانای هێنانی خۆشی و لادانی ناخۆشی هەیە:

﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ﴾ (النمل:٦٢)

١٠. داوای بەفریاکەتن کردن (الاستغاثة):

﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ (الأنفال:٩)

١١. داوای پەنا پێ کرتن (الاستعاذة): ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ (الفلق:١) ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ (الناس:١)

١٢. داوای یارمەتی کردن (الاستعانة): ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحة:٥)

١٣. پشت پێ بەستن و ئیعتیماد خستنەسەر (التوكل و الاعتماد):

﴿وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (المائدة: ٢٣)

١٤. بەجێگەیاندنی نەزرو لەخۆگرتن (الوفاء بالنذر):

﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾ (الانسان:٧)

١٥. حەیوان سەربڕین (الذبح والنحر):

﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الأنعام:١٦٢) ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ (الكوثر:٢)

وە چەندان جۆری تریش کە عیبادەتن؛ چونکە پەروەردگار فەرمانی پێکردون و پێیان ڕازییە. جاکە بۆ خودی خۆی بکرێن بەتەنها، ئەوە عیبادەتێکی پاکەو دوورە لە شیرک. بەڵام ئەگەر یەک جۆر لەو عیبادەتانە بۆ غەیری خوا بکرێت، ئەوە هەموو عیبادەتەکانی تریشی پێ هەڵدەوەشێنەوەو خاوەنەکەی بە موشریک و کافر دادەنرێت، نەک بە موسڵمانی تەنها خوا پەرست (الموحِّد). چونکە موشریکەکانیش خوایان دەپەرست، بەڵام چونکە بەتەنهایی نەبوو، خوا بەکافری دانان و وتی ئێوە هەر خواپەرست نین:

﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ. لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ. وَلَا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴾ (الكافرون).

جا بۆ ئەوەی بەڕوونی بزانیت شیرك چییە؛ ئەوە لە بەشی دووەمدا توزێك بە درێژی باس لە شیرك دەکەین دوای ئەوەی کە لەم بەشی یەکەمەدا زانیت عیبادەت کردنی خوا چییە و بە چی دەکرێت .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

پێشەکی

# زیان و مەترسی شەریك بۆ خوا دانان لەسەر ئادەمیزاد

(١) شەریك بۆ خوادانان گەورەترین زوڵم و ستەمە. وەك پەروەردگار فەرمویەتی:

﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان:١٣).

(٢) وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی گەورە ترین تاوان بریتییە لە [ أن تجعل لله نداً وهوخلقك][1] واتە هاوەڵ و هاوشێوە و شەریك بۆ خوا دابنێیت لە حاڵەتێکدا کە تەنها ئەو تۆی دروست کردووە !.

(٣) پەروەردگار لەشیرك خۆش نابێت بە هیچ شێوەیەك وە لێبوردن و عەفو کردن شمولی شیرکی گەورە ناکات :

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا﴾ (النساء:٤٨).

واتە پەروەردگار لە گوناهێك خۆش نابێ کە بریتی بێ لە شەریك بۆ دانانی.بەڵام بە گوێرەی ویستی خۆی خۆش دەبێت لە هەر گوناهێکی تر جگە لە شیرك. وە هەرکەسێ شەریك بۆ خوا دابنێ ئەوە گوناهو بوهتان و درۆیەکی گەورەی کردووە چونکە خوا شەریکی نییە لەڕاستیدا.کەواتە ئەگەر کەسێك لەسەر شیرکی گەورە مردبێت بێ ئەوەی تۆبەی لێ کردبێ ئەوە پەروەردگار بەهیچ شێوەیەك لێی خۆش نابێت.

کەواتە شەریك بۆ خوادانان گەورەترە لە کوشتنی نابەهەق و زیناو دزیو هەمو تاوانە گەورەکانی تریش !.

(٤) شەریك بۆ خوا دانان دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هەمو کردەوەو چاکەیەك.

---

(1) البخاري:٤٤٧٧

﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (الزمر:٦٥)..

واتە ئەگەر شەریکت بۆ ﷲ دانا ئەوە کردەوەکانت هەڵدەوەشێنەوە.

(٥) زەرەرمەندبوونی دونیاو قیامەت ، وەك پەروەردگارفەرمویەتی:

(...وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ).واتە ئەگەر شەریکت بۆ ﷲ دانا ئەوە لە زەرەرمەندان دەبیت.

(٦) حەرام بونی بەهەشت لێیان وە:

(٧) چونیان بۆ ناو دۆزەخ و مانەوەیان تیایدا بە بەردەوامی وە:

(٨) هاوبەشی پەیداکەران هیچ شەفاعەت کارو سەرخەرێکیان نیە.وەك خوای گەورە فەرمویەتی :

﴿اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾ (المائدة: من الآية٧٢).

واتە: هەریەکێك شەریك بۆ ﷲ دابنێت ئەوە پەروەردگار بەهەشتی لێ حەرام کردووەو، شوێنیشی دۆزەخەو، وە هیچ پشتیوانێکیان نیە ڕزگاریان کات لەم حاڵە.

وە شیرك سوکایەتیە بۆ مرۆڤ ؛ چونکە مل کەچی و بەندایەتی دەنوێنێت بۆ پەرستراوێکی وەکو خۆی بێ دەسەڵات ودروست کراو!.وەئومێدو متمانەی بە خوا کەم دەبێتەوەو ئیعتیماد دەخاتە سەر شتی خورافی و دارو بەردو پەڕۆو گۆڕ، وە لە هەموو ئەو شتانەش دەترسێت.

## شیرك دوو جۆری هەیە[1]

## جۆری یەکەم: شیرکی گەورەو ئاشکرا ( شركٌ أكبرٌ جَليّ )

خاوەنەکەی پێی لە ئیسلام دەچێتە دەرو کافردەبێ ( دوای چەسپاندنی بەڵگە - إقامة الحجة - لەسەری) ، وە هەموو ئەو زیان ومەترسی وهەڕەشانەی پێشوشی لەسەرە؛ وە ئەوەی جێگای

---

(1) هەندێك لە زانایان فەرمویانە جۆری سێیەمیشی هەیەکە بریتیە لە: شیرکی ون و نادیار (الشرك الخفيّ). بەڵام ئەو زانایانەی کە فەرمویانە تەنها دوو جۆرە، هەندێکیان وەك العلاّمة عبدالرحمن بن ناصر السعدي- لە( القول السديد شرح كتاب التوحيد: ص ٢٤)- ئەم شیرکە ون و نادیارەیان بە شیرکی بچوك حیساب کردووەوە هەندێکیشیان لە نێوان هەردوو جۆرە کەیان داناوە؛ واتا ئەوەیە کە لەگوماندایت لە شیرکی گەورە بێت، یا بچوك ؟!. وە لات ڕون و ئاشکرا نیە؛ چونکە شیرکی نادیاری وا هەیە گەورەیەو هەشیەتی بچوکە ، بڕوانە: (المدخل لدراسةالعقيدة الإسلامية ) ص ١٢٧.

مەترسىیە ئەوەیە کە خەڵکانێك و کۆمەڵانێك لەو ئومەتە دەگەڕێنەوە سەر دینی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا دانان، وەك لەحەدیسدا هاتووە:

((ولا تقوم الساعة حتى يلحق حيٌّ من أمتي بالمشركين، وحتى تعبد فئام من أمتي الأوثان)) [١]

کەواتە شیرك لە ناو ئەو ئومەتەدا هەیە؛ لەبەر ئەوە زۆر زەرورە موسڵمان وریای بێت ولە هەموو خراپەیەك زیاتر خۆپارێزی لێ بکات. وە خۆپارێزی بەوە دەست پێدەکات کە جۆرەکانی شیرك بناسێت بەوردی تاوەکو بتوانێت خۆی لێ بپارێزێت بەیارمەتی ﷲ؛ چونکە کە دوژمنت نەناسیت ناتوانیت خۆپارێزی لێ بکەیت!.

## جۆری دووەم: شیرکی بچوك و ون

## ( شرك أصغر خفيّ )

خاوەنەکەی پێی لە ئیسلام ناچێتەدەرو کافر نابێت بەڵام گوناهێکی زۆر گەورەیەو ئەو کردەوەیە هەڵدەوەشێنێتەوە کەشیرکە کەی تێدا کراوەو مەترسی چونە دۆزەخی لێ دەکرێت. وە لەبەشی دووەمی ئەم بابەتە بەدرێژی باسی لێوە دەکەین إن شاء الله.

### بەشی یەکەم

## شیرکی گەورە[الشرك الاكبر]

شیرکی گەورە بریتییە لە: **یەکسان کردنی غەیری خوا بەخوا لەوشتانەدا کە لە تایبەتمەندێتیەکانی پەروەردگارێتین، یا پەرستراوێتین، یا ناوو سیفاتەکانن.**

مەبەستیش بەو یەکسان کردنە هاوەڵ بۆ دانانیەتی لە تایبەتمەندێتیەکانیدا؛ جا جیاوازی نیە کە گەیاندبێتیە پلەی پەروەردگار تیایدا، یان نا !.

[**الشرك الأكبر**: هو تسوية غير الله بالله فيما هو من خصائص ربوبيّته، أو الوهيته، أو أسمائه وصفاته سبحانه. والمراد بالتسوية مطلق الشركة سواءً كان الله سبحانه مماثلاً لغيره فيها أو هو زائد عليه فيها ][٢]

کەواتە شیرکی گەورە بریتییە لە:

---

(1) رواه أبو داود:٤٢٤٤.صحيح على شرط مسلم.

(٢) (المدخل لدراسة العقيدة الإسلامية ).

(أن تجعل لله ندا في ربوبيته أو ألوهيته أو اسماءه وصفاته)[1] واتە: هـاوەڵ وهاوبـەش و هاوشـێوە (نِدّ) دانان بۆ خوا لە یەکێ لەو سێ لایەنەدا کە تایبەتن بە خۆی :

(١) لە لایەنی پەروەردگاریتی

(٢) لایەنی پەرستاریتی.

(٣) لایەنی ناوو سیفاتەکانی.[2]

یەکەم :

## شەریك بۆ خوا دانان لە پەروەردگاریەتیدا

## (الشرك في الربوبية)

بریتیە لە ③ :

تسوية غير الله بالله فيما هو من خصائص الربوبية.أو نسبة شيء من خصائص ربوبيته إلى غيره سـبحانه، كالخلق والرزق والملك والتدبير لهذا الكون والتشريع و الأمر والنهي والإحياء و الإماتة والتـصرف والنفـع والضر ونحو ذلك من معاني الربوبية.

---

(١) معارج القبول (٤٨٣/٢) الحافظ الحكمي.

(٢) ئەو شیرکەی پێناس کرا بریتی بوو لە شیرکی چواندن بەخوا لە تایبەت مەندێتیەکانی(شرك التشبيه والتمثيل والتسوية بالله فيما يختص به). بەڵام هەندێك لە زانایان- [وەك ابن القيّم لـه (الجواب الكافي لِمَن سأل عن الدواء الشافي)ص ١٩٩]- جگە لەم جۆرە جۆرێکی تریشیان لەشیرك باس کردووە، پێـی دەڵـێن: (شـرك التعطيل) واتە نەهێشتنی تایبەت مەندێتی یەکانی خواو وازلێهێنانیان، کە لە هەر سێ لایەنەکانی پێـشوی تایبەت بە ﷲ روو دەدات بەم شێوەیە:

① (تعطيل ألوهيّته):بتعطيل معاملة ﷲ عمّا يجب على العبد من حقيقة التوحيد، وذلك بترك عبادتـه. واتـە: نەهێشتنی مافی بەندایەتی بۆکران بۆ ﷲ ، وە وازهێنان لە عیبادەت بۆ کردنی

② تعطيل الصانع عن كماله المقدس؛ بتعطيل و نفي أسمائه وصـفاته وأفعالـه. واتـە: نەهێـشتنی سـیفەتی تەواریتی بۆ ﷲ بە نەهێشتنەوەی ناوو سیفاتە تەواوەکانی بۆی.

③ (تعطيل ربوبيته): بتعطيل المصنوع عن صانعه وخالقه؛ وذلك بدعوى قدم العالم، وعدم كونه مخلوقا لهُ .

واتە: نەهێشتنی تایبەت مەندێتی پەروەردگاریتی بۆ ﷲ .

واتە ﷲ بە دروستکاری بونەوەر دانەنرێت ، وە وادابنرێت کە ئەم بونەوەرە هەر بووەو خوا دروستکاری نەبوە.

واتە: غەیری خوا بكەیتە شەریك و یەكسانی خوا لە تایبەتمەندێتیەكانی پەروەردگاریەتیدا یاخود شتێك لە تایبەتمەندێتیەكانی پەروەردگارێتی پاڵ بدەیتە غەیری خوا وەك دروست كردن و ژیاندن و مراندن و، بەڕێوە بردنی بونەوەرو، ڕزق و ڕۆزی دان و، شەرع و یاسا بۆ دانان و، فەرمان پێ كردن و، سودو زیان بەدەست بوون و، وێنەی ئەمانە.

ئەهلی سوننەت باوەڕیان وایە: كە سودو زیان و خێرو شەڕ، و مردن و ژیان و ڕزق و ڕۆزی و، فەقیری و دەوڵەمەندی و، ساغی و نەخۆشی و، بەڕێوەبردنی بونەوەر، تەنها بەدەست خوایە. وە بەگوێرەی قەزاو قەدەرو بڕیارو ویست وفەرمانی ئەوە، بێ ئەوەی كەسێك هەبێت بەرهەڵستكاری بێت، یان بەرامبەر(مقابل ومنازع ومنافس)ێكی هەبێت، یا شەریكێكی هەبێت، یا یارمەتی دەرێكی هەبێت لە یەكێك لەو شتانەدا وەك لەم ئایەتانەدا دەردەكەوێت:

١. ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (المائدة:١٧).

واتە: موڵكی ئاسمانەكان و زەوی و نێوانیشیان تەنها بۆ(الله)یە.

٢. ﴿هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ (فاطر: من الآية٣).

واتە: ئایا هیچ دروست كارێكیتر هەیە ڕزقتان بدا لە ئاسمانەكان و زەوی؟!

٣. ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ (الأعراف:٥٤).

واتە دروست كردن و بەڕێوە بردن و فەرمان پێ كردن و بەرنامەو شەرع و یاسا بۆ دانان تەنها بۆ(الله) یەو، تایبەتن بەو زاتە، كە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە:

﴿فالحكم لله العلي الكبير﴾(غافر:١٢).﴿له الحكم وإليه تُرجعون﴾(القصص:٨٨).

*** كەواتە هەر كەسێ ئیعتیقادی وابێت كە غەیری خوا بۆی هەیە سەرچاوەی فەرمان و نەهی و شەریعەت و بەرنامە دانان بێت، یان شتێك كە خوا حەڵاڵی كردبێت، ئەو بە حەرامی دابنێت، یان بە پێچەوانەوە؛ ئەوە شەریكی بۆ خوا داناوە لە پەروەردگارێتیدا(الشرك في التشريع)**[1]:

(1) قال الشيخ المُفسِّر الإمام الشنقيطي ـــ رحمه الله ـــ : (( تنبيه: إعلم أنه يجب التفصيل بين النظام الوضعي الـذي يقتـضي تحكيمه الكفر بخالق السماوات والأرض، وبين النظام الذي لايقتضي ذلك. وإيضاح ذلك – أن النظام قسمان:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾ (الشورى: من الآية٢١).

واتە ئایا ئیعتیقادیان بەچەند شەریك و هاوەڵێکە بۆ خـوا شـەرعیان بـۆ دانـابن کـە ئیـزن و ڕوخسەتی پەروەردگاری لەسەر نیە ؟!.

﴿إن الحكم إلا لله. أمر ألا تعبدوا إلا إياه. ذلك الدين القيم ولكن أكثر الناس لايعلمون﴾(يوسف: ٤٠).

واتە: حوکمی حەق و دادپەروەر تەنها حوکمی خوایە، وەهەر تەنها ئەوە کە فەرمانمان پێدەکـات و شەریعەت و بەرنامەو حەڵاڵ و حەرامان بۆ دادەنێت. وە فەرمانی کردووە کە جگە لەو نەپەرستین و، شرع و دین وەرنەگرین تەنها لەو نەبێت، وە شەریکی نییـە لەمەشـدا(ولا يُـشْرِك في حكمـه أحداً: ٢٦الكهف)؛ چونکە کێ ئەو بونەوەرەی دروست کردووەو یاساو بەرنامـەی بەڕێوەچـوونی بـۆ داناوە، هەر تەنها ئەویش مافی ئەوەی هەیەو شیاوی ئەوەیە کە بەرنامـەی ژیانیـشی بـۆ دابنێـت. چونکە خۆی مرۆڤی دروست کردووەو دەشزانێت چ شەرعێکی بۆ باشە، کەوابوو تەنها حوکمی ئـەو تەواوەو گونجاوە لە هەموو ڕوانگەیەکەوە، وە هـەروەکو چـۆن دروسـتکراوانی خـوا زۆر بـە وردی و تەواوی هێنراونە بوون و وەگەڕخراون، کە کەس ناتوانێت عەیبێکیان لێ ببینێتەوە، یـا وەکـو خـوا شت دروست بکات، بەهەمان شێوەش شەریعەت و بەرنامەو دینەکەی بێ عەیبەو زۆر تەواوە [ذلك

---

إداري، وشرعي. أما الإداري الذي يُراد به ضبط الأمور وإتقانها على وجه غير مخالف للشرع، فهذا لامانع منه، ولا مخالف فيه من الصحابة ﷺ، فمن بعدهم. وقد عمل عمرﷺ من ذلك أشياء كثيرة ماكانت في زمن النبيّ ﷺ ؛ ١. ككتبه أسماء الجنـد في ديوان لأجل الضبط، ومعرفة من غاب ومن حضر، مع أن النبي ﷺ لـم يفعل ذلك، ولم يعلم بتخلف كعب بن مالك عن غزوة تبوك إلّا بعد أن وصل تبوك، ٢. وكاشترائه ــ أعني عمر ﷺ ــ دار صفوان بن أمية، وجعله إياها سجنا في مكة المكرمة، مـع أنهﷺ لم يتخذ سجناً هو ولا أبوبكر. فمثل هذا من الأمور الإدارية التي تُفْعَل لإتقان الأمور مما لايخالف الشرع ــ لابـأس بـه؛ كتنظيم شوون الموظفين، وتنظيم إدارة الأعمال على وجه لايخالف الشرع. فهذا النوع من الأنظمة الوضعية لابأس به، ولا يخـرج عن قواعد الشرع من مراعاة المصالح العامة.

وأما النظام الشرعي المخالف لِتشريع خالق السماوات والأرض، فتحكيمه كفر بخالق السماوات والأرض؛ كدعوى أن تفضيل الذكر على الأنثى في الميراث ليس بإنصاف، وأنهما يلزم استواؤهما في الميراث. وكدعوى أن تعدد الزوجات ظلم، وأن الطلاق ظلم للمرأة، وأن الرجم والقطع ونحوهما أعمال وحشية لايسوغ فعلها بالإنسان، ونحو ذلك. فتحكيم هذا النوع من النظام في أنفـس المجتمع وأموالهم وأعراضهم وأنسابهم وعقولهم وأديانهم ــ كفر بخالق السماوات والأرض، وتمرُّد على نظام السماء الذي وضعه مَن خلق الخلائق كلها وهو أعلم بمصالحها سبحانه وتعالى عن أن يكون مه مشرِّع آخر علوا كبيراً ﴿قل أرأيتم ما أنزل الله لكم مـن رزق فجعلتم منه حراماً وحلالاً. قل آلله أذن لكم، أم على الله تفترون﴾(يونس:٥٩). ﴿ولا تقولوا لِما تصف ألسنتكم الكذب هذا حلال وهذا حرام لِتفتروا على الله الكذب، إن الذين يفترون على الله الكذب لايفلحون﴾(النحل: ١١٦).(أضواء البيان: ٤/٦٦،٦٧).

الدّين القيم]، بەڵام بەداخەوە ﴿ولكن أكثر الناس لايعلمــون﴾ زۆربــەی خــەڵکی ئاوەهــا دینــی خوایــان بەتەواوی نەناسیوە چونکە نەزانن، وە لەبەر ئەوە حوکمی خوا ـ کەدروستکاریانە ـ ڕەت دەکەنەوەو، حوکمی مرۆڤێکی دروستکراوی وەکو خۆیان هەڵدەبژێرن!. بەڵام خوای گەورە حوکمی غەیری خـۆی بە جاهیلیەت ناوبردووە: ﴿أَفَحُكْمَ الجاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ! ومن أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْماً لِقَومٍ يُوقِنُونَ؟﴾(المائدة: ٥٠).

واتە: ئایا حوکمی جاهیلیەتیان گەرەکە؟!. بۆ کێ حوکمی لە حوکمی خـوا باشـتر؟!.وە خـوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوین کە بێ باوەڕبین بە حوکمی غەیری خۆی، ئـەگینا بـەکافر حیسـاب دەکرێین نەك بە موسڵمان، وەك لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت:

﴿ألم ترإلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أُنزل إليك وما أنزل من قبلك: يُريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت، وقد أُمروا أن يكفروا به، ويريد الشيطان أن يُضلهم ضلالاً بعيدا... فلا وربِّك لايُؤمنون حتى يُحكموك فيما شجر بينهم، ثمّ لايجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويُسلموا تسليما﴾(النساء: ٦٠،٦٥).[1]

کـەوابو هەرکەسـێك، غـەیری(اللّه) بکاتـە شـەریك و هاوبـەش و یەکسانی خـوا لـە تایبـەت مەندێتیەکانی پەروەردگاریەتیدا؛ واتە باوەڕی وابێت کە:

١. دروستکارێکی تر لەگەڵ (اللّه) هەیە،

٢. یا مالیکێکی تر خاوەنی بونەوەرە لەگەڵ (اللّه)،

٣. یا یەکێکی تریش بۆی هەیە حەڵاڵ و حەرام و شەرع و یاسای بەڕێوەبردن بـۆ مـرۆڤ دابنێـت ئەوە ئەویشی کردوە بە شەریکی اللّه لە پەروەردگاریەتیدا.

---

(1) یەکێك لە خەسڵەتە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامەتی و دەرچوون لە دین، بریتییە لە:

(( من اعتقد أن غير هدي النبيّ ﷺ أكمل من هديه، أو أنّ حكم غيره أحسن من حكمه ــ بمجرد اعتقاد، ولو لم يفعل ــ كالذين يُفضّلون حكم الطواغيت على حُكْمِه، فهو كافر. ومن ذلك:

• اعتقادُ:(١) أن الأنظمة والقوانين التي يسنُّها الناس أفضل من شريعة الإسلام، أو مماثلاً لها.(٢) أو أن نظام الإسلام لايصلح تطبيقه في هذا القرن.(٣) أو أن الإسلام كان سبباً في تخلف المسلمين.(٤) أو أنه خاص في علاقة المرء بربه دون شـؤون الحيـاة الأخرى.

• اعتقاد أنّه يجوز الحكم بغير ما أنزل الله في المعاملات الشرعيّة، أو الحدود أو غيرهما، وإن لم يعتقد أن ذلك أفضل من حكم الشريعة، أو مساوياً له؛ لأنه بذلك يكون قد استباح ما حرّم الله إجماعاً، وكل من استباح ما حرّم الله مما هو معلوم مـن الـدين بالضرورة: كالزنا والخمر والربا والحكم بغير شريعة الله فهو كافر بإجماع المسلمين.(الواجبات المتحتمات). و(تحكيم القوانين) الشيخ محمد بن إبراهيم، مُفتي الحرمين رحمه الله.

## * توانای هێنانی خۆشی و لادانـی ناخۆشی دانەپاڵ غەیری خوا شەریك بۆ خوا دانانە لە پەروەردگاریەتیدا

[ الشرك في إثبات قدرة التصرُّف لغير اللهِ ]

لە چەندان ئایەت وحەدیسدا هاتووە کە هیچ یەکێ غەیری خوا سودو زیانی بە دەست نیە بۆیە نابێت هاواریان بکرێتێ، وەك لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت:

١ -﴿قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ. ولا تنفع الشفاعة عنده إلا لمن أذن له﴾ (سبأ: من الآية٢٢-٢٣).

واتە: **ئەی محمد** ﷺ ، بۆ ئەوەی ناشیارێتی و ناشایستەیەتی پەرستاوێتی غەیری خوا نیشانی موشریکەکان بدەیت وە بەڵگەی ڕونیان بخەیتە ڕوو لەسەر ئەوەی کە پەرستراوەکانیان بە هیچ شێوەیەك هیچ لە سودو زیانیان بەدەست نیە؛ کەوابو شایستەی ئەوە نین ڕەجای دەست خستنی خێرو لادانی شەڕیان لێ بکرێت و هاواریان بکرێتێ و ئیعتیقادیان پێ ببرێ چونکە هیچیان بەدەست نیە- **بفەرموو**: ئەی موشریکەکان بانگ کەن ئەوانەی کەدەیان پەرستن غەیری خوا وەکردوتانن بەشەریکی اللهِ لە ئیعتیقاد بورن بەوەی کەشتێك لە سودو زیانیان بە دەست بێت و ئیعتیماد خستنە سەرو هاوارو داوا لێ کردنیان.

بانگیان کەن تا بۆتان دەرکەوێت کە هەریەکێك کە لە وانەی ئێوە ئیعتیقادتان پێیانە_غەیری خوا_:

(١) خاوەنی تۆسقاڵێکیش نین سەربەخۆ لە ئاسمانەکان و زەویدا.

(٢) وە لەوەش کەمتر بە شەراکەتیش لەگەڵ خوا هیچ بەشێکیان نیە.

(٣) وەلەشەراکەتیش کەمتر یاریدە دەرو جێگری خواش نین لە هیچ شتێکدا واتە پەروەردگار بەیاریدە دەریش قەبوڵیان ناکات و هیچ شێوە مافێکیان نیە لەگەڵ خوادا.

(٤) وەهەروەها لەوەش کەمتر ناتوانن تکاو ڕجاو شەفاعەتیش بکەن لای خوا بێ ئیزن و ڕوخسەتی ئەو بەتەواوی.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە غەیری خوا هیچی بەدەست نیە کە هیچیشی بەدەست نەبێت بێ عەقڵی و بێ شەرعیە مرۆڤ دڵی خۆی بەوان ببەستێت و ئیعتیمادیان بخاتە سەر. چونکە مرۆڤ

کاتێك داوا لە یەکێك دەکات لەبەر ئەوە داوای لێ دەکات چونکە باوەڕی وایە کە شتێکی بەدەست بێت لە هێنانی خێرو لادانی شەڕ بەیەکێك لەم چوار شێوەیە:

(أ) بەشێوەی سەربەخۆیی (علی وجه الاستقلال) خاوەنی سوڵتە بێت.

(ب) یاخود کە سەربەخۆییش نەبێت بە هاوبەشی و شەراکەت لەگەڵ یەکێکی تری خاوەن دەسەڵاتدا(علی وجه الاشتراك).

(ج) یاخود ئەگەر شەریکی دەسەڵات دارەکەش نەبوو، ئەوە یارمەتی دەرو جێگیرو ژێر دەست و وەزیری بێت.

(د) یاخود کە ئەو مافەشی نەبوو مافی ئەوەی هەبێت داوا لە خاوەن سوڵتە بکات بە ئازادی و سەربەستی و کراوەیی هەرداوایەکی ببێت وە بۆ هەرکەسێ داوابکات وەهەر کاتێ بێت.

بەڵام پەروەردگار لە ئایەتەکەی سورەتی سبأ ڕوونی کردۆتەوە کە غەیری خوا هەر چەند پلەو پایەشی بەرز بێت، وەك پێغەمبەرانی نێرراوی خواو، فریشتەکانی لە خوا نزیك و، پیاو چاکانیش، هیچ کام لەم چوار مافەیان نیەو، ناتوانن داوای شەفاعەتیش بکەن بە چەند مەرجێك نەبێت کە ئەمانەن :-

(١) خوا ئیزنیان بدات.

(٢) وە ئەو کەسەش کەشەفاعەتی بۆ دەکەن خوا ڕازی بێت لەشەفاعەت کردن بۆی.

وەهەمان مانا لە حەدیسیشدا هاتووە:

١- (اللهم لا مانع لِما أعطيتَ ولا مُعطي لما منعتَ )[1]

٢-(واعلم أن الأمَّة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيءٍ لم ينفعوك إلا بشيءٍ قد كتبه الله تعالى لك، وإن اجتمعوا على أن يضروك بشيءٍ، لم يضروك إلا بشيءٍ قد كتبه الله عليك..)[2]

وەلە ئایەتی تریشدا هاتوە کە خۆشەویست ترین بەندەی خوا کە (پێغەمبەرە ﷺ) هیچی بەدەست نیە لە خێرو شەڕ؛ نە بۆ خۆی وەنە بۆ غەیری خۆی وە شایستەی ئەوە نیە کە ئێمە هاواری بکەینێ بۆ نمونە:

---

(١) البخاري (٢/٢٧٥)مسلم (٥٩٣)(٣).

(٢) الإمام أحمد (١/٢٩٣)و الترمذي (٢٥١٦).

﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ ﴾ (آل عمران: من الآية١٢٨)

واتە:ئەی محمد تۆ هیچت بەدەست نییە؛ کەوابوو با خەڵکیش ئەوە بزانن بۆیە پێیان بفەرموو:﴿قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ﴾ (الأعراف:١٨٨).

واتە: بفەرموو من هیچ سودو زیانێکم بە دەست نییە بۆ نەفسی خۆشم- مەگەر شتێك کە ﷻ ویستی لەسەر بێت.چجای بۆ ئێوە.

﴿ قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴾ (الجن: ٢١).

واتە پێیان بفەرموو: هیچ زەرەرو قازانجێکم بەدەست نییە بۆ ئێوەش.

وە لە چەندان ئایەتدا پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە کە غەیری خوا ئەگەر پێغەمبەریش ﷺ بێت، هیچی بەدەست نیەو، سودو زیان بۆ خۆی دابین ناکات تاوەکو بۆ غەیری خۆی. وە هەروەها ئاگای لە غەیبیش نیە.

بۆ نمونە لەم ئایەتەدا پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ قُل لاَّ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ ﴾ (الأنعام: من الآية٥٠)

واتە: ئەی محمد خۆت بە خەڵکی بناسێنە، با سنوری تۆ بزانن و کورت ڕەوی و زێدە ڕەوی بەرامبەرت نەکەن. بفەرموو پێیان: من پێتان ناڵێم خەزێنەکانی خوا لای منن (چونکە تۆ خاوەنی هیچ موڵك نیت لەگەڵ خوادا). بفەرموو: من هیچ لە غەیب نازانم وە من ناڵێم فریشتەم. بەڵکو من بەندەیەکی پەروەردگارم و شوێن هیچ ناکەوم تەنها ئەم وەحیە نەبێت کە لەلایەن خواوە بۆم نێرراوەتە خوارەوە.

﴿ قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَاْ إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ الأعراف (١٨٨).

واتە: ئەی محمد بفەرموو بەو خەڵکە: من هێنانی هیچ سودێك و، لادانی هیچ زیانێکم بەدەست نیە بۆ نەفسی خۆشم، مەگەر شتێك خوا خۆی حەزکات.

وە بفەرموو: ئەگەر من غەیبم زانیبایە، ئەوا زۆر کار هەیە سەردەکێشێ بۆ خێرو مەسڵەحەت من خۆم دەم کرد، بەڵام چونکە ئاگام لە پاشەڕۆژو غەیب نیە، لە دەستم دەچن.وە بلێ ئەگەر غەیبم زانیبایە، زیان و ناڕەحەتیم توش نەدەبوو" چونکە خۆمم لێ دەپاراست.

وە بفەرموو: من تەنها ترسێنەرو موژدە دەرێکم بۆ گەلێك کە بڕوا دێنن.

جا ئایا پێغەمبەرێك کە خۆشەویست ترین کەسە لای خوا هیچی بەدەست نەبێت بـۆ خـۆی، وە لەدوورەوەو دوای مردنیشی گوێ بیستی قسەو هاوارو داوا لێ کردنی خەڵکی نەبێت، چونکە ئاگای لەشتی پەنهان و غەیب نیە، ئایا ئەو خۆشەویستە دەتوانێت بۆ غەیری خۆی هیچ دابین بکات ؟!

لە وەڵامدا ئایەت و حەدیسێك باس دەکەین بۆ ئەوەی لەکەلامی خواو کـەلامی پێغەمبـەر ﷺ ئەم وەڵامـەمان دەست کەوێت:

١ـ ئایەتەکە: ﴿ قُلْ إِنِّي لا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرّاً وَلا رَشَداً، قُلْ إِنِّي لَنْ يُجِيرَنِي مِنَ اللهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَداً، إِلا بَلَغاً مِنَ اللهِ وَرِسَالاتِهِ؛ وَمَنْ يَعْصِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ﴾ الجن (٢١ ــ ٢٣).

واتە: ئەی محمد ـ بفەرموو ـ: من ناتوانم هیچ زیان و زەرەرێکتان لەسەر لابدەم، وە ناشتوانم هیچ سودو قازانجێکتان بۆ دابین بکەم.

وە بفەرموو: من ئەگەر بێ فەرمانی خوا بکەم کەس ناتوانێت بمپارێزێت لە سزای خـواو، هـیچ پەنایەکم دەست ناکەوێت پەنای پێ بگرم لە خوا.

وە بفەرموو: من تەنها یەك شتم بەدەستە بۆ ئێوە، ئەویش ئەوەیە ئەو بەرنامەیەی پەروەردگارتان پێ ڕابگەیەنم کە من پێی نێرراوم.

**واتە مـن تـەنها واسـیتەی پـەروەردگارم بـۆ ڕاگـەیاندنی شـەرعەکەی بـە ئـێوە، بـەڵام واسیتەی ئێوە نیم بتان پارێزم لـە سـزای خـوا ـ ئەگـەر خـوا بیـەوێت سـزاتان بـدات ـ وەیـان زەرەرتان لەسەر لابەرم و، سودتان پێ بگەیەنم"** وە هـەر کەسـێك سەرپێـچی فـەرمانی خـواو پێغەمبەر ﷺ بکات ئەوە ئاگری دۆزەخی بۆ ئامادە کـراوەو، بـەردەوام تێیـدا دەمێنێتـەوە. ئەگـەر سەرپێچی کردنی خواو پێغەمبەر ﷺ بە حەڵاڵ بزانێت، یان سەرپێچیەکە کوفرو شیرك بێت .

٢ـ وە حەدیسەکەش ئەمەیە: أبو هریرە رضي الله عنه فەرمووی:

قام رسول الله ﷺ حين أنزل الله ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾[1] قـال:((يا معشر قريش__ أو كلمة نحوها__ اشتروا أنفسكم، لا أغني عنكم من الله شيئاً.[وفي رواية الترمذي: فإني لا أملك لكم من الله ضرّاً و لا نفعاً] يا بني عبد مناف، لاأغني عنكم من الله شيأ.[وفي رواية: فإني لا أملك لكم من الله

(1) (الشعراء:٢١٤).

ضرّاً و لا نفعاً]. يا عباس بن عبد المطلب، لا أغني عنكَ من اللَّه شيأً..[وفي رواية: فإني لا أملك لكم ضرّاً و لا نفعاً] ويا صفيّة عمّة رسول اللَّه، لا أغني عنكِ من اللَّه شيأً. ويا فاطمة بنت محمد ﷺ، سليني ما شئت من مالي،لا أغني عنكِ من اللَّه شيأً.[وفي رواية: فإني لا أملك لكم ضرّاً ولا نفعاً]))[1].

**واتە: ئەبو هريرە ڕەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە کاتێك کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە (وأنذر عشيرتك الأقربين) واتە بانگەوازی عەشیرەت وخزم و کەسە نزیکەکانی خۆت بکەو ئاگاداریان بکەرەوە، پێغەمبەر ﷺ خەڵکی قورەیشی هەموو کۆکردەوەو پێی فەرموون:**

**ئەی عەشیرەتی قورەیش نەفسی خۆتان دەرباز بکەن لەئاگر، چونکە من بۆم دابین ناکرێت هیچ زیان و سودێك لە لایەن خواوە بۆ ئێوە.**

**ئەی هۆزی– بەنی عبد مناف–: نەفسی خۆتان دەرباز بکەن لەئاگر؛ چونکە من بۆم دابین ناکرێت هیچ زیان و سودێك لە لایەن خواوە بۆ ئێوە.**

**ئەی عباسی مامی پێغەمبەر ﷺ نەفسی خۆت دەرباز بکە لەئاگر؛ چونکە من بۆم دابین ناکرێ بۆت هیچ زیان و سودێك لە لایەن خواوە. ئەی صەفییەی ئامۆژنی پێغەمبەر ﷺ : نەفسی خۆت دەرباز بکە لەئاگر؛ چونکە من بۆم دابین ناکرێ بۆت هیچ زیان و سودێك لە لایەن خواوە.**

**ئەی فاتیمەی کچی محمد ﷺ ، ئەوەی دەتەوێت لە ماڵەکەم داوام لێ بکە ، چونکە من بۆم دابین ناکرێ بۆت هیچ زیان و سودێك لەلایەن خواوە.**

**کەواتە موسڵمانی ژیر:**

**خۆشەویست ترین کەس بەلای خواوە کە پێغەمبەرە ـ ﷺ ـ هێنانی قازانج ولادانی ناڕەحەتی بەدەست نیە، بۆ خۆشەویست ترین کەسی، کە کچەکەیەتی و، بۆ نزیك ترین کەس لێی، کە مام و پورو خزمەکانیەتی لە عەشیرەتەکەی.**

**ئایا کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خزمانی خۆی نەیتوانی، ئایا دەتوانێت بۆ غەیری ئەوان هیچ دابین بکات ؟!وە کە ئەو نەتوانێت ئایا غەیری ئەو کەسی تر دەتوانێت هیچی بەدەست بێت ؟!.**



(1) البخاري: ٤٧٧١ ومسلم: ٢٠٥ والترمذي: ٣١٨٥

کەواتــە بەبەڵگــەی قورئــان و حــەدیس ڕوون بــۆوە کــە بــەڕێوەبردنی بوونــەوەر بــە هــەموو شێوەیەکیەوە، وە سودو زیان و، خێرو شەڕ؛ تەنها بەدەست خوایە. وەهەر کەسێك ئیعتیقادی ئــەم شتانەی بەغەیری خوا هەبێت، ئەوە شەریکی بۆ خوا داناوە لە توانای بەڕێوەبردنی بونەوەردا (الشرك في التصرُّف). بەڵام بەداخــەوە لــەناو موسڵمانانندا نــەفامی وا هەیــە کــە ئــەم جــۆرە ئیعتیقــادە شیرکیەیان هەیە بە غەیری خوا؛ لە پێشەواو پیاو چاکان (أولياء)، وە ئیعتیقادیان وایە کــە خــوا توانای بەڕێوەبردنی هەندێ لایەنی بونەوەری پێ بەخــشیون. وەك لــەم قــسە ناڕەوایانــەی خۆیانــدا دەردەکەوێت کە لە کتێبەکانی خۆیانەوە نەقڵ کراون:

*(انتقل النور إلى غرائزنا ولمع في أئمتنا، فنحن أنوار السماء وأنوار الأرض، فَبِنا النجاة، ومِنَّا مكنون العلم، وإلينا مصير الأمور، وبِمَهدينا تنقطعُ الحجج...)

*(الغوث متحكم في كل شيءٍ في العالم، والأقطاب الأربعة يمسكون الأركــان الأربعــة في العــالم بأمر الغوث، والأبدال السبعة يتحكم كل واحدٍ منهم في قارة مــن القــارات الــسبع بــأمر الغــوث، يتحكمون في مصائر الخلق) و (إن لله عبادا يقولون للشيء كُن فيكون)[1].

لەبەر ئەو ئیعتیقادە شــیرکیە پووچــە دەبیــنین و دەبیــستین زۆر لــە نــەفامان هــاوار دەکەنــە شــێخ عبدالقادر-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- وە ناری (غەوسیان) لێناوە، کە لەڕاستیدا تەنها (الله) (غوث)ــە؛ چونکە غەوث بە واتەی (فریاگوزار) دێت : واتە ئــەوەی کــە لــەکاتی تەنگانــەدا بــەفریایان دێــت. وە باوەڕیان وایە کە توانای ئەوەی هەیە هــەموو داواکاریــەکیان جۆریــەجۆ بکــات و وەڵامــی هەمووشــیان بداتەوە؛ یەکەمیان لە نەخۆشی چاك بکاتەوە و دووەمیان لە بەڵا بپارێزێت و... سەدەمیان منداڵی پــێ ببەخشێ و...هەزارەمیان لە سەیارە وەرنەگەڕێت (سبحان الله عما يقولون)!.

بەڵام پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی (الصحابة) هــیچ یــەکێکی تریــان بــە غــەوس واتــە فریــاگوزار نەدەزانی، وە داوای بە فریاکەوتن (استغاثة) یان تەنها لە (الله) دەکرد:

﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ﴾ (الأنفال-٩).

وە پێغەمبەر ﷺ لە خوا دەپاڕایەوە دەیفەرموو:

(يا حيُّ يا قيوم برحمتك أستغيث)[2].

---

(١) بڕوانە کتابە پوچەڵەکەی:( الكافي في الرد على الوهابي).

(١) أخرجه الحاكم (المستدرك ١/٥٠٩)والترمذي: ح(٥٢٤ )حسنٌ لغيره.

واتە ئەی پەروەردگاری زیندووی ڕاگر، بەهۆی ڕەحمەتی تۆ داوای فریاکەوتنت لێ دەکەم، کە ڕەحمەتی تۆ بە فریام بێت.

بەڵام ئەمڕۆ نەزان و نەفامەکان بە(شێخ عبدالقادری گەیلانی ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێ ـ) دەڵێن غەوس، واتە فریاگوزار، وە نازانن کە فریاگوزار(غەوس) تەنها (ﷲ) یە!.

**تێبینی: چەند گروپێکی گومڕا هەن کە شەریکیان داناوە بۆ خوا لە پەروەردگاریێتیدا کە ئەمانەن:**

(١) المجوس: مەجوسییەکان کە ڕووداوە چاکەکان دەگێڕنەوە بۆ ڕوناکی و بە هی ئەوی دەزانن. وە ڕووداوە خراپەکانیش دەگێڕنەوە بۆ تاریکی!.

(٢) القدريّة: قەدەریەکان زێدەڕەویان کردووە لە باوەڕبون بە ویست و توانا بۆ مرۆڤ، بە شێوەیەکی وا کە دەڵێن مرۆڤ خۆی دروست کەرو بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی، بەبێ ویست و تواناو قەدەری خوا !. وە لەبەر ئەم بۆچونە شیرکیە پێغەمبەر ﷺ بە مەجوسی ئەم ئوممەتەی حیساب کردون!. فەرمویەتی: (القدريّة مجوس هذه الأمّة)[1].

(٣) الصابئة: ئەستێرە پەرستان، کە باوەڕیان وایە ئەستێرە بەرزەکانی ئاسمان دەوریان هەیە لە بەڕێوە بردنی جیهان. وە لە شێوەی ئەوانیش:

(٤) عُبّاد الشمس: خۆر پەرستان.

(٥) عُبّاد النار: ئاگر پەرستان.

(٦) المتكبِّرون المُتَشبِّهون بالله: هەر کەسێك خۆی بە گەورەو زل و زۆر نواند، وە زەلیل بون و مل کەچ کردنی خەڵکی بۆ خۆی خوازی. وە حەزی کرد بە گەورەی دابنێن و لێی بترسن و ئومێدیان بەو بێت بۆ دەست خستنی خۆشی و لادانی ناخۆشی، وە لەڕێگای ئەوەوەی بزانن؛ ئەوە خۆی چواندووە بە پەروەردگارو خۆی کردووە بە شەریکی ﷲ. وە هەرکەسێ ئاوەها بێت پەروەردگار بەپێچەوانەی ئاواتی خۆی سزای دەدات و سوك و ڕیسواو بچوکی دەکات و، بە زەلیلیشەوە دەیخاتە دۆزەخەوە[2]. وەك لەم بەڵگانەدا دەردەکەوێت:

---

(١) (ظلال الجنة بتخريج أحاديث السنة) ٣٢٨و٣٢٩

(2) وقال العلاّمة أحمد بن علي المقريزى المتوفّى سنة٨٤٥ ، في كتابه((تجريد التوحيد المفيد))ص٨:

(١)﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر: من الآية ٦٠).

**واتە: ئەوانەی کە خۆیان بەزل دەنوێنن لە بەرامبەر بەندایەتی و مل کەچی بۆ خوا، ئەوانە دەچنە دۆزەخەوە بە زەلیلی.**

**(٢) پێغەمبەر ﷺ فەرموی: پەروەردگار فەرمویەتی:**

﴿ العظمة إزاري، والكبرياء ردائي؛ فمن نازعني واحداً منهما عذّبته ﴾[١]

**(٣) پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ﴿ لايدخل الجنّة أحدٌ في قلبه مثقال حبة خردلٍ من كبرياء ﴾[٢].

**وە ئەگەر مرۆڤ وێنەیەك یا پەیکەرێك دروست بکات، ئەوە لەو کەسانە دەبێت کە توندترین سزا دەدرێن ڕۆژی دوایی؛ پێغەمبەرﷺ فەرموی پەروەردگار فەرمویەتی:**

﴿ومن أظلم ممن ذهب يخلق خلقا كخلقي﴾[٣].

**واتە: کێ زاڵم ترە لەو کەسەی دەچێ شتێك دروست دەکات وەکو دروست کردنی من؟!. کەواتە هیچ کەسێ زاڵم تر نیيە لەوەی وێنەی ڕوح لەبەرێك دروست دەکات!.**

**وە پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ﴿ إن من أشدّ أهل النار يوم القيامة عذاباً المصوّرون ﴾[٤]

**واتە: بەڕاستی وێنەکێشان ڕۆژی دوایی لەو کەسانەن کە توندترین سزایان هەیە لە ئاگردا.**

**لەبەرئەوە توندترین سزا دەدرێت؛ چونکە خۆی چواندووە بە اللّٰه لە سیفەتی دروستکردندا. ئەی دەبێ سزای ئەو کەسە چەندە توند بێت کە خۆی بچوێنی بە اللّٰه لە سیفاتەکانی گەورەیی و مەزنی و تایبەت مەندێتیيەکانی پەروەردگارێتی و خوایەتی؟!.**

**ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت خەڵکی بەندایەتیان بۆ بکەن و کڕنوشیان بۆ ببەن و سەریان بۆ دابنەوێنن و سوێندیان پێ بخۆن و حەلاڵ و حەرام و شەرع و یاسا لەوان وەربگرن!.**

---

((ومن خصائص الألوهية السجود، ... إلى غير ذلك.*هذا في جانب التشبيه*.

*اما في جانب التشبُّه*؛ فمن تعاظم وتكبر ودعى الناس الى إطرائه ورجائه ومخافته، فقد تشبَّه بالله، ونازعه في ربوبيته، وهو حقيق بأن يُهينه الله غاية الهوان، ويجعله كالذر تحت أقدام خلقه)).

(١) صحيح مسلم : ٩١. وأبو داود: ٤٠٩١.

(٢) صحيح البخاري٥٩٥٢.صحيح مسلم٢١١١.

(٣) صحيح مسلم ٢١٠٩

(٤) صحيح الجامع الصغير.

دووەم

# شيرك لەناو و سيفاتەكانيدا
# ﴿الشرك في الأسماء والصفات﴾

شەريك و هاوەڵ بۆ خوا دانان لەناوە جوان و سيفاتە بەرزەكانيدا بە دووشێوە دەبێت:

## شێوەی یەكەم: التعطيل.[١]

واتە: نەهێشتن ولادان و نەفی كردنی سيفاتەكانی خوای پەروەردگار وەك جەهمی و قەرامیطەكان سيفاتە كامل وتەواوەكانی نەفی دەكەن و بەنوقسانی بێ سیفەتە تەواوەكانی دەیهێڵنەوە. وە گومانیش لەوەدا نیە كە تەواویەتی هەموو زاتێك بە تەواویەتی و كاملیەتی ناوو سيفاتەكانیەوەیە. وەبەم داڕنینی سیفەتانە لە ﷻ، پەروەردگاریان دابەزاندوە بۆ ژێر پلەی بەندە دروست كراوەكانی؛ چونكە چەندەها سیفەتی باشیان بۆ ئەوان داناوە، لەكاتێكدا كە هیچ سیفەتێكیان بۆ خوای پەروەردگار نەهێشتۆتەوە!.

## شێوەی دووەم: وێچواندن (التمثيل)

ئەمە شیان دوو جۆرە :

(أ). وێچواندنی خوا بە بەندەكانی. (تشبيه الخالق بالمخلوق)

وەك ئەو پێڕە گومڕایەی پێیان دەوترێت (المُشبهة) كە پەروەردگار دەچوێنن بە بەندەی دروست كراو لە:

١. سيفاتەكانيدا؛ دەڵێن خوا دەستی هەیە وەك دەستی ئێمە، وەتوڕە دەبێت وەكو توڕەیی ئێمە، وەبەرز دەبێتەوە و دادەبەزێ وەكو ئێمە.

٢. وەهەروەها لەمامەڵە لەگەڵ كردنیشدا پەروەردگار دەچوێنن بەبەندە؛ دەڵێن بۆ نزیك بونەوەمان لێی پێویستیمان بە واسیتە هەیە وەكو چۆن بۆ لای كاربەدەستان پێویستیمان بەواسیتەو تكاكار دەبێت.

(ب). وێچواندنی عەبد بەخوا ( تشبيه المخلوق بالخالق )

---

(١) (تعطيل الجحد لاتعطيل التأويل) فتاوى العقيدة (ابن العثيمين)ص٤٦

واتە ویچواندنی کەسێك بەخوا لە شتێك لە سیفاتەکانیدا، وەك وەصف کردنی کەسێك بەسیفەتێك یازیاتر لەسیفاتە تایبەتەکانی خوا:

(اعتقادُ منازع له في شيءٍ من مقتضيات أسمائه وصفاته)[١].

واتە: ئیعتیقاد بون بەوەی کە کەسێك هەیە لەگەل ﷻ یا لە بەرامبەر ئەودا خاوەنی شتێکە لە سیفاتەکانی ﷻ؛ وەك زانینی غەیب - بۆ نمونە:

## * (الشرك في العلم): ئیعتیقاد بوون بە غەیری خوا کە عیلمی غەیب دەزانێ شیرکە

زۆر لە نەفامان باوەڕیان وایە شێخەکانیان ئاگاداری (علم الغیب) هەن، وە بە غـاییبیش و دوای مردنیشیان هەر زانیارو ئاگادارن بەحاڵی خەلکی و موریدەکان، وە لەوەش زیاتر زێدەڕەویان کردوە. بۆ نمونە (البوصیری) شاعیر، باوەڕی وایە کە هەموو عیلمی غـەیب تـەنها بەشـێکە لـە عیلمـی پێغەمبەرﷺ؛ وەك لە وەصفیدا وتوویەتی:

فإن من جودك الدنيا وضرتها

ومن علومك علم اللوح والقلم

واتە: هەموو عیلمی ناو لەوحی مەحفوزو ئەوەی کە بە قەڵەم نوسراوە تەنها بەشێکە لە عیلمی پێغەمبەر ﷺ !. کەواتە بەم پێیە پێغەمبەر ﷺ لە خوا عـالم تـرەو لـە عیلمـی غـەیب زیـاتریش دەزانێت!!(بە گومانی درۆی ئەوان).

وە بەداخەوە زۆر لەنەفامان وەکو تووتی دەیڵێنەوە لە موناسەباتی دینی وەك لە ئاهـەنگی ڕۆژی لە دایك بوونی پێغەمبەر ﷺ، بێ بیرکردنەوە لەماناکەی !.

**کەواتە لە جۆرەکانی شیرك لەناوو سیفاتەکانیدا، ویچواندنی عەبدە بە خوا لە زانینی غەیب (الشرك في العلم)**؛ چونکە لەڕاستیدا تەنها پەروەردگار ئاگـاداری نیـازو نهێنیيە تەواو شاراوەکانە ئەو نهێنیانەی کە نازانرێن نە بەهەستیارەکان، نە بەعەقڵ وهـۆش. وەك خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ (الأنعام: من الآية٥٩).

(١) (أعلام السنة المنشورة ص٢٢) الحافظ الحكمي.

واتە تەنها لای خوایە کلیلەی نهێنیيە پەنهانەکان کە کەس نایزانێت تەنها خۆی نەبێت.

وە ئەو پێنج نهێنییە پەنهانەش لە قورئان وحەدیسدا[1] ڕوون کراونەتەوەو بە کلیلەکانی غـەیب (مفاتيح الغيب) ناوبراون.

﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان: ٣٤) واتە:

(١) بەڕاستی لای خوایە زانیاری ڕۆژی دوایی، واتـە کـەس نازانێـت ڕۆژی دوایـی کەیـە خـۆی نەبێت.

(٢) وەهەروەها کەس بە یەقینی نازانێت باران بارین کەیە خۆی نەبێت.

(٣) وەکەس نازانێت ناو ڕەحمی ئافرەت چ دروست کراوێکی تێدا دروست دەبێـت وچـۆن دەبێـت خۆی نەبێ تاوەکو خۆی فەرمان نەکات بەفریشتەکانی بە نوسینی تەمەنی وکردەوەی ورزقەکەی.

(٤) وەکەس نازانێت بەیانی چ دەکات.

(٥) وە نازانێت لە کوێ دەمرێت بە یەقینی بەڵکو تەنها خوا زانیارە بەم نهێنیانە.

هەروەها زانیاری هەموو نهێنییە پەنهانەکانی ئاسمانەکان و زەوی تەنها لای خوایە:

﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾. ((هود: من الآية ١٢٣)).

وە هیچ کەسێك لەئاسمانەکان و زەویدا غەیب نازانێت جگە لە (الله):

﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾ (النمل: من الآية ٦٥).

پێغەمبەریش ﷺ غەیب نازانێت!.

پێغەمبەریش ﷺ غەیب نازانێت: لەبەرئەوە خوا فەرمانی پێ کردوە کە بفـەرموێ مـن غـەیب زان نیم: ﴿قُل لَّا أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَائِنُ اللَّهِ وَلَا أَعْلَمُ الْغَيْبَ﴾ ((الأنعام: من الآية ٥٠)).

واتە: ئەی محمد بفەرموو: من پێتان نالێم موڵك و خەزێنەی خوا لای منە وەغەیبیش نازانم.

﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ (الأحقاف: ٩)

﴿قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (الأعراف: ١٨٨).

---

(١) بڕوانە (صحيح البخاري)(٧٣٧٩)

واتە نازانم چیم بەسەر دێت، وە ئەگەر غەیب زان بام ئەوە چی قازانجە ئەوەم دەكردو وە خۆم لەزەرەو دەپاراست و توشم نەدەبوو.

بەڵام جاری وا بووە پەروەردگار چەند غەیبێكی بە پێغەمبەرێك ڕاگەیاندووە و ئاگاداری كردۆتەوە لێی، لەبەر حیكمەتێك وە بۆ دەرخستنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەكەی وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً. إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ﴾

كەواتە ئەو پێغەمبەرانە نەبێت كە خوا چەند غەیبێكی پێ ڕاگەیاندون هیچ كەسی تر غەیری خوا غەیب زان نیە، نە پیاو چاكان (أولیاء)، وەنە جنۆكەو شەیتانەكان، وەنە فاڵ گرەوەو شوێن هەلگرەكان، ...وە هەركەسێك ئیددیعای زانینی غەیبی تەواو (الغیب المطلق) بكات بۆ خۆی یا بۆ غەیری خۆی ئەوە شەریكی بۆ خوا بڕیار داوە لەسیفاتەكانیدا لەلایەنی زانینی غەیب.

وە شێخ صدیق خان -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- فەرمویەتی :

(فمن اعتقد في نبيٍّ، أو ولي أو جن أو ملك، أو إمامٍ أو شيخ أو شهيد أو منجم أو رمال أو جفّار ، أو فاتح رمال أو برهمن، أو راهب أو جنية أو خبيث أن له مثل هذا العلم وهو يعلم الغيب، بعلمه ذلك، فهو مشرك بالله، وعقيدته من أبطل الباطلات وأكذب المكذوبات، وهو منكر لهذه الآية القرآنية وجاحد لها).[1]

وە بەداخەوە زۆر كەسی نەفام ئیعتیقادیان بە ئیمام و شێخەكانیان وایە، كە غەیب دەزانن و ئاگاداری پەنهانن ، و ە لە دوورەوە بە زیندویی و، لە ژێر گڵیش بە مردوویی هەر ئاگایان لە خەڵكی هەیە و گوێ بیستیانن!! بۆیە هاواریان دەكەنێ و داوای یارمەتیان لێ دەكەن چونكە نەك تەنها گومان ، بەڵكو ئیعتیقادی ئەوەیان پێیان هەیە كە ئاگادار و زانان بەو هاوارە دورە نهێنیەیان!!.

وەئەم ئیعتیقادە شیركیەشیان لە كتێبەكانیاندا تۆمار كردوە بۆ نمونە دەڵێن :

*(الأئمة يعلمون من أمر المبدأ والمعاد ما حجبه الله عن كافة العباد)[2]

---

(1) لە تەفسیری ئایەتی (٥٩) ی أنعام.

(٢) المجالس المؤيدية ص/٤٤١ هبة الله الشيرازي.

*(إنا نعلم المكنون والمخزون والمكتوم الذي لم يطلع عليه ملك مقرب ولا نبي مرسل غير محمد و ذريته)[١].

*( جاء عن أولياء الله من الأخبار عما كان ويكون من العباد )[٢].

*( وينبغي على المريد أن يعتقد في شيخه أنه يرى أحواله كلها كما يرى الأشياء في الزجاجة)[٣].

***و(الشعراني) لە شێخەکەیەوە دەگێڕێتەوە کە گوایە دەیزانی چ شتێك لە (لوح المحفوظ) دا دەنوسرێت سەعات بە سەعات)!![٤].**

**وە هەروەها فاڵ گرتنەوەو شوێن هەڵگری (العرّاف والكاهن...) لەو موشریکانەن کە ئیدیعای زانینی غەیب دەکەن. پەنا بەخوا.**

**تێبینی/**

**چەند جۆرە زانینێك هەن کە بەهۆی پێشەکیو نیشانەو تەجروبەوە. دەزانرێن تا ئەندازەیەك، ئەم جۆرە زانیاریە غەیب نیەو شیرك نیە.**

**وەك زانینی جنسی کۆرپە لەسکی دایکدا دوای چەند مانگێك یاخود ئیحتیمال دانانی باران بارین بە هۆی حاڵەتی هەورو کەش و هەوا.**

---

(١) القاضي /(٢٦١/٢٦٠).

(٢) (تأويل الدعائم)١/١٤٥ القاضي نعمان.

(٣) (التبحاية)ص١٨٤

(٤) الطبقات الكبرى.

سێهەم

# شەریك بۆ خوادانان لە پەرستراویتیدا

# ﴿ الشرك في الألُوهيَّة ﴾

**ئەم شیركەش بریتی‌یە:**

(أن يجعل لله نداً **يسويه** بالله في شيءٍ من خصائص الألوهية يدعوه كما يدعوا الله أو يخشاه كخشية الله أو يحبه كحب الله أو يتوكل عليه أو يذبح له أو ينذر له كما يفعل لله أو يطيعه كطاعته أو يتبعه على غير مرضاة الله أو يصرف له مع الله أو دونه نوعاً آخر من أنواع العبادة)[1].

**واتە: شیرك لە پەرستراویتیدا ئەوەیە كە عەبد هاوەڵ و شەریكێك بۆ خـوا دابنێـت و یەكسانی بكات بە خوا، لە شتێك لە تایبەتمەندیتی‌یەكانی پەرستراویتی،كە جۆرەكانی پەرستنن: وەك ئەوەی كە هاواری بكاتێ هەروەكو هاوار دەكاتە خوا !، یاخود ڕەجای لێ بكات وەك چۆن ڕەجا لە خوا دەكات !، یاخود خۆشی بوێت هەروەكو خوای خۆش دەوێت، كە بەگەورە دانان و مـل كەچـی بـۆ نوانـدنی لەگەڵە وە یاخود لێی بترسێت چۆن لە خوا دەترسێت!، یان پشتی پێ ببەستێت وئیعتیمادی بخاتە سەر وەك چۆن ئیعتیماد دەخاتە سەر خوا !.**

**وە یاخود گوێڕایەڵی دەكات و شوێنی دەكەوێت هەروەكو چۆن خوای گەورە گوێڕایەڵی دەكرێـت، یاخود هەر جۆرێكی تر لە جۆرەكانی عیبادەتی بۆ ئەنجام درابێت لەگەڵ خوا بەشەریكی یا بە تەنها بۆ ئەو، بەبێ ئەنجامدانیشی بۆ خوا.**

**ئەمە بە كورتی و بە پوختـی پێناسەی شیرك بوو لـە پەرسـتراویتیدا. وە ئێـستاش ئـەم كورتـە پێناسەیە شی دەكەینـەوەو، تۆزێ بە درێژی باسی جۆرەكانی دەكەین، بەم شێوەیەی كە دێت:**

---

(١) القول السديد: ص ٢٤ عبدالرحمن بن السعدي.

وقال العلاّمة أحمد بن علي المقريزي المتوفى سنة٨٤٥ ، في كتابه((تجريد التوحيد المفيد)) ص:٨.

((ومن خصائص الألُوهية السجود، فمن سجد لغيره فقد شبهه به، ومنها التوكل؛ فمن توكل على غيره فقد شبّهه به. ومنها التوبة؛ فمن تاب لغيره فقد شبهه به؛ ومنها الحلف؛ فمن حلف بغيره فقد شبهه به. ومنها الذبح له؛ فمن ذبح لغيره فقد شبهه به.ومنها حلق الرأس... إلى غير ذلك.*هذا في جانب التشبيه*)).

## شيرك لە پەرستندا شەش جۆرى سەرەكى هەيە كە ئەمانەن:

١- شرك الدعوة أي الدعاء

٢- شرك النية والإرادة والقصد.

٣- شرك الطاعة.

٤- شرك المحبة.

٥- شرك الخوف.

٦- شرك التوكل.

**جۆرى يەكەمى شەريك بۆ خوا دانان لە پەرستندا:**

## [ شەريك بۆ خوا دانان لە پەرستن و هاوار بۆ كردن و داوا لىٚ كردن]
## [ شرك الدُّعاء ]

پێش باس كردنى حوكمى ئەم جۆرى يەكەمە پێويستە بزانين: وشەى(الدُّعاء) بنچينەو ڕەگەزەكەى بريتييە لە ﴿ دعو ﴾. ئەم وشەيە لە قورئان و حەديسدا بەدوو مانا هاتووە :

### يەكەم: ( دعاء العبادة ) واتە: دوعاى پەرستن بۆكردن :

( وهو التذلل والخضوع والانكسار بين يدي الله، ويدخل فيه كل القُرُبات الظاهرة والباطنة لأن المتعبِّد لله طالب بلسان حاله من ربه قبولَ تلك العبادة والإثابة عليها)[1]

(فالذاكر لله والتالي لكتابه والمصلي والحاج والمتصدق والآمر بالمعروف ونحوها طالب من الله في المعنى [2])

واتە: دوعاى پەرستن بۆ كردن و زەليلى و مل كەچ بون بە جۆرەكانى بەندايەتى وەك نوێژو ڕۆژو حەج و زەكات وتێكڕاى جۆرەكانى ترى عيبادەت كە موسڵمان بەنيەت و مەبەستى ئەوە ئەو بەندايەتييە دەكات بۆ ئەوەى الله خۆشى دونيار قيامەتى پێ ببەخشێت و ناخۆشى هەردوولاى لەسەر لادات[3].

---

(١) هەمان سەرچاوەى پێشوو.

(٢) فتح المجيد:ص١٧١والقول المفيد:١/١٤٨ابن عثيمين.

(٣) يعبده رجاء نفع وخوف ضرّ.

کەواتە لەڕاستیدا هەموو جۆرەکانی عیبادەت هەر داوا لێ کردنن، بەڵام نەك بە زمانی دەم، بەڵکو بە بەزمانی حاڵ و مەبەست و نییەت. جا لەبەرئەوە کەواتە هەموو جۆرەکانی عیبادەت پێیان دەوترێ: (دُعاء). چونکە:

**(دعاء العبادة تستلزم دعاء المسالة)**

واتە هەموو جۆرەکانی پەرستن، داوا کردنیش دەخوازن و پێویستی دەکەن و بە خۆیەوە دەگرن؛ چونکە بۆ نمونە نوێژ کە (دعاء العبادة) یە، واتە عیبادەتێکە بۆ ئەوە دەیکەیت تاوەکو خوا پاداشتت بداتەوە لە سەری و خێرو خۆشیت پێ ببەخشێ و ناڕەحەتی و ناخۆشیت لەسەر لابەرێ کەواتە لەگەڵ ئەوەدا کە عیبادەتێکە لەهەمان کاتیشدا داواکاریە واتە (دعاء مسألە) یە وە هەموو جۆرەکانی تری عیبادەتیش بەهەمان شێوە.

## نمونەو حوکمی دوعا بە واتای: عیبادەت (دعاء العبادة):

وە بەڵگەش زۆرە لەسەر ئەوەی کە بە هەموو جۆرەکانی پەرستن دەوترێ دُعاء؛ واتە دعاء بە مانای عیبادەت هاتبێت.

وە لە هەموو بەڵگەکانیشدا حوکمی (دعاء العبادة) روون بۆتەوە، کە پێویستە هەموو جۆرەکانی پەرستن تەنها بۆ ﷲ بکرێن بە خالصی، وە دروست نیيە بە هیچ شێوەیەك هیچ کام لە جۆرەکانی عیبادەت ئەنجام بدرێ، بۆ غەیری خوا، هەرچەندە فریشتەی لە خوانزیکیش بێ، یاخود پێغەمبەرێکی نێردراویش بێ، یا وەلی و پیاوچاکیش بێ؛ چونکە بەندایەتی بۆکران، تەنها ماف و حەقی ﷲ یەو، شایستەی پەروەردگارە؛ جا لەبەرئەوە ئەنجامدانی هەر جۆرێکی عیبادەت وەك رکوع و سجود وسەر دانەواندنەوەو، حەیوان سەربڕین و، نەزرکردن و...بۆ غەیری ﷲ، بە شیرکی گەورە دادەنرێت. وەك لەم بەڵگانەدا دەردەکەوێت:

(١) - ﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾. (غافر: من الآية ١٤)

(أي فاعبدوا الله، وأخلصوا عبادته له وحده، لا تعبدوا معه غيره).

واتە: خوا بپەرستن بە تەنهاو خالصی بێ ئەوەی شەریکی بۆ دابنێن لە عیبادەتدا.

(٢) ﴿لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَٰهًا﴾ (الكهف: من الآية ١٤) [أي لن نعبد]

واتە: ئێمە غەیری ﷲ هیچ پەرستراوێکی تر ناپەرستین.

(٣) ﴿أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ﴾ (الصافات:١٢٥). أي أتعبدون بعلاً.

واتە: ئایا ئێوە گوێرەکەیەك دەپەرستن، وە واز دەهێنن لە تەنها پەرستنی باشترین خولقێنەر!!.

(٤) ﴿قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا﴾ (الجـن:٢٠).

واتە بفەرموو من تەنها پەروەردگارم دەپەرستم، وە هیچ کەسێك و شتێك ناکەمە هاوەڵ و شەریکی.

(٥) ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾ (المؤمنون:١١٧)

واتە: هەر کەسێك لەگەڵ ﷲ پەرستراوێکی تریش بپەرستێ کە لەڕاستیشدا هیچ بەڵگە یەکی بە دەستەوە نییە لەسەر ئەو کارەی، ئەوە حیسابی لای پەروەردگار ئەوەیە کە کافرەو سەرکەوتوش نابن کافران.

(٦)- عن ابن مسعود ﷺ أنّ رسول الله ﷺ قال: (( من مات وهو يدعو من دون ﷲ نِدّاً؛ دخل النار ))[١].

واتە هەرکەسێ مردبێ لە حاڵەتێکدا کە غەیری ﷲ ی دەپەرست؛ ئەوە دەچێتە ناو ئاگر.

کەواتە ئەم بەڵگانەی پێشوو چەند نمونەیەك بوون لەسەر ئەوەی کە لە قورئان و سوننەتدا وشەی (**دُعاء**) بەمانای (**عیبادەت**) هاتووە، وە لە خودی بەڵگەکانیشدا حوکمەکەش دەرکەوت، کە هەرکەسێ غەیری خواپەرستێ بە هەر پەرستنێك بێت، ئەوە شەریکی بۆ خوا داناوەو شوێنیشی دۆزەخە. پەنا بە خوا.

## دووەم: (دعاء المسألة): دوعای داوا لێ کردن :

(وهو طلب جلب النفع أو دفع الضر بلسان المقال )[٢].

واتە بەزمان و وتە، داوای هێنانی سودێك یا لادانی زەرەرێك بکەیت.

## حوکمی داواکردن لە خوا

مرۆڤ فەرمانی پێکراوە لەلایەن خوا و پێغەمبەر ﷺ بەوەی کە ئەم جۆرە دوعاو داواکردنە لە خوا بکات وە خوای گەورە پێی خۆشە بۆ هەموو پێویستییەك داوا لەو بکەین؛ کەواتە ئەم جۆرە دوعا و

---

(١) البخاري ٤٤٩٧.

(٢) المدخل لدراسة العقيدة:ص ١٢٨.

داواكردنە لە خوا بۆ هێنانی خێرو خۆشی و لادانی زیان و ناخۆشی دونیاو قیامەت عیبادەتە بۆی؛ وەك لەو بەڵگانەدا دەردەكەوێت:

(١) پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (الدعاء هو العبادة)[١].

واتە: داواكردن و لێ پاڕانەوە عیبادەتە.

وەهەروەها لەوەدا دەردەكەوێ كە داوا كردن عیبادەتە چونكە:

(دعاء المسالة تتضمّن دعاء العبادة)

واتە: دوعای داواكاری عیبادەت دەگرێتە خۆی؛ چونكە لێ پاڕانەوەو بەگەورەو بەخشندە دانانی خوایە و زەلیلی و بێ دەستەڵاتیو فەقیری و پێویستی نواندنە بەرامبەر ﷻ كە ئەمەش بنچینەی عیبادەتە. ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾ (الأنبياء: من الآية٩٠).

(٢) خوای پەروەردگاریش پێی خۆشە داوای لێ بكەین وەك لە حەدیسدا هاتوە: (سلوا الله من فضله، فإن الله يحب أن يُسأل)[٢] واتە: لە ﷻ داوای فەزڵ و بەخششی بكەن؛ چونكە خوا حەز دەكا داوای لێبكرێت.بەپێچەوانەی خەڵكی كە بە داوا لێكران ناخۆشحاڵ و دڵ تەنگ دەبن!

وە هەركردار و گوفتارێكیش خوا پێی خۆش بێت ئەوە عیبادەتە.

(٣) وە فەرمانی پێ كردوین كە داوای لێ بكەین بە تەنها وە هەركردار و گوفتارێكیش خوا و پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان كردبێ بە كردنی ئەوە عیبادەتە.وەك لەم فەرمانانەدا دەردەكەوێت.

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ (غافر: من الآية٦٠).

واتە پەروەردگارتان فەرمویەتی: داوام لێ بكەن وەڵامتان دەدەمەوە.

﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (الأعراف:٥٥).

واتە: هاواربكەنە پەروەردگارتان و داوا لەو بكەن بەزەلیلی و نهێنیەوە.

وە پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی بەوە كردوە:

(اُدع إلى ربك الذي إن مسّك ضرٌ فدعوته كشف عنك، والذي إن أضللت بأرض قفر فدعوته ردّ عليك، والذي إن أصابتك سَنةٌ فدعوته أنبت لك)[١].

---

(١) البخاري(الأدب المفرد) ٧٢١ والترمذي٣٣٧٢

(٢) الترمذي ٣٥٧١.

واته هاوار بكه ئه‌و په‌روه‌ردگاره‌ت كه ئه‌گه‌ر ناڕه‌حه‌تیت توش هات و داوات لیّ كرد لیّت لاده‌دا. وه‌ئه‌گه‌ر ولاّخه‌كه‌ت لیّ به‌ره‌ڵلاّو ون بوو له‌بیابانێكی بیّ ئاوو چۆڵه‌وانی وه‌هاوارت كردیّ به‌فریات دیّ و بۆت ده‌گه‌ڕێنێته‌وه. وه‌كاتێك وشكانی وگرانی ڕوی تیّ كردیت تۆش داوات لیّكرد بارانی بۆ باراندیته‌وه‌و ڕوه‌كی بۆ زیندو كردیته‌وه !.

(٤) وه‌خوای گه‌وره توڕه ده‌بیّ له‌وانه‌ی داوای لیّ ناكه‌ن و خۆیان به‌گه‌وره و بیّ پێویست ده‌زانن له‌ئاستی پاڕانه‌وه لێی وه‌ك فه‌رمویه‌تی:

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر: ٦٠).

وه وشه‌ی (عبادتي) یه‌عنی (دعائي) به به‌ڵگه‌ی سه‌ره‌تای ئایه‌ته‌كه كه فه‌رموویه‌تی (ادْعُونِي).

وه په‌روه‌ردگار فه‌رمویه‌تی :

﴿لَن يَسْتَنكِفَ الْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْداً لِّلّهِ وَلاَ الْمَلآئِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيهِ جَمِيعاً﴾ (الجاثية: ٢٣).

* وه له‌م دوو ئایه‌ته پیرۆزه ئه‌وه‌شمان بۆ ده‌ركه‌وت كه:

**وازهێنان له [ په‌رستن و داواكردن لیّی]، هه‌ر شیركه‌و كوفره؛**

چونكه له‌م حاڵه‌ته‌دا شوێن نه‌فسی خراپی كه‌وتوه‌و ئه‌وی كردووه به په‌رستراو( إله). وه‌ك په‌روه‌ردگار په‌رده‌ی لاداوه له‌سه‌ر ئه‌م په‌رستراوه پوچه‌ڵه نهێنی‌یه‌ش كه فه‌رمویه‌تی:

﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ (الفرقان: ٤٣).

﴿أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً﴾ (طه: ١٦).

﴿فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَنْ لَا يُؤْمِنُ بِهَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَتَرْدَى﴾.

﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً﴾ (الكهف: ٢٨).

﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ذَّلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الأعراف: ١٧٦).

---

(١) صحيح الجامع الصغيروزيادته (ترتيب: ٤/٣٨٧)

# حوکمی داواکردن لە غەیری خوا

**داواکردن لە غەیری خوا دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەمی داواکردن لە غەیری خوا:**

داوای شتێك لەغەیری ﷲ بکات کە تەنها لەدەسەلاتی ﷲ دابێت وەك داوای شیفای نەخۆشی لە یەکێك بکات یا داوای منداڵ بونی لێ بکات، وەیاخود داوا لە شەخصێکی غایب و نـا ئامـادە بکات، بۆ نمونە هاوار بکاتە شەخصێکیدور لەشاری خۆی یا کەسێکی مردو .

ئەم جۆرە داواکاریانە لە غەیری خوا شەریك و هاوەڵ دانانە بۆی لەوەدا کە ئیعتیقـادیوای بـەو کەسە داوالێ کراوە هەیە کە توانای وەڵامدانەوەی هەیە لەوشتانەدا کە تەنها لـەتوانای خـوادان، وە ئیعتیقادی وایە کە لەدوریشەوە وە بەمردوییش داواکاریەکەی دەبیستێت و توانـای وەڵام دانەوەشـی هەیە ـ پەنا بەخوا ـ ئەمە شیرکی گەورەیە لە چەند لایەنێکەوە:

(١) لەلایەنی ئیعتیقاددا.

(٢) وەهەروەها لەلایەنی داوا لێ کردن و پەرستن وپشت پێبەستنیشدا.

(٣) وە هەروەها لەلایەنی تەشبیە کردن و چواندنیشی بەپەروەردگار لـە سـیفاتەکانی بیـستن و وەڵامدانەوە و بەهاناهاتن !.

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئەم جۆرە داواکاریە شیرکی گەورەیە چەندەها ئایەتی قورئانە وەك :

(١) ﴿وَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ﴾ (الزمر:٨).

واتە: موشریکەکان کاتێك کەلێیان قەوماباو یا کەوتبانە تەنگانەو ناڕەحەتیەکەوە ئەو بەتـەنها هاواریان دەکردە ﷲ و دەگەڕانەوە بۆ لای ئەو چونکە دەیان زانی کە تەنها ئـەو توانـایلادانی ئـەو ناڕەحەتیەی هەیە بۆیە بەتەنها داوای بەفریاکەوتنیان لەودەکرد.

بەڵام دوای ئەوە کە ڕزگاری دەکردن و لە ناڕەحەتیـەوە دەیهێنانـە خۆشـیو ئاسـودەییەوە ئـەو پەروەردگارەیان لە بیر دەچوو کە لەتەنگانەدا هاواریان دەکردێو بەفریایان دەهات. بۆ یە ئـەم جـار هاواریان دەکردە غەیری خواو وێنەو شەریکیان بـۆ دادەنـا لـە داواو هـاوار لێکردنـدا.بـۆ ئـەوەی خەڵکیش گومڕا بکەن هەروەك چۆن خۆیان گومڕا بوون.

خوای گەورەش بەهەڕەشە فەرمووی: بەو جۆرە موشریكە سپلانە بفەرموو: ڕابوێرن بە كوفرو شیرك و گومڕاییەكەتان كەمێك، لەو ژیانە كورتەی دنیادا وەبزانن كە ئێوە ئەهلی ئاگری دۆزەخن ئەوێ شوێنتانە و ڕابواردنی دونیاتان لەیاد دەباتەوە.

كەواتە لەم ئایەتەدا پەروەردگار هاوار كردنە غەیری خۆی بە شەریك و هاوەڵ دانان دانا كە فەرمووی (وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادا) وەبەكوفری دانا كە فەرمووی (تمتع بكفرك) وەبە ئەهلی ئاگری دانان فەرمووی (إنك من أصحاب النار). واتە: تۆ لە دۆست و هاوەڵە بەردەوامەكانی ئاگری.

٢- ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾ (العنكبوت:٦٥).

٣- ﴿ وَإِذَا مَسَّ النَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا رَبَّهُمْ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا أَذَاقَهُمْ مِنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴾ (الروم:٣٣).

٤- ﴿ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِنْ قِطْمِيرٍ إِنْ تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴾ (فاطر:١٣-١٤).

٥- ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ. وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ ﴾ (الأحقاف:٦).

واتە: كێ گومڕاترە لەو كەسەی لە غەیری خوا هاوار دەكاتە ئەوانەی كە وەڵامی هاوارەكەی نادەنەوەو بێ ئاگاشن لە هاوارو داواكەی. وە كاتێكیش خەڵكی كۆكرانەوە لە ڕۆژی دوایی دەبن بە دوژمنیان. وە بێ باوەڕ دەبن بەو بەندایەتییەی بۆیان دەكردن و، بەو هاوارەی كە دەیان كردنێ.

كەواتە دوعا بە هەردوو ماناكەیەوە تەنها حەقی ئەو پەروەردگارەیە كە دروست كارمانەو ڕزق و ڕۆزیمان دەدات و ژیان و مردن و خۆشی و ناخۆشی و سودو قازانج و بەهەشت و دۆزەخی بەدەستەو، بیسەری هەموو داواكاریەكە و بەتوانایە لەسەر ئەنجامدان و وەڵام دانەوەی هەموو داخوازیەك و داواكاریەك. وە ئەوەی بیەوێت هەر ئەوە دەبێت و ئەوەش نەیەوێت ببێت كەس ناتوانێت بیهێنێت..ئەو زاتە بەتوانایە پەروەردگارەش تەنها (الله) یە كە تەنهایەو شەریكی نییە (الله أحد) و جێگای ڕازو نیازو ئومێدە (الله الصمد)، وە وێنەو هاوشێوەی نیە (و لم یكن له كفواً احد).

## جۆری دووەمی داواكردن لە غەیری خوا

ئەم جۆرەیان داواكردنی شتێكە كە لە توانای مرۆڤدا هەیە لە كەسێكی زیندوی ئامادەو مەوجود. بۆ نمونە داوا لەهاوڕێیەكی دەكات بارێكی لەگەڵ باركات یا ڕێگایەكت نیشان بدات، یا وەڵامی پرسیارت بداتەوەو یا یارمەتییەكت بدا یا...هتد ئەم جۆرەیان دروستەو گوناح نیە.

جۆری دووەمی شەریک بۆ خوا دانان لە پەرستندا:

## شیرك لە نیەت و ویست و مەبەستدا

## (شرك النية والإرادة والقصد)

حەقی خوا لەسەر بەندە ئەوەیە، کە لە هەموو کارێکیدا تەنها مەبەستی ڕەزابونی خـوا بێـت و نیەتی یەکێکی تر یا شتێکی تریش نەبێت لەگەڵ خوا.. وەهەموو ئومـەتان فـەرمانیان بـەوە پـێ کراوە کە خوا بپەرستن بەخالصی و دور لەشیرك.

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾ (البينة:٥).

بەڵام مرۆڤ ئەگەر نیەت و مەبەستەکەی لەبنەڕەتەوە پێچەوانە کردەوە لەخواوە بۆ غەیری خـوا، بەشێوەیەکی وا کەتەنها لە کردەوەکانیدا مەبەستی دەست کەوتـنی غـەیری ڕەزامەنـدی ﷲ بێـت ئەوە شیرکی گەورەیە. بۆ نمونە سەربڕینی حەیوان بۆ غەیری خوا لەبنەڕەتدا.وەك سـەر بڕینـی بـۆ قەبری شێخێك، یا لەبەردەم دەسەڵات دارێك!! جا یەکسانە ئەگەر:

(أ) مەبەستی دەست کەوتنی دونیاو زەعامەت و پلەو پایەو ڕابواردنی دونیا بێت، وەك کافرەکان کەتەنها مەبەستیان دونیا بوو لە ژیانیاندا.

وەك پەروەردگار فەرمویەتی :

﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ. أُولَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ إِلَّا النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (هود:١٥/١٦)

واتە: ئەوەی کەتەنها ژیانی دونیا و جوانیەکانی مەبەستە ئەوە ئێمە لە دونیادا داخوازیەکانی و مەبەستەکانی بۆ دابین دەکەین بەئەندازەی ویستی خۆمان کە بڕیارمان لەسەر داوە بۆیـان – نـەك بەگوێرەی مەبەست و ئاوات و هەڵپەی خۆیان- وە لەدونیا بەرهەمی ڕەنجی خۆیان وەردەگـرن بـەڵام لەدوا ڕۆژدا هیچ پاداشتێکیان نیە و تـەنها ئـاگری دۆزەخیـان بۆهەیە و کردەوەکـانی دونیاشیان پوچەڵەو لای خوا قەبوڵ نیە چونکە بەمەبەستی ئەو نەیان کردووە وەنیەتیان تەنها دونیا بوو.

(ب) یاخود مەبەستی تەنها پێش چاوی (ریاء) خەڵکی بێت بۆ ئەوە بیکات لە موسڵمانان حیسـاب بکرێـت لەبەر ئامانجێکی دونیایی کەئەمەش حاڵیمونافیقەکان بوو :

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (النساء/١٤٢). **واتە ئەگەر هەستابان بۆ نوێژ ئەوە بەتەمبەڵی هەڵدەستان و ڕیابازیان دەکرد و یادی خوایان نەدەکرد کەم نەبێت. وەدەفەرموێت :**

﴿كَالَّذِي يُنْفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ (البقرة: من الآية٢٦٤).

**واتە: وەك ئەو مونافیقانەی کە ماڵەکەیان دەبەخشن بەڕیایی نەك لەبەر خاتری خوا، وەئیمان ناهێنن بەخواو بەڕۆژی دوایی.**

**تێبینی یەکەم: ئەگەر لەبنەڕەتدا نیەت و مەبەست خوا بوو لەکردەوەدا بەڵام دوایی نیەتی ڕیایی تێکەڵاو بوو ئەوە شیرکی بچوکە نەك گەورە وەك ئەوەی دەست بکات بە نوێژێك لەبەر خاتری خوا دوایی کە هەست بەبینینی کەسانێك دەکات زیاتر بۆ خاتری ئەوان دەیڕازێنێتەوە و نوێژەکەی جوانتر دەکات ئەمەش شیرکی بچوکە لەو کردەوەیەدا و بەگوێرەی ڕیایەکەی گوناهی زیاد دەبێ و ئەجری کەم دەبێ. لەم بارەیەشەوە شێخ حافظ الحکمي فەرمویەتی:**

[ (أ) فإن كان الباعث على العمل هو إرادة الله والدار الآخرة وسلم من الرياء في فعله، وكان موافقاً للشرع فذلك العمل الصالح المقبول.

(ب) وإن كان الباعث على العمل هو إرادة غير الله عز وجل فذلك النفاق الأكبر، سواء في ذلك: ١- من يريد به جاهاً ورئاسة وطلب دنيا، ٢- ومن يريد حقن دمه وعصمة ماله وغير ذلك.فهذان ضدان ينافي أحدهما الآخر لا محالة.

(ج) وإن كان الباعث على العمل هو إرادة الله عز وجل والدار الآخرة، ولكن دخل عليه الرياء في تزيينه وتحسينه فذلك الذي سماه النبي ﷺ -الشرك الأصغر ...وهذا لا يخرج من الملة، ولكنه ينقص من العمل بقدره، وقد يغلب على العمل فيحبطه كله والعياذ بالله)] [١].

**تێبینی دووەم :**

**ئەگەر هاتوو لەبنەڕەتدا نیەتی خوا بوو لەکردەوەیەکدا وەهەروەها نیەتی ڕیاش بوو هەر لەبنەڕەتەوە ئەوەشیان گومانی تێدانیە کە کردەوەیەکی پوچەڵەو نامەقبوڵە چونکە لەحەدیسێکی قودسیدا پەروەردگار فەرمویەتی:**

((أنا أغنى الشركاء عن الشرك فمن عمل عملاً أشرك معي فيه غيري،تركته وشركه)) [١]

---

(١) معارج المقبول (١/٤٥٠-٤٥٤)

واتە: من لە هەموو شەریکەکان بێ پێویست تر و دەوڵەمەند ترم؛ جا لە بەر ئەوە هەر کەسێ کارێك (عیبادەتێك) بۆ من بکات و یەکێکی تریش بکاتە شەریکم تیایدا لەنیەت و مەبەستی ئەوە من واز دەهێنم لەو کەسە خۆیشی و شیرکە کەیشی.واتە من هیچ بەشێکی کردەوەکەی لێ قەبوڵ ناکەم و بە عەبدی خۆشمی دانانێم لەو کردەوانەدا!.

**تێبینی سێهەم جۆرەکانی ڕیایی :**

١- ڕیایی گەورە مرۆڤ پێی لەدین دەچێتە دەرەوە و کافر دەبێت کەئەمەش بریتییە لەتەنها غەیری خوا مەبەست بوون لە بنەڕەتی کردەوەکانەوە وەك ڕیایی مونافیقەکان لەکاتی نوێژو عیبادەتدا. ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (النساء:١٤٢).

٢- ڕیایی بچوك: کە لەبنەڕەتدا مەبەستی خوایە بەڵام نیەتی ڕیایی تێکەڵاو دەبێت. ئەمەیان شرکی بچوکە و بەشیرکی ون (الشرك الخفي) ناو براوە.

**جۆری سێیەمی شەریک بۆ خوا دانان لە پەرستندا:**

## شیرك لە گوێڕایەڵیدا (الشرك في الطاعة)

هەر یەکێك گوێڕایەڵی کەسێك بکات وەك گوێڕایەڵی کردنی خوا، واتە ئیعتیقادیشی وابێت کە ئەوکەسەی گوێڕایەڵی بۆ دەکرێت شایستەی ئەوەیە فەرمانـدەر بێت و یاساو شەرع دابنێت و گوێڕایەڵی بکرێت؛ ئەوە ئەوکەسەی کردووە بەشەریکی خوا لە ئیعتیقادی پەروەردگاریشدا و لە گوێڕایەڵی و عیباتەتیشدا.

وەپەروەردگار لە قورئاندا ڕوونی کردۆتەوە کە گوێڕایەڵی غەیری خوا لە بەحەرام دانانی حەڵاڵێك، یا بەحەڵاڵ دانانی حەرامێك شیرکە، وە شەریك دانانە بۆ خوا لەشەریعەت داناندا.

﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام: من الآية١٢١).

واتە ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵیتان کردبان لە حەرام کردنی حەڵاڵ و حەڵاڵ کردنی حەرامدا، ئەوە ئەوانتان کردون بەشەریکی خوا لەمافی شەریعەت داناندا.

---

(١) رواه مسلم رقم (٢٩٨٥)

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾(المائدة: ٤٤).

وەفەرمویەتی: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾ (الشورى: من الآية٢١).

واتە ئایا ئیعتیقادیان بەچەند شەریك و هاوەڵێكە بۆ خـوا شـەرعیان بـۆ دانـابن كـە ئیـزن و ڕوخسەتی پەروەردگاری لەسەر نیە ؟!

وەدەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ﴾ (التوبة: من الآية٣١)..

واتە: زاناو عابیدەكانیان كردبوون بە پەروەردگار جگە لەخوا. چونكە زانـا خراپـەكان و عابیـدە نەفامەكان حەڵاڵیان لێ حەرام دەكردن و حەرامیشیان بۆ حـەڵاڵ دەكـردن. ئـەوانیش ئیعتیقادیـان پێیان بوو، وە گوێڕایەڵیان دەكردن لەسەر ئەو حاڵەش. كەواتە پێویستە مرۆڤ ئیعتیقادی وابێت كە تەنها پەروەردگاری دروست كاری بونەوەر مافی یاساو شەرع دانانی هەیەو شایستەی ئەوەیە (ألا له الخلق والأمر)، وە غەیری ئەو كەس شایستەی شەرع دانانی نیـە هەتاوەكو پێغەمبەریش ﷺ وەك خوا پێی دەفەرموێ: (وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ)[1]. واتە حوكم بكە لەنێوان خەڵكیـدا بـەو شـەرع و یاسایەی كە خوا ناردویەتیە خوارەوە. بۆیە پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو:

﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (يونس: من الآية١٥).

واتە من شوێن هیچ شەرعێك ناكەوم تەنها ئەوە نەبێت كە بەوەحی بۆم دادەبەزێ.

كەواتە بۆمان دەركەوت كە گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەر ﷺ ، گوێڕایـەڵی كردنـی فـەرمانی خوایـە، چـونكە ئـەو ﷺ فەرمانـەكانی خوامـان پـێ ڕادەگەیـەنێت، وە هـەموو فەرمانـەكانی لەوەحیەوەیە. ﴿مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللّهَ﴾ (النساء: من الآية٨٠).

بەڵام غەیری پێغەمبەرﷺ پێویستە سـەیری فـەرمان و حوكمەكـەی بكرێـت ئەگـەر مـوافقی فەرمانی اللّٰه بوو ئەوە گوێڕایەڵیە بۆ فەرمانی خوا لەو حاڵەتەدا وەك پەروەردگار فەرمویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ ﴾ (النساء: من الآية٥٩).

واتـە: گوێڕایـەڵی خـوا بكـەن و گوێڕایـەڵی پێغەمبـەر ﷺ بكـەن وەهـەروەها پێـشەواو فـەرمان بەدەستەكانیشتان لەوەدا كەفەرمانی خوای لەسەرە بەڵام كەفەرمانەكانیان پێچەوانەی فەرمانەكانی خوا بوو ئەوە (لا طاعة في معصية اللّٰه)[2] واتە: گوێڕایەڵی كەس ناكرێت لەسەرپێچی فەرمانی خوادا ...

---

(١) (المائدة: من الآية٤٩).

(٢) (صحيح مسلم:١٨٣٩والبخاري: ٧١٤٥.

تێبینی: ئەگەر هاتوو مرۆڤ بە ویستی خۆی گوێڕایەڵی کەسێك، یان یاسایەکی کرد کە پێچەوانەی شەرع و فەرمانی خوا بوو ئەوە دوو حاڵەتی هەیە(1).

(أ) حاڵەتی ئیعتیقاد پێ بوونیشی لەگەڵ بوو ئەوە شیرکی گەورەیە.

(ب) حاڵەتی ئیعتیقاد پێ نەبونیشی، شیرکی بچوکە، ئەگەر لەبەر بەرژەوەندی‌یەك یا لە ترسان گوێڕایەڵی بکات بێ ئەوەی بەحەق و دروستی دابنێت، ئەو حاڵەتەی دووەم گوناهەو تاوانە، بەڵام شیرکی گەورە نیە.

جۆری چوارەمی شەریک بۆ خوا دانان لە پەرستندا:

## شەریك بۆ خوا دانان لە خۆشویستندا

## (شرك المحبة):

مەبەست لەو خۆشەویستی‌یەی کەبۆ غەیری خوا ببێت شیرکی گەورەیە، ئەو خۆشە ویستی‌یەیە کە ئەوپەڕی بە گەورە دانان و زەلیلیو مل کەچیو زۆر باری لەگەڵدایە بۆ خۆش ویستراو وەك ئەوەی کە یەکێکی خۆش ویست، خۆش ویستنەکەی بە شێوەیەکی وابێت کە زەلیلو مل کەچ و زۆر باریشی کردبێت و زۆریشی بەگەورە دابنێت.ئەمەش خۆش ویستنی بەندایەتی‌یە (محبة عبادة) کە بنچینەی کردەوە بەندایەتی‌یەکانی ترە و پاڵنەری عەبدە بۆ نزیك بونەوە لە خۆش ویستراو بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە لای خۆش ویستراو خۆشەویستن. وەئەم جۆرە خۆش ویستنە عیبادەتەو الله فەرمانی کردووە کە بە تەنها بۆ ئەو بێت وەئەو خۆش ویستنە بۆکەس ئەنجام نەدرێت نە لەگەڵ ئەو بەهاوبەشی، وەنەبێ ئەو بە تەنهایی وسەربەخۆیی چونکە ئەم جۆرە خۆش ویستنە تەنها شایستەی پەروەردگاری گەورەو تەواوی خاوەن نیعمەت و بەهرەیە، نەك مرۆڤی بێ دەسەڵاتی نوقسانی بێ بەهرە.

وە لە ناو خەڵکیدا ئەم جۆرە شیرکە هەیە وەك پەروەردگار دەفەرموێت :

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ﴾ (البقرة: ١٦٥).

واتە: لەناو خەڵکیدا هەیە کە وێنەو هاوشێوەو شەریکی بۆ خوا داناوە لەوەدا کەخۆشی دەوێت وەك خۆش ویستنی خوا، واتە وەك ئەو خۆش ویستنەی بۆ خوا هەیە کە بەگەورە دانان و زەلیلی

---

(١) بڕوانە مجموع الفتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية.

لەگەڵدایە. بەڵام بڕواداران خۆش ویستنەکەیان بۆ خوا زیاترە لە خۆش ویستنی موشریکان بۆ خۆشەویستەکانیان و ئیعتیقاد پێ بووەکانیان.

وە هەروەها خۆش ویستنی بڕواداران بۆ خوا پتەو ترە لە خۆش ویستنی موشریکەکان بۆی چونکە هی بڕواداران خالصەو تەنها بۆ خوایە بەڵام هی موشریکەکان تێکەڵەو تەنها بەشێکی بۆ خوایە.

ئیمام ابن القیم –رحمه الله– فەرمویەتی :

(الشرك بالله في المحبة والتعظيم بأن يحب مخلوقا كما يحب الله، فهذا من الشرك الذي قال سبحانه فيه: (ومن الناس من يتخذ من دون الله أندادا ...) وقال أصحاب هذا الشرك لآلهتهم، وقد جمعتهم الجحيم: ﴿تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الشعراء:٩٨/٩٧).

ومعلوم أنهم ماسوّوهم به سبحانه في الخلق والرزق، والإماتة والإحياء، والملك والقدرة، وإنما سووهم به في الحب والتألّه والخضوع لهم والتذلل ...)[1].

واتە: موشریکەکان لەناو ئاگری دۆزەخدا گومڕایەتی خۆیانیان بۆ دەردەکەوێت و ڕوو دەکەنە پەرستراوە ناحەقەکانیان و دەڵێن: سوێندبە ﷲ ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوین کە ئێوەمان دەکردە یەکسانی ﷲ.وە بێگومان نەیانکردبونە یەکسانی ﷲ، لەوەدا کە بڵێن ئەوانیش دروستکارمانن و، ڕزق و ڕۆزی دەرو، زیندوکەرو مرێنەرمانن! ، بەلکو لەخۆش ویستن و ملکەچ بون و زەلیلی بۆ نواندن و پەرستن بۆکردندا کردبویاننە هاوەڵ ویەکسانی ﷲ.

**تێبینی :**

١- کەواتە خۆش ویستنی غەیری خوا پێویستە لەبەر خۆشەویستی خوا (المحبة في ﷲ) بێت، نەك لەگەڵ خۆش ویستنی ئەو (المحبّة مع ﷲ)؛ چونکە یەکەمیان عیبادەتەو تەواوکەری خۆش ویستنی ﷲ یە، بەڵام دووەمیان شیرکەو کەمکەرەوەی خۆش ویستنی ﷲ یە.

٢- وە خۆش ویستنی غەیری خوا ئەگەر بەگەورە دانان و زەلیلیو مل کەچیو ژێرباری لەگەڵدا نەبوو ئەوە شیرك نییە. وەك خۆش ویستنی منداڵ و خزم و خێزان، کە خۆش ویستنێکی سروشتییە. (المحبة الطبيعيّة).

(١) الجواب الكافي ص١٩٥.

جۆری پێنجەمی شەریک بۆ خوا دانان لە پەرستندا:

## ترسانێکی نهێنی بە ئیعتیقادەوە لەغەیری خوا

## (الخوف السرّي الاعتقادي [خوف عبادة وتعظيم][1] من الاصنام والاوثان والاولياء والاضرحة)

ترسان چەند جۆرێکی هەیە:

(١) ترسانێك كە لە بیروباوەڕ و ئیعتیقادی دڵەوە دروست بووە لە یەكێك كە زۆر بە گەورەو خاوەن دەسەڵات دادەنرێت و ئیعتیقادی ئەوەی پێ دەبرێت كە توانای هێنانی خێر و لادانی شەڕی هەیە؛ جا لەبەر ئەوە مرۆڤ لێی بترسێت و زەلیل و ملكەچی بێت وخۆ پارێزی بكات لەوشتانەی كە وادەزانێ ئەو پێی ناخۆشە، وەهەروەها ترسە ئیعتیقادییەكە وای لێبكات لێی نزیك بێتەوە بەهەر شێوەیەك كەوادەزانێ ئەو پێی خۆشە، وەك خێرو نەزر بۆ كردن و حەیوان بۆ سەربڕین و سوێند پێ خواردنی، لەبەر بەگەورە و پیرۆز دانانی. وەهۆی ئەم بەگەورە دانان و لێ ترسانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئیعتیقادبون بە دەسەڵات بونی بەسەر هێنانی خێر و لادانی شەڕ بێ ئەوەی هۆی ترسانەكە بەرجەستەو هەست پێ كراوو بەرچاویش بێت.

ئەم جۆرەترسە لە عیبادەتە هەرە گەورەكانی دڵە، لەبەر ئەوە پێویستە تەنها بۆ خوا بێت. واتە تەنها لە خوا بترسین ترسانێك كە لە ئعتیقادەوە دروست بووبێت بەوەی كە خوای پەروەردگار زۆر بەتواناو تۆڵەیەو سەرپێچی كردنی دەبێتە هۆی سزای توندی بێ وێنە. وئەو ترسە لە ﷲ عیبادەتێكی زۆر گەورەیە بۆی؛ چونكە دەبێتە هۆی خۆپارێزی كردن لە تووڕەیی خواو سەرپێچی كردنی فەرمانەكانی و دۆزەخەكەی.. وە خوای گەورە فەرمانی پێكردووین تەنها لەو بترسین :

﴿وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ (النحل: من الآية ٥١).

وە مەدحی ئەو بەندانەی دەكا كەلەو دەترسن:

﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾ (الأنبياء: ٩٠).

﴿يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (النحل: ٥٠).

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەڵام كە ئەم جۆرە ترسە نهێنیەیە ئیعتیقادیە لە غەیری خوا هەبوو، ئەوە شیركی گەورەیە هەروەك موشریكەكانی كۆن و نەفامانی ئەم سەردەمەش،لە ئەولیاو هەندێ قەبر دەترسن، چونكە ئیعتیقادیان وایە كە ئەو شێخ و ئەولیایانە توانای ئازارو زیان پێ گەیاندیان هەیە وەك دەبیستین دەڵێن هەركەسێك دەرختی وشكیش ببڕێت لەسەر گۆڕی فلان پیاوچاكە ئەوە (دەیهەنگێوێت)، واتە زەرەری لێ دەدات وتوشی بەڵاو موسیبەتی دەكات.

وەهەروەها بەردو دارو پەڕۆی سەر گۆڕەكەشی بە گەورە دادەنێن و ترسێكی نهێنیان لێیان هەیە لە قوڵایی دڵەوە.

وە دەوێرن سوێندی نابەحەقیش بخۆن بەخوا، بەڵام بەسەری شێخ یا قەبری شێخ ناتوانن سوێند بخۆن، چونكە لەو زیاتر دەترسن وەك لەخوا لە ڕاستیدا !، ئەم ترسەش شیركە چونكە خوا فەرمانی كردووە بەبونی ئەو ترسە لەو بەتەنها (وە هەر شتێكیش ئەو ﷻ فەرمانی پێكردبێت و پێی خۆش بێت، ئەوە عیبادەتەو حەقە تەنها بۆ ئەو ﷻ بكرێت، وە لادانی بۆ غەیری ﷲ شیركە) وەهەروەها ئەو ترسە دەبێتە ڕێگری عەبد لە سەرپێچی كردنی فەرمانەكانی ﷲ.

وە پەروەردگار لە قورئاندا باسی كردوە كە موشریكەكان هەوڵیان دەدا پێغەمبەر ﷺ بترسێنن لەپەرستراوە درۆینەكانیان كە خۆیان لێیان دەترسان.

﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ (الزمر:٣٦)

وە لە كۆنیشدا (عاد)ی قەومی هود ئیعتیقادیان وابو كە پەرستراوەكانیان لە هود توڕەبوون و تێكیان داوەو دەستیان لێ وەشاندووە، لەسزای ئەوەی هود خەڵكی لەو پەرستراوانە (الآلهة) دور دەخستەوەو بانگی دەكردن بۆ پەرستنی ﷲ بەتەنها. وەك پەروەردگار فەرمویەتی :

﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ (هود:٥٤).

واتە: ئەی هود ئالیهەتەكانی ئێمە تۆڵەیان لێ سەندیتەوەو شێتیان كردوی!

بەڵام هود فەرمووی من خوای گەورە دەكەمە شاهید وەئێوەش بن بەشاهید كە من بەریم لەو پەرستراوانەی كەكردوتانە شەریكی ﷲ، وەلەهیچیشیان ناترسم؛ لەبەر ئەوە بێ منەت بن چیتان پێ دەكرێت بیكەن من پشتیوانم بەپەروەردگارمە.

وە شەیطان هەوڵی ئەوەدەدات ئەم جۆرە ترسە بخاتە دڵی موسڵمانانەوە و وایان لێ بکات لەغەیری خوا لە پیاوچاکان و شتی وەهمی بترسن و ترسەکەیان تەنهالە

خوا نەبێت. وەك پەروەردگار فەرمویەتی:

﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ (آل عمران:١٧٥).

واتە شەیتان دەتان ترسێنێ لە غەیری خوا لە دۆستەکانی!، دەی مەترسن لەوانە بەلکو تەنها لە خوا بترسن، ئەگەر ئێوە بڕوا دارن !. کەواتە لەو ئایەتە پیرۆزەدا دەرکەوت کە نابێت لە غەیری خوا ئەم جۆرە ترسە شاراوە ئیعتیقادیەمان هەبێت ئەگەر ئیماندار بین. وەلە ئایەتی تریشدا ئەو ترسەی لێ حەرام کردوین وەك: ﴿ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ ﴾ (المائدة: من الآية٣).

(٢) ترسی سروشتی: وەك لەشێر یا لەمار یالەزاڵمێکی دەسەڵاتدار بترسیت؛ ئەو جۆرە ترسە شیرك نیەو سروشتیە چونکە ترسێکی نهێنی ئیعتیقادی نیە بەلکو هۆی ترسانەکە بەرجەستەو هەست پێ کراوو بەرچاوە. وەگوناهیشی نیە ئەگەر نەبێتە هۆی وازهێنانی واجب یا کردنی حەرام؛ بۆ نمونە کاتێك پەروەردگار فەرمانیکرد بە موسا و هارونی برای کە بچن بۆ لای فیرعەونی زاڵم و طاغوت، هەردوکیان ترسان و وتیان : ﴿قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَىٰ﴾ (طـه:٤٥).

واتە: ئێمە دەترسین دەست درێژیمان بکاتە سەر، یاخود یاخی بێت لە حەق!. بەڵام لەگەڵ ئەو مەترسیەش فەرمانی پەروەردگاریان هەر بەجێ گەیاندوو ترسەکە نەبوە هۆی کەمتەرخەمی گوناهباری.

کەواتە پێویستە موسڵمانان بەگشتی و بانگەوازیکارانی ڕێگای ڕاستیش بەتایبەتی ترسی ستەمکاران نەبێتە ڕێگری پابەند بونیان بەدینی ﷲ وبانگەوازی بۆ ڕێبازە ڕاستەکەی. ئەگینا گوناهبار دەبن و پەروەردگار لێیان دەڕەنجێت و پشتیان تێ دەکات!، کەواتە پێویستە لەسیفەتی ترسنۆکی خۆمان بپارێزین وە دینی ﷲ ڕابگەیەنین و لەخوا نەبێت لەکەس نەترسین، بۆ ئەوەی لەو کەسانە بین کە پەروەردگار لەم ئایەتانەدا مەدحی کردون :

[الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا ﴾ (الأحزاب:٣٩.)

﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ﴾(المائدة: ٥٤ ) ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ فَعَسَىٰ أُولَٰئِكَ أَن يَكُونُوا مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾(التوبة:١٨)

جۆری شەشەمی شەریک بۆ خوا دانان لە پەرستندا:

## شیرك لە ئیعتیماد كردنە سەرو، پشت پێ بەستندا

## ( الشرك في التوكل - توكل العبادة -)

پێویستە مرۆڤ بۆ دابین كردنی خۆشی و لادانی ناخۆشی پشت ببەستێت بەو پەروەردگارە هەردەم زیندوەی كە نامرێ:

﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ﴾ (الفرقان:٥٨).

وەبەتوانایە لەسەر هەمور شتێك

﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ (الأنعام: ١٠٢)

بەڵام غەیری خوا قابلیەت و توانای ئەوەی نیە كە پشتی پێ ببەسترێت و ئیعتیمادی بخرێتە سەرو ئەمەلت پێی بێت كە خۆشیت بۆ دابین بكات و ناخۆشیت لەسەر لاببات. لەبەر ئەوە پەروەردگار فەرمانی كردوە بە پشت بەستن تەنها بەخۆی :

﴿وعلى الله فليتوكل المتوكلون﴾(إبراهيم:١٢). واتە تەنها بەخوا پشت ببەستن.

(وە هەر شتێكیش ئەو ﷻ فەرمانی كردبێت بە ئەنجامدانی و پێی خۆش بێت ئەوە عیبادەتەو حەقە تەنها بۆ ئەو ﷻ بكرێت، وە لادانی بۆ غەیری اللَّهُ شیركە).

وە ئیعتیماد خستنە سەر اللَّهُ لە هەمور كارێكدا، لە گەورەترین جۆرەكانی عیبادەت كردنی دڵە بۆ اللَّهُ. وە لەگەورەتین سیفاتە چاكەكانی بڕوادارە ڕاستەقینەكانە، كە (وعلى ربهم يتوكلون) وە بەبێ ئیعتیماد خستنە سەر اللَّهُ نە ئیمانداریتی هەیە نە ئیسلامەتی.

لەبەر ئەوە پەروەردگار پشت بەتەنها بەخوا بەستنی كردۆتە مەرجی ئیمان :

﴿وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾(المائدة:٢٣).

واتە تەنها بە خوا پشت ببەستن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.

كەواتە ئەگەر مرۆڤ پشتی بەخوا نەبەست ئەوە ئیمانی نیە. وەئەگەر پشت پێ بەستنەكەی بەتەنها بە اللَّهُ نەبور بەڵكو ئیعتیمادی خستە سەر غەیری اللَّهُ بۆ دابین كردنی سودو لادانی زیانێكی وا كە لە توانای كەسدا نیە جگە لە اللَّهُ.

وەك ئیعتیماد خستنە سەر ئەولیاو پیاو چاکی مردوو یا غایب، بۆ ئەوەی بیپارێزن و ڕزقی زۆر کەن و شەفاعەتی بۆ بکەن،ئەوە ئیمانداری ڕاست نىیەو شەریکی بۆ خوا داناوە شیرکی گەورە پەنا بەخوا.

بەڵام کە هاتوو لە شتێکی دیاری لەتوانادابوی مرۆڤ ئیعتیمادی خستەسەر کەسێکی زیندوی بەتوانا، ئەوەش هەر شیرکە، چونکە ئیعتیمادی دڵی خستۆتە سەر غەیری ﷲ، وەئومێدو ڕەجای بە غەیری ئەو ﷻ بووە. بەڵام شیرکی بچوکە نەك گەورە.

تێبینی: پشت بەخوا بەستن بە تەنها ئەوەناگەیەنێت کە هیچ وەسیلە وسەبەبێك نەگرینە دەست. بەڵکو پێویستە مرۆڤ سوربێت لەسەر بەکارهێنان و گرتنە دەستی هەر سەبەبێك کە سودی تێدا دەبینرێت، بەڵام لە پاشانیش تەنها پشت بەخوا ببەستێ نەك بە سەبەبەکانی وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

(احرص علی ماینفعك واستعن بالله)[١].

واتە: سوربە لەوەدەست هێنانی هەرشتێك کە سودت پێ دەگەیێنێت وەپشتیش تەنها بەخوا ببەستە و داوای یارمەتی تەنها لەو بکە سودت پێ بگەیەنێت بە (سەبەبەکانت و سەبەبی تریش کە خۆی دەیزانێ ).

وەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ (هود: ١٢٣).

واتە خوا بپەرستەو هەر عیبادەتێك کە نزیکت بکاتەوە لە بەهەشت بیکە، بەڵام نەکەی پشت بەعیبادەتەکەت ببەستیت و وابزانیت لە بەهای عیبادەتەکەت دەچیتە بەهەشت و عیبادەتەکەت بای ئەوەیە!.

کەواتە وازهێنان لەئەسباب و هەوڵ و تێکۆشان بە بیانوی پشت بەخوا بەستنەوە، بێ شەرعیو بێ عەقڵیە.

وە لەبەرامبەریشدا زێدەڕەوی کردن لە ئەسبابداو ئیعتیماد خستنە سەریان جگە لەخوا شیرکە. پەنا بەخوا.

****** ****** ****** ****** *******

(١) صحيح مسلم ٢٦٦٤.

# جۆری دووەم لە شیرك
# شیرکی بچوك [ الشرك الأصغر ]

زانایان بە چەند شێوەیەك پێناسیان کردوە بۆ ئـەوەی هـەموو جۆرەکـانی بگرێتـەوە، ئەمـەش شێوەکانن:

**( ١ ) ما جاء في النصوص تسميته شركاً ولم يصل إلى حد الاكبر.**

هەر مەبەستێك (إرادە)، وە کردارێك، وە گوفتارێك، کە بەشیرك ناو برابێت لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا، وە نەگەیشتبێتە پلەی شیرکی گەورە، ئەوە شیرکی بچوکە.

**(٢) هو كل ما نهى عنه الشرع من الإرادات والأقـوال والأفعـال الـتي هـي ذريعـة إلى الـشرك الاكبر، ووسيلة للوقوع فيه، ولم تبلغ رتبة العبادة. وإن لم يطلق الشرع اسم الشرك عليه[١].**

-كالغلو في المخلوق الذي لم يبلغ رتبة العبادة.

واتە: هەموو ئەو نیەت و مەبەست و گوفتار و کردارانەی کە نەگەیشتبنە پلـەی عیبـادەت و سەربکێشن بۆ شیرکی گەورە هۆی توش بوونی بن. ئەوە شیرکی بچوکە. ئەگەر لەشەرعیشدا نـاوی شیرکی لێ نەنرابێت.

وەك زێدە ڕەوی کردن لە مەدح وپیاهەڵدانی پیاوچاکان، بە ئەندازەیەك کە نەگەیەنرابێتە پلـەی پەرستن.

**(٣) وجعل سبب، لم يجعله الله سببا لا شرعا ولا قدرا؛ شرك أصغر[٢].**

واتە دانانی شتێك بە هۆ (سەبەبێك) بۆ ئامانجێك؛ کە پەروەردگار ئەو شتەی بـە هـۆ(سـبب) دانەنابێ و نەیکردبێ بە سەبەبی ئامانجەکەوە نەلەشەرعدا وە نە لەقەدەرو کەونـدا، ئـەوە شـیرکی بچوکەوەك لە دەست کردنی ئاڵقەیەکی مس یا هەر مادەیەکی تر یا پەڕۆ شاڵ بەو بیرو باوەڕەی کە هۆ (سبب)ی شیفایەو بەڵاو نەخۆشی لادەبات.

وە بێ گومـان ئەم جۆرە شتانە سەبەبی شیفانین نە لەشەرعدا وە نە لە قەدەرو واقع و تەجروبەدا.

---

(١) (القول المفيد على كتاب التوحيد) ابن عثيمين ٢٥٦/١ .

(القول السديد شرح كتاب التوحيد) ابن سعدي ص ٤٥ (فتاوى اللجنة الدائمة) (٥١٧/١).

(٢) (الفوائد المنتقاة من شرح كتاب التوحيد) ص٩ .

(٤) الشرك الأصغر[1]: هو تسوية غير الله بالله في هيئة العمل، أو أقوال اللسان.
* فالشرك في هيئة العمل: هو الرياء.
* والشرك في أقوال اللسان: هو الألفاظ التي فيها معنى التسوية بين الله وغيره كقوله(ماشاء الله وشئت) و(عبد الحارث).

واتە: شیركی بچوك بریتییە لە یەكسان كردنی غەیری خوا بە خوا، لە شێوازی كردار یا گوفتاری زمان.

نمونەی شەریك بۆ خوا دانان لە شێوازی كردار، پێش چاوییە (الرياء).

وە نمونەی شەریك دانان لە گوفتاری زمان؛ ئەو وتەو گوفتارانەن كە یەكسان كردنی تێدا بەدی دەكرێت لە نێوان پەروەردگار و دروستكراوەكانیدا. وەك ئەو وتەیە كە دەڵێن.

خوا حەزكات و تۆش حەزكەیت !.

**وە شیركی بچوك لەهەریەک لە: نیەتی دڵ و وتەی زمان وكردەوەی لاشەدا روو دەدات. بەم شێوەیەی خوارەوە :**

## (أ)شیرك لە نیەت و مەبەستە ون و نادیارو شاراوەكانی دڵ (الشرك في الارادات الخفية)

وەك:

### ١. ریا و پێش چاوی خەڵك (الرياء).

واتە: لە خوا پەرستندا مەبەستت تەنها خوا نەبێت بەڵكو مەبەستت پێش چاوی خەلكیش بێت بۆ ئەوەی لای ئەوان بەگرنگ و مەزن دابنرێیت و رێزت لێ بگیرێت.

### ٢. بەگوێ دادانی خەڵك (التسميع).

واتە: لە وتەكاندا مەبەستت ئەوە بێت خەلكی گوێ بیستت بن كە تۆ چەند باش و چاكیت. لە حەدیسدا هاتوە :

(إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر. قالوا: وما الشرك الأصغر ؟ قال: الرياء؛ يقول الله عز وجل لأصحاب ذلك يوم القيامة إذا جازى الناس: اذهبوا إلى الذين كنتم تراؤن في الدنيا؛ فانظروا هل تجدون عندهم جزاء ؟!)[1].

---

(١) المدخل لدراسة العقيدة الإسلامية . د. ابراهيم البريكان ص١٢٧ و١٣٩

واتە: پێغەمبەرﷺ فەرموی: بەڕاستی ترسناك ترینی ئەو مەترسیانەی کە لە سەر ئێوەم هەیە شیرکی بچوکە[٢].

دوای ئەوە هاوەڵان فەرمویان: شیرکی بچوك چییە؟.

فەرمووی: (**الریاء**) بریتییە لە ڕیایی و پێش چاوی کردنی خەڵکی. واتە لە نوێژو پەرستندا بۆ خوا زیاتر بیڕازێنیتەوە و بە تەواوی دەری خەیت کاتێك یەکێك سەیرت دەکات بۆ ئەوەی لە پێش چاوی ئەو کەسە بە عەبدێکی باش دەرکەویت و ڕێزی تایبەتت لێ بگیرێت !!

وە پێغەمبەرﷺ فەرمووی:خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا کاتێك پاداشتی خەڵکی دایەوە بە ڕیاکاران دەفەرموێت: ئێوە بۆ وەرگرتنەوەی پاداشتی کردەوەکانتان– کەڕیاییتان تێدا کردوە- بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کە پێش چاوی ئەوانتان دەکرد لە دونیاداو مەراییتان دەکردن. بزانن هیچ پاداشتێکتان دەست دەکەوێت لای ئەوان؟!

وە(**سومعە**) ئەوەش دەگرێتەوە کە تۆ کردەوەکەت بشاریتەوە لەخەڵکی لە کاتی کردنیدا بۆ ئەوەی تەنها خوا لێی ئاگادار بێت بەڵام دوایی لەلای خەڵکی باسی بکەیت بۆئەوە عیبادەتی تۆ ببیستن.

وە هەردوو سیفەتی ڕیایی و سومعە (واتە پێش چاو کردن و بەرگوێ خستن). سیفەتی خراپن و لە بنەڕتدا هی مونافیقەکانن.

---

(١) أحمد (٥/٤٢٨) البغوي في (شرح السنة) (٤/١٠٢٠١). (الصحيحة) (٩٥١).

(٢): واتە: لە زۆرشت دەترسم توشتان بێت . بەڵام لە هەموویان زیاتر مەترسی شیرکی بچوکە، بە تایبەتیش ئەو شیرکە بچوکەی کەون و شاراوەیە (الشرك الخفي) چونکە خۆپارێزگار کردن لێی ئیخلاصی زۆرو هەوڵدانی دەوێت بە یارمەتی خوا . بۆیە یەکێ لە پێشەوایانی سەلەف فەرمویەتی:

(ما جاهدت نفسي على شيء مجاهدتها على الإخلاص).

واتە: ماندوو بوون و هەوڵ و تێکۆشانم لەگەڵ نەفسم نە کردووە بۆ ژێربار کردنی بۆ هیچ کارێك بە ئەندازەی هەوڵ دان لەگەڵی بۆ مل کەچ بوونی بۆ پاك بونەوەی تەواو لە نیەتی ڕیاو پێش چاوی و یەك لابونەوە بە خالیسی بۆ خوا. لەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان ترساوە کە توشی ئومەتەکەی بن:

* الأئمة الضلون: پێشەوا گومڕاکارەکان .
* الدجال . * الدنيا والتنافس فيها : پێش برکێ کردن لە بەدەست خستنی دونیا .

وە هەركەسێ ئەم سیفەتانەی ببێت لە دونیا ئەوە لەوانەیە لە دونیا تا ماوەیەك بەمەبەستی خۆی بگات واتە خەڵكی بە پیاوێكی باش ببینن و ناو بانگی ببیستن. بەڵام زۆری پێ ناچێت خوای گەورە پەردە لەسەر نیەتە ناپاكەكەی هەڵدەماڵێت و لە پێش چاوی خەڵكی سوك دەبێت. وە لە دوارۆژیشدا بە یەكجاری خوای گەورە سوك و ڕیسوای دەكات لە پێش چاوی خەڵكی بە ئاشكرا لەو ڕۆژەدا كە نهێنیەو ڕازو نیازە شاراوەكانی ناو سنگ و دڵەكان دەردەخرێن و ئاشكرا دەبن. وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

[يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ] (الطارق:٩). و[أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ. وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ] (العاديات:١٠)

وە لە حەدیسدا هاتووە كە:

(من سمّع سمّع الله به.ومن يرائي يرائي الله)[1]

وە لە چەند ریوایەتێكی تردا دەفەرموێت:

((من قام مقام رياء وسمعة راءى الله به يوم القيامة وسمع به))[2].

((مامن عبد يقوم في الدنيا مقام سمعة ورياء إلا سمع الله به على رؤوس الخلائق يوم القيامة))[3]

واتە: هەركەسێ ڕیایی لە كردەوەكانیدا بكات لە دونیا وە باسیان بكات لای خەڵكی بۆ ئەوەی پلەی بەرز بێتەوە لای خەڵكی و ڕێزی لێ بگرن و بە پیاوێكی باشی دابنێن. ئەوە لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە لەپێش چاوی خەڵكی و سوك و ڕیسوای دەكات و خەڵكیش هەواڵی سوك كرانی دەبیستن بەویستی خوا. پەنا بەخوا

پەروەردگار داوا لە تۆ دەكەم بمانپارێزیت لە سومعەو ڕیایی. وە ئیخلاسمان پێ ببەخشیت. یا حي یا قیوم یاذا الجلال والكرام داوامان قبوڵ كەیت.

## ٣. مەبەست بونی دونیا بەهەندێ كردەوە (إدرادة الدنيا ببعض الأعمال).

(١) خ (٦٤٩٩) م (٢٩٨٦).

(٢) احمد والدرامي.

(٣) (الطبراني) بروانە (فتح الباري) (١٣٧/١٣).

## (ب) شیرك لە وتەکانی زماندا
## (الشرك في اقوال اللسان)

ئەم جۆرەشیان نمونەی زۆرن لە ژیانی ڕۆژانەماندا، وەك:

١- سوێند خواردن بەغەیری خوا بەمەرجێك مەبەستی ئەوە نەبێت کە ئەو کەسەی یا ئەوشتەی سوێندی پێ خوارد گەورەو مەزن و پیرۆز بێت وەکو خوا" ئەگینا دەبێت بە شیرکی گەورە.

٢- وتنی (أحكم الحاكمين) و (قاضي القضاة)(شاهنشاه) بەحاکمێك جگە لەالله.

٣- ناونان بە (عبدالنبي) و (عبدالرسول).

٤- وتنی خوا بیەوێت وتۆ بتەوێت! (ما شاء الله وشئت)! (لەپەنای خواو تۆدا)!. (لە سایەی خواو سەری تۆدا)!. (لە خواو ئێوە بەزیاد بێت)!. (خواو پێغەمبەر بتپارێزن)!. (بەناوی خواو پێغەمبەر)!. (بەیارمەتی خواو پێغەمبەر)!.

وە لە چەند حەدیسێکدا هاتوە کە :

(١) عن قُتَيْلة بنت صفيّ امراة من جهينة قالت: (إن حبرا جاء إلى النبي ﷺفقال: إنكم تشركون! تقولون: ما شاء الله وشئت، وتقولون: والكعبة، فقال رسول الله ﷺ:

قولوا ما شاء الله ثم شئت، وقولوا: ورب الكعبة)[1].

واتە: نافرەتێکی جوهەینە کە ناوی قوتەیلەی کچی صەیفی یە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: زانایەکی جولەکە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وە وتی: (ئێوە شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن" دەڵێن: خوا بیەوێت و تۆ بتەوێت (وەیا دەڵێن: خوا حەز کات و تۆش حەز کەیت)).

وە پێغەمبەرﷺ فەرموی: بڵێن: ئەگەر خوا حەزکات و *__لە پاشان__* تۆش حەز کەیت. وە بڵێن :سوێند بە پەروەردگاری کەعبە.

(٢) عن الطفيل بن سخبرة أخي عائيشة لأمها: ((أنه رأى فيما يرى النائم، كأنه مرّ برهط من اليهود فقال: من أنتم ؟ قالوا نحن اليهود.

قال: إنكم أنتم القوم لولا أنكم تزعمون أن عزيرا ابن الله فقالت اليهود: وأنتم القوم لولا أنكم تقولون: ما شاء وشاء محمدا!

(١) أحمد (٦/٣٧١-٣٧٢). (الصحيحة (١٣٦)

ثم مر برهط من النصاري، فقال من أنتم؟ قالوا: نحن النصارى.

فقال: إنكم أنتم القوم، لولا أنكم تقولون: المسيح ابن الله!

قالوا: وإنكم أنتم القوم لولا أنكم تقولون: ما شاء الله و ما شاء محمد.

فلما أصبح أخبر من أخبر، ثم أتى النبي ﷺ فأخبره فقال :هل أخبرت بها أحدا ؟

قال: نعم. فلما صلوا خطبهم، فمحمد الله،وأثنى عليه، ثم قال:

(إن طفيلا رأى رؤيا، فأخبر بها من أخبر منكم، وإنكم كنتم تقولون كلمة كان يمنعني الحياء منكم أن أنهاكم عنها؛ قال: ((ألا تقولوا: ما شاء الله وما شاء محمد))[1]

﴿فقولوا: ماشاء الله ثم شاء محمد﴾[2]

**واتە: یەكێ لە هاوەڵاتی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی طوفەیل كە داك برای عائیشەیە ڕەزای خوایان لێ بێت. لە خەونیدا وای بینی كە بەلای كۆمەڵێك لە جولەكەدا ڕۆیش، وەپێی وتن: ئێـوە كـێن ؟ وتیان: ئێمە: جولەكەین. ئەویش پێی وتن: ئێوەن قەومێكی باش ئەگەر ئەو گومان و بیرو بـاوەڕە شیركیە پوچەڵەتان نەبوایە كە دەڵێن: پێغەمبەر عوزیر كوڕی خوایە :**

**ئەوانیش وتیان: ئێوەش ئەی موسڵمانان قەومێكی باش ئەگەر نەتان وتبا: خوا حەزكات و محمد حەزكات .**

**لەپاشان بەلای كۆمەڵێك لە گاورەكاندا ڕۆیشت وە وتی: ئێـوە كـێن ؟. وتیـان: ئێمـە گـاورین (نصارى) ئەویش پێی وتن: ئێوەن گەلێكی باش ئەگەر ئەو باوەڕە شیركیە پوچەڵەتان نەبوایە كـە دەڵێن عیسى كوڕی خوایە!**

**ئەوانیش وتیان: ئێوەش ئەی موسڵمانان قەومی باشن ئەگەر نەتان وتبایە: خوا حەزكات و محمد حەزكات !**

**وەكە (طفیل) بەیانی كردەوە خەونەكەی لای هەندێ كەس باس كرد. ودوایی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وە خەونەكەی بۆ گێڕایەوە.**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:**

(١) أحمد (٥/٧٢)

(٢) أحمد (٥/٣٩٣) وابن ماجه (٢١١٨). و(الصحيحة)١٣٨،١٣٧.

ئایا بەکەست ڕاگەیاندووە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش ﷺ کاتێك نوێژیان کرد وتاری بۆ خەڵکەکەدا بەم شێوەیە کە سەرەتا حەمدو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردوو دوایی فەرمووی: بەڕاستی (طوفەیل) خەونێکی بینیوە. وە بەهەندێکتانی ڕاگەیاندوە. وە ئێوە لە ڕابردوودا قسەیەکتان دەکرد و وشەیەکتان بەکار دەهێنا کە من ڕقم لێی بوو بەڵام لەشەرمی ئێوە نەمدەتوانی لێتان قەدەغە بکەم و بە ڕووتاندا بدەم کە وشەیەکی خراپ دەڵێن.

بەڵام ئەوە ئێستا پێتان دەڵێم:

مەڵێن: خوا حەزکات و محمد حەزکات. بەڵکو بڵێن: خوا حەزکات لە پاشان محمد))

واتە ناوی من لەگەڵ خوا بەیەکەوە کۆمەکەنەوەو یەکسان مەکەن، چونکە ئەوە شیرکە. بەڵکو ئەگەر ناوی منتان هێنا ئەوە لە دوای ناوی خوا بڵێن لەپاشان محمد.

(٣) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: جاء رجل إلى النبي ﷺ فراجعه في بعض الكلام، فقال: ما شـاء الله وشئت!.

فقال رسول الله ﷺ:(أجعلتني مع الله عدلا ؟! (وفي لفظ: ندًا ؟!).لا؛ بل ما شاء الله وحده)[1].

واتە: (عبداللە)ی کوڕی عەباس رضي الله عنه فەرمووی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وە هەندێ دوا لەگەڵیداو وتی: خوا حەزکات و تۆ حەزکەیت. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

ئەوە تۆ منت کردە هاوەڵ و یەکسان و شەریکی ؟!

نەخێر جارێکی تر وا نەڵێیت بەڵکو بڵێ: گەر خوا حەزکات بەتەنها).

چونکە هەر شتێك خوا بیەوێت هەر ئەوە دەبێت" ئێمە بمانەوێت یان نا!!.

کەواتە ئێمە شیاوی ئەوە نین ناومان بخرێتە پاڵ ناوی خوا لەم شتانەدا یا خود بکرێینە شەریکی ئەو.

---

(١) وابن ماجه (٢١١٧). (الصحيحة):١٣٩.

## (ج) شیرك لە شێوازی کردەوەکانیدا
## (الشرك في هيئة الأعمال)

وەك:

(١) (التشاؤم والتطير): ڕەش بینین بە هەندێ شت یا بە هەندێ کات وشوێن

(٢) هاتن بۆ لای فاڵ گرەوەو باوەڕ پێ کردنی، وە چوون بۆ لای شوێن هەڵگر بۆ دۆزینەوەی دز. وە باوەڕ کردن بە ساحیرو جادوکەرو فنجان و ئاوێنە گرەوەو بەخت گرەوە.

(٣) نوێژ کردن بۆ خوا **لای قەبری پیاو چاك** و سوجدە بۆ خوا بردن تیایدا و خوێندنەوەی قورئان بەو نیەت و بیروباوەڕەوە کە لەلای قەبر عیبادەت باش ترە - بەگومانی خۆیان [1]

(٤) **تەبەڕوك کردن** بە شوێنەواری پیاوچاکان و لاشەیان لە ژیانیاندا یا لە دوا مردنیان: واتە ئیعتیقاد بون بە بونی بەرەکەت و پیرۆزی وخێری زۆرو دەستکەوتنی ئەو خێرە لە شوێنەوارو لاشەی پیاو چاکاندا. ئەگەرچی باوەڕیشی وا بێت بەرەکەتە لە خواوەیە، هەر شیرکی بچوکە. بەڵام گەر باوەڕی وابێت بەرەکەتەکە لە پیاو چاکەکەوەیە ئەوە شیرکی گەورەیە.

(٥) **التوسل البدعي**: واتە هەوڵی خۆ نزیك کردنەوە لە ڕەزا بون و خۆش ویستنی خوا بە ئەنجامدانی عیبادەت بۆ خوا لای گۆڕی پیاوچاکان بەتایبەت. یاخود بڵێی: خوایە بۆ خاتری ئەوان لێمان خۆش ببەو داوامان قەبوڵ بکە!.

(٦) (**لبس الحلقة والخيط لاتقاء العين**): هەڵواسینی پەڕۆ مێوە شینکەو ناڵی گوێ درێژو شتی تری خوڕافی لەم بابەتە بۆ لادان و نەهێشتنی چاوەزارو حەسادەت و زەرەروزیان.

**تێبینی**:

شیرکی بچوك جۆری وای هەیە لەوانەیە بگاتە شیرکی گەورەش. ئەوەش کاتێك کە بیروباوەڕی دڵی لەگەڵدا بوو وەك شیرکی گەورە. بۆ نمونە :

(١) سوێند خواردن بە غەیری خوا شیرکی بچوکە. بەڵام ئەگەر سوێند پێ خوراو بەگەورە دانرا لە دڵەوە وەکو خوا، ئەوە دەبێت بەشیرکی گەورە.

---

(١) ص ١٧٤ البريكان.

(٢) پێش چاوی (الرياء) شیركی بچوكە. بەڵام ئەگەر لە بونی ئیمان بە خوا ڕیایی هەبێت واتە ئیمان هێنانەكەی بە خوا تەنها لەبەر خوا نەبێت بەڵكو لەبەر ئەوەش بێت كە خەڵكی موسڵمان بە موسڵمانی دا بنێن ئەوە شیركی مونافیقەكانە و گەورەیە یاخود ڕیابازی تێكەڵی هەموو كردەوەكانی بێت، وە هیچ كارێك بە تایبەتی بۆ خوا نەكات یا مەبەستی دونیا بێت بەگشتی لە كردەوەكانیدا وە مەبەستی خوا نەبێت.

بەڵام ئەگەر مەبەستی لە كردەوەی چاكدا وەك حەج بۆ نمونە پەیدا كردنی ماڵ بێت یا ئافرەت یان جیهاد بكات بۆ غەنیمەت یا دەرسی شەرعی دەخوێنێت تاوەكو وەزیفەو پیشەیەكی دەست كەوێت ئەوە شیركی بچوكە.

(٣) لە دەست كردنی جۆرە ئاڵقەی تایبەت بۆ لادانی چاوەزارو حەسادەت !

ئەگەر تەنها گومانی وابێت ئەو ئاڵقەیە سەبەبی خۆ پارێزییە لە چاوەزار ئەوە شیركی بچوكە وە ئەگەر باوەڕیشی وابوو خودی ئاڵقەكە پارێزەرە لە چاوەزار یا لە نەخۆشی ئەوە شیركی گەورەیە.

(٤) الاستسقاء بالأنواء: واتە ئیعتیقاد بوون بە ئەستێرە وەك سەبەبێك بۆ باران بارین شیركی بچوكە. بەڵام كە ئیعتیقادی وابێت باران بارین لە ئەستێرەوەیە واتە ئەستێرە باران دەبارێنن ئەوە شیركی گەورەیە.

## حوكمی شیركی بچوك

هەركەسێ لە هەردوو جۆرەكەی شیرك -گەورەو بچوك- ڕزگاری بوو ئەوە بەهەشتی مسۆگەرە بەفەزڵی خوا.

وە هەركەسێ شیركی گەورەی بوبێت و لەسەری مردبێ پێش تەوبە كردن" ئەوە دۆزەخی بەردەوامی مسۆگەرە بە عەدل و دادپەروەری خوا. وە هەر كەسێ لە شیركی گەورە ڕزگاری بێت و توشی هەندێ لە شیركی بچوك بوبێت بەڵام كردەوەی چاكەی زیاتر بێت لە تاوانەكەی ئەوە دەچێتە بەهەشت بە یارمەتی خوا.

وە هەركەسێ لە شیركی گەورە ڕزگاری بوو، وە توشی شیركی بچوك بوو بەزۆری تاوەكو لای تاوانەكەی زیاتر كات لە چاكەكانی ئەوە دەچێتە ئاگرەوە. پەنا بەخوا.

| جیاوازی لە نێوان شیرکی گەورە | و شیرکی بچوك |
|---|---|
| ١- تەوحید لە بنەڕەتەوە ناهێڵێت و مرۆڤ پێی لە دین دەچێتە دەرەوە | * لە گوناهە گەورەکانە وتەواوێتی تەوحید ناهێڵێت. بەڵام مرۆڤ پێی لە دین دەرناچێت |
| ٢- هەموو کردەوەکانی مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە. | * تەنها ئەوکردەوەیە هەڵدەوەشێنێتەوە کە زاڵ بووە تیایدا، یا لەبنەڕەتەوە هەر لە سەرەتاکەیەوە تێی کەوتووە. |
| ٣- خاوەنەکەی هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە و بەهەشت لەسەری حەرامە. | * سزای بەردەوامی دۆزەخ بۆ خاوەنەکەی دابین ناکات. بەڵکو هۆی چونە ناو دۆزەخەو ئەگەر خوا بیەوێت دەیخاتە ناوی و ئەگەریش بیەوێت لێی دەبورێت. |
| ٤- خوا دوای مردنی خاوەنی ئەو شیرکە، پێش تۆبە؛ لەو شیرکە گەورەیە خۆش نابێت. | * لێخۆش بوون لەو جۆرە لە ژێر ویست و مەشیئەتی خودایەو مەجالی لێ بوردنی هەیە |
| ٥- خاوەنەکەی خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێت بەهۆی شیرکی گەورە. واتە: دروستە خوێنی بڕێژرێت وماڵی بە غەنیمەت بگیرێت؛ چونکە لە موسڵمانان ناژمێردرێت، بۆیە پارێزراو نابێت. | * خوێن و ماڵی خاوەنەکەی پارێزراو دەبێت چونکە خاوەنەکەی بە موسڵمان دەژمێردرێت. بەڵام موسڵمانێکی تاوانبارو کەم باوەڕە. |

**کەواتە لە هەردوو بابەتی شیرکی گەورەو بچوك بۆمان دەرکەوت کە شەریك بۆ خوا دانان**

**تەنها بریتی نیە لە نوێژ کردن وسوجدەبردن بۆ غەیری خوا**

**بەڵکو هاوارکردنە غەیری خواو ئیعتیقاد پێ بوونیشی شیرکی گەورەیە !**

بەڵام ئەوەی جێگای داخە، هەندێك كەس، بانگەشەی خەڵكی دەكەن بۆ ئەو شیرك و كوفرو گۆڕ پەرستییە، وە چەندان عوزرو بەڵگەی ناڕەوای بۆ دەهێننەوە، بۆ قەناعەت پێكردنی خەڵكی سادەو نەخوێندەوار. جا ئەم دەستەیە لە دوو كۆمەڵ تێپەڕ ناكەن:

١. یان جاهیل و نەفامن و، بێ ئاگان لە قورئان و حەدیس، وە تائێستا بناغەی ئیسلامیان نەناسیوە، كە بریتییە لە تەنها خوا پەرستن؛ چونكە خەریك نەبوون بە دیراسەی قورئان و حەدیس كە سەرچاوەی ئیسلامەتین !!.

٢. وە یان زاڵم وستەمكارن، كە دەشزانن كارەكەیان بێ شەرعییەو شیركە، بەڵام بەرژەوەندی دونیایی ماڵ و زەعامەتیان لەوەدا دەبینن، كە خەڵكی چەواشە بكەن بۆ ئەوەی بە ناتێگەیشتوویی بمێننەوە.

وە ئەگەر ڕاستی بۆ خەڵكەكە ڕوون بێتەوە، بەرژەوەندیە تایبەتیەكانیان لە دەست دەچێت، بۆیە هەمووكات دژی ڕاستین و دژایەتی ئەو موسڵمانانەش دەكەن، كە قورئان و حەدیسی ڕاست بۆ خەڵكی ڕوون دەكەنەوە!. وە جۆرەها بوهتانیان بۆ دروست دەكەن و بە بەكرێ گیراوو سەر لێ شێواو نیشانی خەڵكیان دەدەن، وە لەناو خەڵكی دا دەڵێن: ئەم گەنجانەی كە باسی قورئان و حەدیس دەكەن و، تەنها هاوار دەكەنە خوا، ئەوانە دینێكی تازەیان هێناوەو، دینی باب و باپیرانمان دەگۆڕن!!.

بەم شێوەیە بوهتان بە موسڵمانی دڵسۆز دەكەن، هەروەكو چۆن لە مێژووی ڕابردودا:

* دارو دەستەی (فیرعەون)، بوهتانیان بە (موسی) دەكردو، لای فیرعەون دەیان وت: موساو هارون ـ كە دوو پێغەمبەری خۆشەویستی خوا بوون ـ سەر لە خەڵكی دەشێوێنن و فەسادی بڵاودەكەنەوە لە زەویدا!. وەك قورئان وتەكەیانمان بۆ دەخاتە ڕوو:

﴿وَقَالَ الْمَلَأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَاءَهُمْ وَنَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ﴾ (الأعراف:١٢٧).

واتە: ئەی فیرعەون ئایا تۆ واز دەهێنی لە موساو قەومەكەی فەسادی بڵاوبكەنەوە لە زەویدا، وە دینەكەت بگۆڕن بە دینێكی تازەو وازبهێنن لە(پەرستن) و پەرستراوەكانی تۆو، دینەكەی تۆ؟!.

كەواتە ئەی موسڵمانی ژیر بیربكەوە، چۆن بەكرێ گیراوو ماستاوچیەكانی فیرعەون، تەنها خوا پەرستییان بە فەسادی بڵاوكردنەوە دادەنا لە زەویدا.

** وەهەروەها فیرعەون دەیوت موسا دینەکەتان دەگۆڕێت و فەسادی بڵاو دەکاتەوە لە وڵاتدا:

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَنْ يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ ﴾ (غافر:٢٦).

واتە: لێم گەڕێن با موسا بکوژم. با ئەویش بانگی پەروەردگارەکەی بکات دیفاعی لێ بکات؛ (چونکە من دەترسم موسا دینەکەتان بگۆڕێت و فەسادی بڵاو بکاتەوە لە زەوی و وڵاتدا!!).

(سبحان الله) ئاوا بوهتانی فەسادی بڵاو کردنەوە لە زەویدا بە پێغەمبەرانی خوا(علیهم الصلاة والسلام) بکرێت، ئەدی دەبێ بە ئێمەی شوێن کەوتەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چی بووترێت!.

وە ئایا فیرعەون دینی تازەی شیرك و کوفری بۆ خەڵکی هێنابوو ؟، یاخود موسی؛ کە نوێ کەرەوەو زیندوو کەرەوەی دینی تەنها خوا پەرستیو ئیسلامەتی بوو؟!.

** وە موشریکەکان دەیان وت: محمد دینێکی تازەی هێناوەو لە خۆیەوە دروستی کردوە پەروەردگاریش فەرمووی:(قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعاً مِنَ الرُّسُلِ) (الأحقاف:٩).

واتە: من یەکەم پێغەمبەر نیم بۆ خەڵکی، وە دینی من تازە نیەو داهێنراو نیە بەڵکو درێژە پێدەری دینی پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) پێشووە. وە دەیان وت:

﴿ أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ... مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ ﴾ (ص:٥-٧).

واتە: ئەوە محمد هەموو پەرستراوەکانی وەلاناون و تەنها یەك پەرستراو بە حەق دەزانێت. وە لای وایە کە تەنها (الله) شایستەی هاوار لێکردن و داوا لێکردنە؟ بەڕاستی ئەو بانگەوازیەی محمد شتێکی عەجیب و سەیرە !! ئێمە شتی وامان نەبیستووە لە پێشینانی خۆمان. ئەوە دیارە محمد مەبەستی زەعامەت و دونیای هەیە بەم دینە تازەیەی کە دەڵێت: تەنها(الله) پەرستراوی ڕاستەو غەیری ئەو هاوارو پەرستنیان بۆ ناکرێت !!.

براوانە برای موسڵمان: ئەمڕۆش بەهەمان شێوە، بە شوێن کەوتوانی محمد ﷺ دەڵێن مەبەستتان حیزبایەتیەو[1]، بەکرێ گیراوی دەرەوەن و، دینێکی سەیرو تازەتان هێناوە، کە باوك و باپیرانمان لەسەر ئەو دینە نەبوون!!

---

(١) لە ڕاستیشدا ئەهلی سوننەت، شوێن کەوتوانی پێغەمبەرو ﷺ موسڵمانانی پێشین، دوورن لە حزبایەتی و ئینکاریشی لێ دەکەن!

بەڵام ئەگەر قورئان حاكم بێت لە نێوانماندا، دەردەكەوێت كە ئایا ئێمەی ئەهلی سوننەت، شوێن كەوتوانی پێغەمبەرو ﷺ موسڵمانانی پێشین، دینمان تازەیەو داهێنراوە، یان ئەوانەی كە هاوار دەكەنە غەیری خوا، شەخس پەرستی دەكەن و، شەریك بۆ خوا بڕیار دەدەن ؟!.

زیاتر لە دەیان ئایەتی قورئانی، بە ئاشكراو ڕوونی باس لەوە دەكات كە: هاوار كردنە غەیری خوا شیركەو ناشەرعییە. بەڵام تەنها نیو ئایەتیش ناڵێت هاوار بكەنە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكان.

**جا هەندێك لەو ئایەتانەی كە <u>هاواركردنە غەیری خوا</u> بە شیرك دادەنێن باس دەكەین.**

**وە ئەگەر گۆڕ پەرست و نەفامەكانیش ڕاست دەكەن، با تەنها ((نیو)) ئایەت بهێننەوە كە بە <u>ئاشكراو ڕوونی</u> <u>بێ لادان و مانا گۆڕین</u> بەڵگە بێت لەسەر شەرعیەتی هاواركردنە پیاوچاكان!!.**

**وە پێیان دەڵێین:**

﴿ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّه ؟! قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (النمل:٦٤).

﴿ فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (الصافات:١٥٧).

## چەند بەڵگەیەكی قورئانی لەسەر
## بە شیرك دانانی هاواركردنە غەیری خوا

**١. خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴾(المومنون:١١٧).

واتە: هەركەسێك لەگەڵ خوا هاواربكاتە پەرستراوێكی تر؛ كەهیچ بەڵگەیەكی بە دەستەوە نیە لەسەر ئەم هاواركردنە ، ئەوا ئەو كەسەی كە لەگەڵ خوا هاواری كردە كەسانی تریش حیسابەكەی لای خوایە و خۆی موحاسەبەی دەكات ، وە حیسابەكەیشی ئەوەیە كە سەرفراز نابێت چونكە كافرە. وە كە ڕزگار و سەرفرازیش نەبوو ئەوا بە هیلاك چووە و جێگای دۆزەخە بە بەردەوامی ، پەنا بە خوا.

ئیمامی الشنقیطی (المفسّر) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی:

((قد بَيَّنَ أن حسابَه الذي عند ربِّه، لافلاح له فيه بقوله بَعْدُ (إنه لايُفْلِحُ الكافرون) وأعظم الكافرين كفراً هو من يدعو مع الله إلهاً آخر... ونفي الفلاح عنه يدل على هلاكه وأنه من أهل النـار، وقـد حذرنا الله من دعاء إله معه في آيات كثيرة...))[1]

**کەواتە: لەم ئایەتە قورئانیە دەرکەوت کە هاوار کردنە غەیری خوا کوفرەو گەورەترینی کـافران ئەو کەسەیە هاوار دەکاتە غەیری خوا لەگەڵ خوا. بەڵام بەداخەوە زۆر لە خەڵکی بە نەزانی هـاوار دەکەن و دەڵێن:((یا محمد، یا غەوس)) هاوار !.**

**٢. پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿ فلاتدع مع الله إلهاً آخر فتكون من المُعَذَّبين ﴾الشعراء (٢١٣).

**واتە:لەگەڵ (اللّه) هاوار مەکە هیچ پەرستراوێکی تر ئەگینا لە سزادراوان دەبیت.**

**٣. پەروەردگار فەرموویەتی:**

﴿ وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذاً مِنَ الظَّالِمِينَ ﴾ (يونس:١٠٦).

**واتە: لەگەڵ (اللّه) هاوار نەکەیتە هیچ یەکێکی تر چونکە غەیری الله نە سوودت پێدەگەیەنێت نە زیان و هیچیان بە دەست نیە، وە ئەگەر هاوارت کردە غەیری خوا ئەوا تۆ لە ستەمکاران دەبیت. کە زوڵمیان لە خۆیان کردووە بە شەریك دانان بۆ خوا.**

**٤. پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد کە بفەرموێت:**

﴿قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَداً قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرّاً وَلَا رَشَداً ﴾ (الجن:٢١،٢٠).

**واتە بفەرموو: من تەنها هاوار دەکەمە پەروەردگارم، وە هیچ یەکێکی تر ناکەم بە شـەریك بـۆ پەروەردگارم لە هاوار لێ کردن و داوا لێ کردن و پەرسـتن بـۆ کـردن. ﴿کەواتـە هـاوارکردن و داوا لێکردن و پاڕانەوە عیبادەتە" جا ئەگەر هاوار بکرێتە یەکێکی تر جگە لە(اللّه)؛ ئـەوە پەرسـتن و عیبادەت بۆ ئەو کەسە کراوەو کراوەتە شەریك بۆ خوا﴾.**

**وە پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە کە ئەوەی هاوار دەکاتە غەیری خوا. گـومـڕاترین کەسـەو کەس لەو گومڕاتر نیە چونکە ئەوانەش کە هاواریان دەکرێتێ عەبدو بەندەو دروسـتکراون وەك خۆیـان ـ لە دروست کراوێتیدا ـ وە هیچیان خالق و دروست کەر نـین و خـاوەنی هـیچ مـولکێکیش نـین و مردوشن و زیندوو نین، وە ئاگاشیان لە هاواری خەڵکی نیەو هاوارەکەیان نابیـستن و، ئەگـەر واش**

---

(١) تفسير ((أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن)) .

دابنێین بیستیان خۆ وەڵامیان نادەنەوەو بە فریایان ناکەون؛ چونکە هیچیان بە دەست نیە بۆ خۆشیان جا چۆن دەتوانن سودو زیانی خەڵکیان بەدەست بێت. وە ڕۆژی قیامەت ئەو پیاوچاکانەی (لە دونیا) هاواریان دەکرایە دەبن بە دوژمنی ئەو کەسانەی هاواریان دەکردنێ و لێیان بەری دەبن و بێ باوەڕ دەبن بەو شیرکەی کە ئەوانە کردوویانەو ڕازی نابن کەس لەگەڵ خوا هاواریان بکاتێ و بیان کەن بە شەریك بۆ خوا؛ چونکە ئەوان خۆیان بە بەندەیەکی لاوازو بێ دەسەڵات دەزانن لە ئاستی خواو لە خوا دەترسن و خەمی خۆیانە. وە هیچ کاتێك پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان خۆیان بە واسیتە دانەناوە لە نێوان خواو بەندەکانی: ئێستاش فەرموو بە وردی بیربکەرەوە لە مانای ئەم ئایەتانەی خوارەوە تا ڕاستیی هەموو باسەکانت بۆ دەرکەوێت تیایاندا:

٥ـ ﴿ والَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ لا يَخْلُقُونَ شَيْئاً وهُمْ يُخْلَقُونَ أَمْواتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ ومَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ (النحل: ٢٠، ٢١).

واتە: ئەوانەی هاواریان دەکەنێ هیچ شتێك دروست ناکەن بەڵکو خۆیان دروست دەکرێن. وە مردون و زیندوو نین وە هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە !! کەواتە چۆن دەبێ هاواریان بکرێتێ ؟! کە ئەوە حاڵیان بێت ؟!.

٦. ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ (الأعراف:١٩٤).

واتە: (ئەوانەی ئێوە دەیان پەرستن و هاواریان دەکەنێ جگە لە (ﷲ)، بەندەن وەکو ئێوە...).

جا کەوابوو چۆن دەبێت هاوار بکەنە بەندەو بەندایەتی بۆ بکەن ؟!.

٧. ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِنْ قَبْلِ هَذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِنْ عِلْمٍ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ. وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللهِ مَنْ لا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ وإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾(الأحقاف:٤-٦)

واتە: ئەی محمد، بە موشریکەکان بفەرموو: ئەرێ خەبەرم دەنێ، ئەوانەی ئێوە هاواریان دەکەنێ و دەیان پەرستن جگە لە (ﷲ) نیشانم دەن، چیان دروست کردووە لە زەویدا ؟! یان شەراکەتیان هەیە لەگەڵ خوا لە دروست کردنی ئاسمان؟!، ئەگەر ڕاست دەکەن کیتابێکی ئاسمانیم بۆ بهێنن کە لە پێش قورئان هاتبێت یان لەو عیلمەی لاتانە بەڵگەیەکم بۆ بهێننەوە لەسەر ئەو واسیتە دانان و هاوار کردنەو، شەریك بۆ دانانی.

بێگومان هیچ وەڵامیان پێ نیەو بێ بەڵگەو دەلیلن چونکە پەرستراوەکانیان خۆیان دروست کراون نەك دروستکەر بن وە هیچ کیتابێکی ئاسمانیش ڕێگەی نەداوە بە هاوار کردنە غەیری خوار پەرستنی غەیری ئەو. وە ئەو واسیتە دانان و، غەیری خوا پەرستنە دینێکی داهێنراوی موشریکەکانە، نەك دینی دێرینی پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) و موسڵمانانی پێشوو بێت. بۆیە پەروەردگار خۆی حوکمی بەسەر ئەو دینەی موشریکەکان دا، لە شێوەی پرسیار ئاشکرای کرد کە هیچ کەسێك گومڕاتر نیە لەو کەسەی کە هاوار دەکاتە غەیری خوا لە حاڵەتێکدا کە ئەو هاوار لێکراوە هیچ وەڵامێکی ناداتەوە تا ڕۆژی قیامەت. وە نەك تەنها وەڵام نەدانەوە بێت، بەڵکو هەر بێ ئاگاشن لەو هاوار لێکردنەی موشریکەکان چونکە یان غایبن وەیان مردوون وەیان بەردوو دارو بت و سەنەمن. وە کە ڕۆژی کۆکردنەوەی خەڵکیش هات (یوم الحشر) لە ڕۆژی قیامەت لەو ڕۆژەدا هاوار لێکراوەکان دەبن بە دوژمنی هاوارکەرەکان و دەڵێن خوایە بەبێ فەرمانی ئێمە، ئێمەیان داناوە بە شەریك بۆ تۆ، ئێمە بەرین لێیان و دوژمنیانین چونکە ئەوانە هاوبەش پەیداکەر بوون و ئێمەش تەنها تۆمان دەپەرست، وە هەروەها بێ باوەڕو نارازین بەو عیبادەت و هاوارکردنەی بۆ ئێمەیان کردووە لە دونیا: ﴿ وكانوا بعبادتهم كافرين ﴾ کەواتە هاوار کردنە غەیری خوا عیبادەت کردنیەتی. وە لەو ئایەتانەدا دەرکەوت کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان ڕۆژی قیامەت دەبن بە دوژمنی ئەوانەی لە دونیا هاواریان دەکەنێ. وە شەفاعەتیان بۆ ناکەن !!.

٨- ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِنْ قِطْمِيرٍ. إِنْ تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ (فاطر: ١٣، ١٤)

واتە: ئەو (الله) یە پەرستراوو پەروەردگارتانە، کە موڵك هەمووی بەدەست ئەوە. بەڵام ئەوانەی کە ئێوە دەیان پەرستن و هاواریان دەکەنێ جگە لە (الله) هیچ موڵکیان نیە بە ئەندازەی توێکڵە تەنکە سپیەکەی دەوری ناوکە خورماش، وە ناش بیستن چونکە یان بێ گیانن، وەیان گیان لەبەرێکی غاییب و نا مەوجودن، وەیان مردوون و لەناو گۆڕن و ژیانی دونیایان نەماوە. وە ئەگەر واش دابنێین دەبیستن هەر ناتوانن وەڵامتان بدەنەوە چونکە دەسەڵاتیان نیەو بێ توانان لە هێنانی سوودو لادانی زیان بۆ خۆشیان نەك هەر بۆ غەیری خۆیان !! کەواتە یەکێك نە موڵکی هەبێت وە نەبیستێت وە نەتوانای وەڵام دانەوەی هەبێت چۆن هاواری بکرێتێ سەربەخۆ، یان بکرێ بە واسیتە لای خوا ! وە هیچ لەو پەرستراوانەش کە هاواریان دەکەنێ جگە لە خوا وەك پێغەمبەران (علیهم الصلاه

والسلام) و پیاوچاكان و فریشتەكان ڕازی نین بەوە كە هاواریان بكەنێ و بیان كەن بە شەریك بۆ خوا"
بۆیە ڕۆژی قیامەت بەڕائەت دەكەن لەوەی كە ئەوانتان دانابوو بە شەریك بۆ خوا:

﴿إِنْ تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾(فاطر:١٤).

كەواتە ﴿ هاوار كردنە غەیری خوا شیركە﴾ وەك لەم ئایەتەدا دەركەوت.

بەڵام بەداخەوە نەفامەكان هەر بە چاكی دادەنێن و باوەڕ بەو خەبەرەی خوا ناكەن و دەڵێن:
پیاوچاك هەر دەبیستێت ئەگەر غاییب یا مردووش بێت. وە لەوەش زیاتر دەشتوانێت ئێستا
شەفاعەتمان بۆ بكات لای خواو وەڵامیشمان بداتەوە!!.

جا ئایا كەسێك تۆسقاڵێ عیلم وعەقڵی هەبێت دوای بیستنی ئەم ئایەتانە جارێكی تر هاوار
دەكاتە غەیری خوا، یان دەڵێت دروستە هاواریان بكرێتێ؟!.

بەڵام بەداخەوە نەفام و بێ ئاگایان ناگەڕێنەوە بۆلای سەرچاوەی ئیسلامەتی كە قورئان و
حەدیسەو ناچنە خزمەتیان بۆ تێگەیشتن لێیان (تدبّر) و ئیش كردن پێیان. بەلكو بەشیان لە
قورئان خوێندن تەنها بۆ مردووانە لەسەر تەعزیە، نەك بۆ زیندووەكان. وە ئەگەر بێت و لە كتابی
نوسەرێكی باوەڕ پێكراوی خۆیاندا نوسرابێت دروستە هاوار بكرێتە پیاوچاكان، ئەوە باوەڕ بەو
دەكەن، بەڵام باوەڕ بە كەلامی خوا ناكەن، وە قورئان و حەدیس دەخەنە پشت گوێ و، مانای
ئایەتەكانی دەگۆڕن و تەحریفی دەكەن بەناوی تەفسیرو لێكدانەوەو تەئویل و مەجاز. وە چەندان
شوبهە دەهێننەوە، بۆ ڕەت كردنەوەی مانای زاهیری ئەم ئایەتە قورئانیانە.

﴿ والحمد لله رب العالمین ﴾

# شوبهەکانی شەخس پەرستان و پوچەڵ کردنەوەیان

بەداخەوە نەفام و بێ ئاگایان ناگەڕێنەوە بۆلای سەرچاوەی ئیسلامەتی کە قورئان و حەدیسەو ناچنە خزمەتیان بۆ تێگەیشتن لێیان ( تدبّر ) و ئیش کردن پێیان. بەڵکو بەشیان لە قورئان خوێندن تەنها بۆ مردووانە لەسەر تەعزیە، نەك بۆ زیندووەکان. وە ئەگەر بێت و لە کتابی نوسەرێکی باوەڕ پێکراوی خۆیاندا نوسرابێت دروستە هاوار بکرێتە پیاوچاکان، ئەوە باوەڕ بەو دەکەن، بەڵام باوەڕ بە کەلامی خوا ناکەن، وە قورئان و حەدیس دەخەنە پشت گوێ و، مانای ئایەتەکانی دەگۆڕن و تەحریفی دەکەن بەناوی تەفسیرو لێکدانەوەو تەئویل و مەجاز. وە چەندان شوبهە دەهێننەوە، بۆ ڕەت کردنەوەی مانای زاهیری ئەم ئایەتە قورئانیانە.

زۆر لە نەفامانی ئەم سەردەمەی ئێمە، شەیتان سەری لێ شێواندوون و لەڕێگای ڕاستی تەنها خوا پەرستی گومڕای کردوون و، گەڕاندونیەوە بۆ سەر دینی موشریکەکانی پێشوو، بەڵام نەك بەناوی شیرك و کوفر، بەڵکو بەناوی خوا پەرستی و خۆش ویستنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان و لەخوا نزیك بوونەوە. وە هەروەها شەیتان بەوەش وازی لێ نەهێناون کە لە تەوحید ( تەنها خوا پەرستی ) دوە لای داون بۆ هاوبەشی بۆ خوا دانان (الشرك)، بەڵکو شەریك بۆ خوا دانانی بۆ ڕازاندونەوە لە پۆشاکی حەق و خوا پەرستیدا نیشانیان دەدات و چەندان شوبهەشیان فێردەکان بۆ ئەوەی بیان هێڵێتەوە لەسەر دینی شیرك و قەناعەتیان بۆ دروست بکات و موجادەلەی ئەهلی تەوحیدیشی پێ بکەن. وە شوبهەکانی شەیتان بۆتە چەکی دەستیان بۆ دیفاع کردن لە بیروباوەڕە شیرکیەکەیان لەبەرامبەر بانگەوازی ئەهلی تەوحید بۆیان. وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ وزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لا يَهْتَدُونَ ﴾ (النمل: ٢٤).

واتە: شەیتان کردەوەکانی بۆ ڕازاندوونەوەو لە ڕێگەی ڕاست لای داون.

﴿ وإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ ﴾ (الزخرف:٣٧).

واتە: شەیتانەکان لە ڕێگەی ڕاست لایان دەدەن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وا حیساب دەکەن کە هیدایەت دراون و لەسەر ڕێگەی ڕاستن !!.

وە دەفەرموێت: ﴿وإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام: من الآية ١٢١)

واتـە: شـەیتانەکان وەحـی دەنێـرن بـۆ دۆسـتەکانیان وە شـوبهەیان فێردەکـەن بـۆ ئـەوەی موجادەلەی ئێوەی دۆستی خوا ( ئەهلی تەوحید )ی پێ بکەن .

بەڵام بە پشتیوانی خوا ناتوانن لە بەرامبەر ئەهلی تەوحید بوەسـتن و شـوبهەکانیان خـۆی ناگرێت لە ئاستی بەڵگەکانی ئەهلی سـوننە ( ئـەهلی تەوحیـد ) چـونکە فێـڵ و شـوبهەی شەیتان لاوازە لە راستیدا ﴿فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾ (النساء: من الآية ٧٦ )

وە فێڵ و شوبهەی شەیتان تەنهاً لای موسڵمانی سادەی تێنەگەیشتوو لە قورئان و سـوننەت ـ رەواجی هەیە.

بەڵام لای تەنها خوا پەرستان ( شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ و هـاوەڵانی ) رەواجـی نیـەو لاوازترە بەلایەنەوە لە هێلانەی جاڵجاڵۆکە، کە هێلانەی جاڵجاڵۆکە لاوازترین هێلانەیە :

﴿ مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتاً وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ (العنكبوت:٤١)

وە هێزو توانای تەنها خوا پەرستانی شوێنکەوتەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە خۆیانەوە نیە بەڵکو لەوەوەیە کە شوێن ئەو رۆشنکەرەوە( نور )ە کەوتوون کە خوا بۆی ناردوون، کە بریتیـیە لە قورئان و سوننەت. چونکە هەرکەسێك شوێن ئەم دوو سەرچاوە رۆشن کەرەوە بکەوێت ئـەوا هەموو شتێکی لا رووناك و ئاشکرا دەبێـت و حـەق و ناحـەق لێـك جیـا دەکاتـەوەو شـەیتان ناتوانێت فێڵی لێ بکات و سەری لێ بشێوێنێت.(سوپاس بۆ خوا) .

ئێستاش با شوبهەی نەفامەکان بخەینە ژێر تیشکی رووناکی قورئان و سوننەت بە گـوێرەی تێگەیشتنی هاوەڵان و پێشەوایانی پێشینەی ئومەت:

گۆڕپەرستانی ئەمڕۆ دەڵێن: ئێمە موشریك نین، چونکە ئێمـە لـە زۆر بـیرو بـاوەڕو کـردارو گوفتاردا جیاوازین لە موشریکەکان کەواتە نابێت ئـەو ئایەتانـەی موشـریکەکانی بـە کـافر داناوەو لە سەر ئەوان دابەزیوە بەسەر ئێمەیـدا تـەتبیق بکـەن، چـونکە ئێمـە لـە زۆر شتدا جیاوازین لە موشریکان بەم شێوەی خوارەوە:

## شوبهەی یەکەم

دەڵێن: ئێمە باوەڕمان وایە تەنها خوا خالقە و دروستکاری هەموو بوونەوەرو تەنها ئەویش پادشاو خاوەنەو هەر ئەویش پەروەردگاری هەموو جیهانە. وە هەموو ئەو پیاوچاك و پێغەمبەرانەش کە ئێمە ئیعتیقادمان پێیانەو هاواریان دەکەین ئەوانیش هەر تەنها خوا دروستی کردوون و هیچیان ناکەین بە شەریکی خوا لە دروست کردنی هیچ بەشێکی بونەوەر.

کەواتە: چۆن ئێمە بەکافر دادەنرێین لە کاتێکدا باوەڕمان بە بوونی خوا هەیە ؟!. وە چۆن ئێمە بە موشریك دادەنرێین لە کاتێکدا کە ئیعتیقادمان وایە تەنها خوا خالیقەو پەروەردگارە بەبێ شەریك ؟!.

## پوچەڵ کردنەوەی شوبهەی یەکەمی شەخس پەرستان

لە وەڵامی ئەم شوبهەیەدا دەڵێین:

ئەم شوبهەیە مایەی نەفامی و بێ ئاگاییە لە قورئان و سوننەت چونکە ئەگەر ئاوڕ بدەنەوە بەلای قورئاندا بۆیان دەردەکەوێت، کە لە چەندەها ئایەتدا پەروەردگار باسی کردووە کە موشریکەکانیش باوەڕیان بە بوونی خوا بووەو لەوەش زیاتر باوەڕیان بە تەنها پەروەردگاریەتی و خالقیەتی خوا بووەو بتەکانیان بە شەریکی خوا دانەدەنا لە دروست کردن و پەروەردگاریەتیدا وە خۆیان ئیقرارایان دەکرد کە بتەکانیان دروست کراونو تەنها خوا خالیقە. وە هەروەها ( ابليس )ی مەلعونیش باوەڕی بە تەنها پەروەردگاریەتی خوا هەیەو دەڵێت: ﴿ رب خلقتني من نار ﴾ واتە: ئەی پەروەردگارم تۆ منت دروست کردوە لە ئاگر.

کەواتە ئەگەر تەنها بەو باوەڕە عەبد ببێت بە موسڵمان ئەوا دیارە ( ابليس)و موشریکەکانیش موسڵمان بوون و کافر نەبوون، چونکە ئەوانیش باوەڕیان وابوو کە تەنها خوا خالقەو پەروەردگارە وەکو گۆڕپەرستەکانی ئەمڕۆ.

کەواتە ئەی شەخس پەرستان بە تەنها بەم باوەڕ بوونە لە موشریك و کافرەکان جیا نابنەوە؛ چونکە ئەوانیش وەکو ئێوە ئەم باوەڕەیان بە خوا هەبوو وەك لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت:

١ـ ﴿ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴾ (الزخرف:٨٧)

واتە: ئەی محمد ئەگەر بپرسی لەم موشریکانە کێ دروستی کردوون ؟. لەوەلاَمدا دەڵێن: (الله) دروستی کردووین بە تەنها. کەوابوو ئەدی بۆچی هەڵدەگەڕێنەوە لە تەنها پەرستن و هاوارکردنی ئەو( الله )یەی کە بەتەنها دروستی کردون ؟ وە بۆ شتی تری لەگەڵ دەپەرستن کە هیچ پەیوەندیان نەبووە بە دروست کردنی ئێوە ؟!

٢ـ ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ ؟!﴾ ( العنكبوت : ٦١).

واتە: ئەگەر پرسیار بکەیت لە موشریکەکان: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووەو کێ خۆرو مانگی ژێربار کردووەو بە ڕێکی دەخولێنەوە. لە وەلاَمدا دەڵێن: تەنها ( الله ). کەوابوو چۆن لادەدەن لە پەرستنی ئەو ( الله )یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییەو ڕێکخەری خۆرو مانگەو چۆن لەگەڵ ئەودا هاوار دەکەنە غەیری ئەو، وە شتانێکی تر دەپەرستن ؟!.

٣ــ ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ ( العنكبوت : ٦٣) .

واتە: ئەگەر پرسیار لە موشریکەکان بکەیت کە: کێ لە ئاسمان بارانی باراندووەو زەوی مردووی ووشك بووی پێ زیندوو کردۆتەوە؟. لە وەلاَمدا دەڵێن:( الله )؛ دەتۆش بڵێ سوپاس بۆ ئەو خوایە( الحمدلله )، بەلاَم زۆربەی ئەو خەڵکە عەقڵیان نیە کە تەنها دەبێت ئەو ( الله )یە بپەرسترێت کە بارانیان بۆ دەبارێنێت و زەویان بۆ زیندوو دەکاتەوە!. جا چونکە عەقڵی ئەوەیان نیە. شەریکی بۆ دادەنێن لە پەرستن و پشت پێ بەستن و ئیعتقاد پێ بوون !!.

٤ . ﴿ قل لمن الأرض ومن فيها إن كنتم تعلمون (٨٤) سيقولون لله قل أفلا تذكرون (٨٥) قل من رب السماوات السبع ورب العرش العظيم (٨٦) سيقولون لله قل أفلا تتقون (٨٧) قل من بيده ملكوت كل شيء وهو يجير ولا يجار عليه إن كنتم تعلمون (٨٨) سيقولون لله قل فأنى تسحرون (٨٩) ﴾ المؤمنون (٨٤-٨٩).

واتە: ئەی محمد بەو موشریکانە بفەرموو: ئەم زەویەو ئەوەی کە لەناو زەویش دایە ـ موڵکی کێیە ئەگەر دەزانن ؟. بێگومان ـ لە وەلاَمدا دەڵێن ـ تەنها موڵکی (الله)یە. تۆ ئەوکاتە بفەرموو: ئەدی کەواتە بۆ بیرناکەنەوە کەتەنها ئەویش شایستەی پەرستنەو زیندوتان دەکاتەوەو موحاسەبەتان دەکات لەسەر شەریك بۆ خوا دانانتان.

وە بفەرموو: کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و کێ پەروەردگاری عەرشی گەورەیە کە لە هەموو دروستکراوێك گەورەترەو بەرزترە؟!.

بێگومان لە وەڵامدا دەڵێن: تەنها(الله) پەروەردگارە تۆش بفەرموو کەوابوو بۆ لەو تەنها پەروەردگارە؛ ناترسن و شەریکی بۆ دادەنێن لە پەرستندا، لەکاتێکدا خۆتان دان دەنێن بەوەی کە تەنها ئەو پەروەردگارە ؟.

وە بفەرموو: کێ خاوەنی هەموو شتێکەو خەزێنەی هەموو شتێکی بەدەستە ؟.

وە کێ پەنای ئەوە دەگرێ کە پەنای پێ بگرێ و پەناش لەو ناگیرێت؟ ئەگەر دەزانن؟.

لە وەڵامدا دەڵێن: ئەم دەسەڵات و موڵکە تەنها هی(الله)یە.

تۆش بفەرموو: ﴿فأنّی تسحرون﴾ واتە: کەوابوو چۆن فێڵتان لێ دەکرێت و لادەدرێن لە پەرستنی ئەو خوایەو بەڕاست دانانی هەواڵەکانی و شوێنکەوتنی فەرمانەکانی.

٥. ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ (٣١) فَذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ (٣٢) ﴾ (یونس) .

واتە: بفەرموو: کێ ڕزقتان دەدات لە ئاسمان بە باران بارین و لە زەویدا بە ڕووەك ڕواندن ؟. وە کێ بیستن و بینینی ئێوەی بە دەستە ؟. وەکێیە مردن و ژیانی بە دەستەو زیندوو لە مردوو دروست دەکات، وە مردووش لە زیندوو دروست دەکات. وەکێ کاروباری بونەوەر بەڕێوە دەبات ؟ لە وەڵامدا دەڵێن ( الله ) بەتەنها.

تۆش بفەرموو: کەوابوو بۆ لە خوا ناترسن و خۆپارێزی ناکەن لەوەی کە ئەو (الله)یە پێی ناخۆشە. وەك پەرستنی غەیری خوا ؟!

وە تەنها ئەو خوایە پەر ستراوی حەقەو شایستەی پەرستنە کە پەروەردگارتانەو هەموو شتێکی بە دەستە. وە غەیری ئەو پەروەردگارە هیچ یەکێك شایستەی پەرستن و هاوار بۆ کردن نیەو تەنها ( الله ) پەرستراوی حەقەو غەیری ئەو پەرستراوی ناڕەواو نا حەقن.

کەوابوو بۆ لە پەرستنی ئەم پەرستراوە شیاوە لادەدەن بۆ پەرستنی پەرستراوێکی ناحەق (باطل) ؟!.

كەواتە: لەم ئایەتانەدا بۆمان دەركەوت كە موشریكەكان هەموویان باوەڕیان بەوە هەبوو، كە تەنها خوا پەروەردگارەو دروستكاری بونەوەرەو خاوەنی هەموو شتێكە، وەلەو شتانەدا هیچ یەكێكیان نەدەكرد بە شەریك بۆ خوا، بەڵام لە عیبادەتدا شەریكیان بۆ خوا دادەناو پەرستنیان بۆ غەیری خوا دەكرد؛ بۆیە خوای گەورە بانگیان دەكات بۆ تەنها(ﷻ) پەرستن، لە ڕێگای باوەڕ بونیان بە تەنها پەروەردگاریەتی خوا؛ چونكە كەسێك بباوەڕی بەوە هەبێت كە تەنها (الله) پەروەردگارە، دەبێت تەنها ئەویش بپەرستێت؛ چونكە تەنها ئەو زاتە شایستەی پەرستن بۆ كردنە كە پەروەردگارو خالیق و ڕازق و مالك و قادر ... بێت، بەڵام ئەوەی كە هیچ یەكێك لەم سیفەتانەی نیە، شایستەی ئەوە نیە بپەرسترێت و عیبادەتی بۆ بكرێت و هاواری بكرێتی.

وە لە چەندان ئایەتی تریشدا دەبینین خوای گەورە ئەم باوەڕ بوونەیان بە تەنها پەروەردگاریەتی خوا ( الإيمان بتوحيد الربوبية )، دەكاتە بەڵگە لەسەر بانگ كردنیان بۆ تەنها پەرستنی ئەو ( توحيد الألوهية ). وەك لەم ئایەتانەدا دەفەرموێت:

﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ (٦٠)

أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٦١)

أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ (٦٢)

أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٦٣)

أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٦٤)﴾ سورة النمل .

**واتای ئایەتی (٦٠):** ئەی محمد پرسیار بكە لەو موشریكانە: ئایا كێ دروستی كردوە ئاسمانەكان و زەوی، وە باراندویەتی لەئاسمانەوە ئاوێك، جابەهۆی ئەو ئاوەوە باغ و بێستانی

بەديەن و جوانمان بۆسەوز كردن لەحالێكدا كەئێوە تواناى سەوز كردنى دارەكەيشيتان نەبوو ئەگەر پەروەردگار بارانى بۆ نەباراندبان !!.

كەوابوو تەنها ئەو زاتە پەرستراوە(إله)ـە كە ئەمانەى بۆ ئێوە كردووەو هەر پەرستراوێكى تر كە ئەمانەى نەكردبێت ناحەقە بە پەرستراو دابنرێت و پەرستن و سەربڕين و هاوارى بۆ بكرێت. جا ئايا هيچ پەرستراوێكى دى هەيە لەگەڵ (الله) ئەم شتانەى پێشووى بۆ ئێوە كردبێ تاوەكو بەهۆى ئەوەوە ببێتە شياوى پەرستن بۆ كردن و بەگەورە دانان ؟!.

بێگومان هيچ پەرستراوێكى تر نيە جگە لە ( الله ) ئەم كارانەى كردبێت، بەلام ئەم موشريكانە گەلێكن ( قومٌ ) لە حەق لادەدەن و پەرستراوەكانيان يەكسان دەكەن بە خوا لە پەرستن بۆ كردنداو كردوويانن بە شەريكى ( الله ) !!. لە كاتێكدا خۆيان دان دەنێن بەوەى كە شەريكى خوا نين لە دروست كردنو باران باراندن و ڕووەك سەوز كردن و پەروەردگاريتيدا !!.

**واتاى ئايەتى(٦١):** ئايا پەرستنى دروست كراوەكانى ئێوە خێرترە، يان پەرستنى ئەو خوايەى كە زەوى بۆ ئێوە جێگير كردووەو بۆى كردوون بە جێگاى قەرار گرتن و، لەناو زەويشدا چۆم و ڕووبارى بۆ داناون و، شاخى پتەويشى لە زەوى داكوتاوە بۆ بەهێزكردن و بەستنەوەى، وەهەروەها لەنێوان دوو بەحرى شيرين و سوێر، مانعێكى داناوە بۆ ئەوەى تێكەڵاو نەبن ؟! .

ئايا هيچ پەرستراو ( معبود = إله )ێك هەيە لەگەڵ ( الله ) ئەمانەى پێشووى بۆ كردبێ تاوەكو بەوە ببێتە شياوى پەرستن بۆكردن و كردنە شەريكى خوا ؟! .

نەخێر نيە، بەلام موشريكەكان هەر بەردەوامن لەسەر شەريك بۆ خوا دانان لە پەرستندا، چونكە زۆربەيان قەدرى گەورەيى خوا نازانن بۆيە بەنەفامى و كوێرانەو لاسايىكردنەوە شەريكى بۆ دادەنێن و بەندەيەكى دروستكراوى لاوازى بێ دەسەلات دەكەن بەهاوبەشى خواى دروستكارى بوونەوەر لە پەرستندا !!.

**واتاى ئايەتى(٦٢):** ئايا پەرستنى مەعبودەكانى ئێوە خێرترە يان تەنها پەرستنى ئەو خوايەى كە وەلامى لێقەوماوو داماوو غەمبار دەداتەوە كاتێ هاوارى بكاتێ. وە نارەحەتى لەسەر لادەبات. وە هەروەها دەتانكات بە نيشتەجێى پێش خۆتان ؟! .

ئايا هيچ پەرستراوێك هەيە لەگەڵ خوا خاوەنى ئەم نيعمەتانە بێت بەسەرتانەوە ؟ بۆيە ئێوەش بەندايەتى بۆ بكەن لەگەڵ خواو هاوارى بكەنێ لەكاتى تەنگانەدا ؟!

نەخێر هیچ یەکێکی تر نیە کە وەڵامی لێقەوماو بداتەوەو ناڕەحەتی لەسەر لابەرێت. وەموشریکەکان خۆیان ئەمەیان چاك دەزانی بۆیە لەکاتی تەنگانەدا ـ بۆ نمونە ـ لەناو دەریادا کە ( مەترسی تێداچوونیان بۆ دەهات) تەنها هاواریان دەکردە خوا، چونکە دەیانزانی تەنها (الله) بە فریای لێقەوماوان دێت و، ناڕەحەتیان لەسەر لادەبات. بەلأم بەداخەوە کەم عیبرەت وەردەگرن و، کەم بیردەکەنەوە لە گەورەیی و دەسەلأتی خوا؛ بۆیە مەعبوداتێکی ( پەرستراوانێکی ) نا شایستەتان پەرستوون و بەوە کردوتانن بە شەریك بۆ خوای گەورەو تاکە پەرستراوی حەق.

**واتای ئایەتی(٦٣):** وە ئایا پەرستنی ئەوانە خێرە کە کردوتانن بە شەریکی خوا، یان پەرستنی ئەو خوایەی کە ڕێنمونیتان دەکات لە تاریکایەکانی دەشت و دەریا، کاتێك کەڕێتان لێ تێك دەچێت و شەوتان بەسەردا دێت ؟ وە ئەو خوایەی کە بەر لە ناردنی بارانی ڕەحمەتی، بای مزگێنی دەنێرێ ؟

ئایا پەرستراوێکی دی لەگەڵ (الله) هەیە، ئەم شتانەی بۆ ئێوە کردبێت؛ تاوەکو ئێوەش بە شیاوی پەرستن بۆکردنی دابنێن و هاواری بکەنێ ؟

نەخێر هیچ یەکێك نیە لەو پەرستراوانە، جگە لە ( الله )، کە زۆر بەرزترە لەوەی کە دەیکەن بە شەریکی خوا ﴿ تعالى عما يشركون ﴾.

﴿ کەواتە خوای گەورە بە موشریکی دانان چونکە پەرستن و هاوارکردنیان بۆ غەیری خوا دەکرد، هەرچەندە باوەڕیان وابوو کە تەنها خوا دروستکارو ڕازیق و بارانبارێنەرو ژێنەرو مرێنەرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، وەکو لە وەڵامەکانیاندا دەرکەوت کە لەم لایەنە شەریکیان بۆ خوا دانەنابوو.

**واتای ئایەتی(٦٤):** وە ئایا کێ لە نەبوونەوە بوونەوەری دروست کردوە، دواییش تێکی دەداتەوەو، خەڵکی دەمرێنێ و، نیزامی جیهان دەشلەژێنێ ، وە دیسان دوای ئەوە دەیان گەڕێنێتەوە ؟ وەکێ ڕزقتان دەدات لە ئاسمان بە باراندنی باران و، لە زەویش بە ڕواندنی ڕووەك و دانەوێڵە ؟

ئایا هیچ مەعبودێکی ( پەرستراوێکی ) تر هەیە لەگەڵ ( الله ) ئەم شتانە بکات؛ تاوەکو ئێوەش بیپەرستن لەگەڵ ئەودا ؟!.

نەخێر چاك دەزانن کە هیچ مەعبودێك ( پەرستراوێك ) نیە ئەمانەی پێ بکرێت و شەراکەتی خوای کردبێت لەمانەدا. کەوابوو هیچ یەکێکی تر شایستەی پەرستن بۆکردن نیە لەگەڵ خوادا. وە ئەگەر هەر گومانی ئەوەش دەبەن، کە پەرستراوەکانتان شایستەی پەرستن و هاوار بۆکردن بن، وە بە دروستی دەزانن بکرێن بە واسیتە بۆ ئەوەی شەفاعەتتان بۆ بکەن لای خوا بەبێ ئەوەی خوا ڕێگای ئەوەی بە ئێوەش و ئەوانیش دابێت، ئەوا دەی بەڵگە بهێننەوە لەسەر ئەو گومان و بیرو باوەڕە شیرکیەتان ئەگەر ڕاست دەکەن : ﴿أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾.

ئێمەی ئەهلی سوننەتیش هەمان ئەم ئایەتە دەخەینە ڕووی ئەوانەی پیاوچاکان و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەکەن بە واسیتەو داوای شەفاعەت و هێنانی خۆشی و لادانی ناخۆشیان لێ دەکەن و هاواریان دەکەنێ لە خۆشی و ناخۆشیدا. وەکو پەروەردگار بەو نەفامانە دەڵێت: ﴿ هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين ﴾ بەڵگەکانتان بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن و کارەکەتان بە ڕاست دادەنێن. وا ئێمە بەڵگەکانی خۆمان باس دەکەین لە قورئان و سوننەت، ئەی کوا بەڵگەکانی ئێوەش لە قورئان و سوننەت ؟!

کەواتە: لەم ئایەتە قورئانیە پیرۆزانەدا بۆمان دەرکەوت کە موشریکەکانیش ـ وەکو شەخس پەرستانی ئەمڕۆ ـ باوەڕیان هەبوو بە: ( توحيد الربوبية ). واتە: تەنها پەروەردگارێتی خوا واتە ئیعتقادیان وابوو کە بەتەنها ( الله ): خالق و ڕازق و مالك و زیندووکەرو مرێنەرو بەڕێوەبەرو باران بارێنەرو ژینەرو پەروەردگاری ئەرزو ئاسمان و هەموو بوونەوەرەو بێ ئەوەی هیچ کەس شەریکی بێت لەم کارانە، واتە ئیعتیقادیان وابوو کە تەنها خوا خاوەنی ئەم کارانەیە (إفراد الله بأفعاله). وە کەسی تر بکەری هیچ کارێك لەم کارانە نیە جگە لە (الله).

وە هەروەها لە ڕێگای ئەم باوەڕ بوونەیان بەتەنها پەروەردگاریەتی خوا ( توحيد الربوبية )، قورئان بانگی دەکردن بۆ تەنها پەرستنی ئەو خوایە ( توحيد الألوهية ) واتە: لە ڕێگای باوەڕ بوونیان بەتەنها پەروەردگاریەتی خوا، بانگی دەکردن بۆ تەنها پەرستنی خوا. واتە ئەم باوەڕ بوونەیان بە ( توحيد الربوبية )ی دەکرد بە بەڵگە لەسەریان بۆ باوەڕ هێنانیش بەتەنها خوا پەرستی، چونکە کێ بەتەنها خالق و پەوەردگار (رب) بێت، دەبێت خەڵکی عیبادەت بۆ ئەو بکەن بەتەنها.

کەواتە کافربوونی موشریکەکان بەهۆی ئەوەوە نەبوو، کە باوەڕیان بە بوونی خوا، یان تەنها پەروەردگاریەتی خوا نەبووبێت و، باوەڕیان بە بتەکانیان بوبێت کە شەریکی خوا بن، لە دروست کردن و پەروەردگاریەتیدا!!.

نەخێر کوفرەکەیان لەبەر ئەوە نەبوو، چونکە لەمەدا شەریکیان بۆ خوا دانەدەناو، باوەڕی تەواویشیان بەتەنها پەروەردگاریەتی خوا هەبوو، بەڵام هۆی کافربوونیان و، خەڵەلیان ئەوەبوو کە: **بەتەنها ئەو پەروەردگارەیان نەدەپەرست !!**

## شوبهەی دووەمی شەخس پەرستان

دەڵێن: بەڵێ هەرچەندە موشریکەکانیش وەکو ئێمە باوەڕیان بە تەنها پەروەردگاریەتی خوا هەبوو، بەڵام ئێمە لەوەدا جیاوازین کە ئێمە خوا دەپەرستین و، موشریکەکان خوایان نەدەپەرست و کافربوون !!.

## هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی دووەم

لە وەڵامدا دەڵێین:

ڕاستە ئێوە نوێژ دەکەن و ڕۆژو دەگرن و حەج دەکەن و زەکات دەدەن و زیکر دەکەن، کە ئەمانە هەموو عیبادەتن بۆ خوا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەرستن دەکەن بۆ پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکان و قەبرەکانیان و شێخەکانتان.و عیبادەتەکەتان خالص و پاك و تەنها نیە بۆ خوا. بۆیە ئێوە بە خوا پەرست (عابد) دانانرێن ﴿ ولا أنتم عابدون ما أعبُد ﴾ چونکە شەریك بۆ خوا دادەنێن لە پەرستنداو پەروەردگار شەراکەتی کەس ناکات و ئەو عیبادەتەش قەبوڵ ناکات کە بۆ ئەوی دەکەن[1]؛ چونکە عبادەتێکی دەوێت بە خالیسی و تەنهایی بۆ ئەو بێت:

﴿ وما أُمروا إلاّ ليعبُدوا اللهَ مُخلصينَ له الدينَ حُنَفاء ﴾ سورة البيِّنة

وە موشریکەکانیش عیبادەتی خوایان دەکرد، وە حەجیان دەکردو نوێژی تایبەتیان هەبوو وە لە خوا دەپاڕانەوە، وە ئینکاری ئەوەیان نەدەکرد کە خوا شایستەی پەرستنەو دەبێت بپەرسترێت بەڵکو ئینکاری ئەوەیان دەکرد کە بەتەنها ئەو بپەرسترێت بۆیە دەیان گوت:

---

(1) وەك لە حەدیسی قودسیدا هاتووە بە سەحیحی کە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿أنا أغنى الشركاء عن الشرك، مَنْ أشرك معي شيئاً تركتُهُ وشـركَهُ﴾ وە لەبەر ئەو شیركە خوا عیبادەتی موشریکەکانی قەبووڵ نەدەکرد وەك دەفەرموێت: ﴿ وجَعَلوا لِلّهِ ممّا ذرأ من الحرثِ والأنعامِ نصيباً، فقالوا: هذا للهِ بزعمهم، وهذا لِشركائنا، فما كان لشركائهم فلا يَصِلُ الى اللهِ، وما كان لِلّهِ فهو يَصِل الى شُركائهم، ساءَ ما يحكمون ﴾ (١٣٦) الأنعام.

قال الإمام المفسِّر عبدالرحمن بن ناصر السعدي معنى الآية : ( أن ما جَعَلُوهُ وتَقَرَّبوا به لأوثانهم، فهـو تقـرُّبٌ خالص لِغير الله، ليس لله منه شيء، وما جعلوه لله ــ على زعمهم ــ فإنّه لايصل إليه لكونه شركاً، بل يكون حظ الشركاء والأنداد، لأن الله غنيٌّ عنه، لايقبل العمل الذي أشرك معه أحد من الخلق. ا.هــ ((تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)).

﴿أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا﴾ الأعراف : ٧٠

واتە: ئایا بۆ ئەوە بۆمان هاتوویت کە خوا بەتەنها بپەرستین و واز بهێنین لە پەرستنی ئەو پەرستراوانەی کە باب و باپیرانمان دەیان پەرستن ؟!

وە هەروەها دەیان وت: ﴿أَجَعَلَ الآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ سورة ص : (٥) .

واتە ئەوە محمد دەڵێت: واز بهێنن لە هەموو پەرستراوەکانتان و تەنها یەك پەرستراو بپەرستن، بەڕاستی ئەم دەعوایە شتێکی سەیرە.

کەواتە: ڕازی بوون کەخوا بپەرسترێت، بەڵام ناڕازی بوون لەوەی کە بەتەنها بپەرسترێت!. هەروەکو شەخس پەرستانی ئەمڕۆ ناڕازین پێیان بڵێین تەنها هاوار بکەنە خواو داوا بەس لەو بکەن و سوێند تەنها بەو بخۆن و...

کەواتە لەم ڕوانگەیەشەوە کە هەردوولا خوایان دەپەرست جیاوازی نیە لە نێوان شەخس پەرستانی ئەم سەردەمەو موشریکەکانی کۆن، هەرچەندە جیاوازیش هەبێت لە جۆری خوا پەرستیەکەشیان و زۆرو کەمیەکەی.

مەبەست ئەوەیە کە موشریکەکانیش باوەڕیان بە خوا پەرستی هەبوو وە بە واقعی دەیان پەرست، بەڵام شتی تریشیان لەگەڵ دەپەرست.

وە بۆیەش پێیان دەوترێت ( موشریك ) چونکە شتی تریان کردۆتە شەریکی خوا لە پەرستن بۆ کردندا کەواتە خواو بتەکانیان شەریك بوون لەو پەرستنەی موشریکەکان بۆیان دەکردن.

وە ئەگەر خواشیان نەپەرستبا لەگەڵ بتەکانیان بە موشریك دانەدەنران چونکە ئەوکاتە شەریکایەتی دروست نەدەبوو !!

کەواتە لەم ئایەتانەی ڕابردوو بۆمان دەردەکەوێت کە موشریکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ، وەکو شەخس پەرست ونەفامەکانی ئەمڕۆ باوەڕیان بەوە هەبوو کە:

أ ـ خوا هەیە.

ب ـ زیاتریش لە شەخس پەرستانی ئەمڕۆ باوەڕیان وابوو کە تەنها ئەویش پەروەردگاری جیهانیانە( رب العالمين )ـە، وە باوەڕیان وابوو کە ﴿ لا خالق ولا رازق ولا مالك ولا محيي ولا

میت ولا مُدَبِّر ولا رب إلا الله ﴾ واتە هیچ دروستکارو ڕزق دەرو خاوەن موڵك و زیندووکارو مرێنەرو بەڕێوەبەرو پەروەردگار نیە تەنها ( الله ) نەبێت.

ج ـ زیاتریش لەوە باوەڕیان وابوو کە ئەو خوایە گەورە پەرستراوەو شایستەی پەرستنیشە.

د ـ زیاتر لەوەش بە کردەوەش عیبادەتیان بۆ دەکردوو زیکرو ماڵ بەخشین و نوێژو حەجیان دەکرد ـ بەپێی عەقڵی خۆیان ـ وە نەشیان دەوت خوا ناپەرستریت بەڵام دەیان وت: چۆن دەبێت ئەو بەتەنها بپەرسترێت !.

بەداخەوە زۆر لە خەڵکی وا دەزانن ئەگەر باوەڕی بە بوونی خوا هەبوو ئەوە موسڵمانە و مرۆڤ بەوە دەبێت بە موسڵمان وە لە دوای ئەوە پەرستن بۆ هەر شتێك بکات بەلایەوە زەرەر لە ئیسلامەتیەکەی نادات، چونکە باوەڕی بە بوونی خوا هەیە. نازانن کە موشریکەکانیش باوەڕیان بە بوونی خوا هەبوو هەروەها شەیتانیش باوەڕی بە بوونی خوا هەیەو ( فیرعەون )یش باوەڕی بەوە هەبوو کەواتە ئەوانە هەموویان موسڵمان بوون بە گوێرەی گومانی ئەم نەفامانە!!

وازبهێنن لەو پەرستراوانەی تر کە لەخوا نزیکمان دەکەنەوە: بۆیە دەیان ووت:

﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللَّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (الأعراف: ٧٠)

ئایا بۆ ئەوە هاتوویت بۆلامان تاوەکو خوا بپەرستین بە تەنهاو وازبهێنین لەوانەی کە باب و باپیرانمان دەیانپەرستن ؟!

کەواتە: ڕوون بۆوە جیاوازی نیە لە نێوان شەخس پەرستانی ئەمرۆ لەگەڵ موشریکەکانی کۆن، لەم ڕووەوە کە هەر دوولا باوەڕیان بووە بە تەنها پەروەردگاریەتی خوا و خالقیەتی خوا بەڵام هەردوو لایان ناڕازین کە تەنها ئەو خوایە پەروەردگارەش پەرستراو (إلـه) بێت و هیچ یەکێکی تر نەپەرسترێت لەگەڵی و داواکردن و سەربڕین و نەزر کردن و بەگەورە دانانی بۆ نەکرێت ! .

## شوبهەی سێهەمی ( شەخس پەرستان )

دەڵێن:

ئێمە وەك موشریكەكان شەریك بۆ خوا دانانێین لەپەرستندار ئێمە خوا بەتەنها دەپەرستین. وە هاواركردنە غەیری خوا شیرك نیە، چونكە هاواركردن عیبادەت نیە وەك نوێژو ڕۆژوو. وەئێمە ئەوەی كە عیبادەتە وەك سوجدەو نوێژو ڕۆژوو تەنها بۆ خوا دەیكەین؛ كەواتە ئێمە شەریك بۆ خوا دانانێین لە پەرستندا وەك موشریكەكان.

## هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی سێهەم

لەوەڵامدا ـ بەپشتیوانی خوا ـ دەڵێم: وا دیارە شەخس پەرستان نازانن عیبادەت چیەو جۆرەكانی چین. وەهەروەها نازانن شیرك چەند جۆری هەیە !!.

وادەزانن عیبادەت تەنها نوێژو ڕۆژوو و زەكاتە، وە نازانن كە عیبادەتی دڵ و عیبادەتی لاشەو عیبادەتی زمان و عیبادەتی ماڵیش هەیە. هەروەك لەسەرەتا ڕوونمان كردەوە. وەنازانن كە:

**﴿ هەرشتێك خوا پێی خۆش بێت و فەرمانی بە كردن و ئەنجامدانی كردبێت، ئەوە بۆ ئەو عیبادەتەو، بۆ غەیری ئەویش بكرێت شیركە ﴾**

بۆ نموونە پەروەردگار پێی خۆشە هاواری بكەینێ و فەرمانی پێ كردوین هاواری بكەینێ ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾ (غافر: من الآية٦٠)

كەواتە هاوار كردنە خوا عیبادەتە چونكە خوا پێی خۆشەو لێی ڕازیە، كەواتە نابێت بۆ غەیری خوا بكرێت، چونكە عیبادەت نابێت بۆ غەیری خوا بكرێت ئەگینا شیركە.

وە هەروەها لە چەندان ئایەتدا هاوار كردن و داوا لێ كردن بە عیبادەت دانراوەو سەرف كردنی بۆ غەیری (الله) بە شیرك دانراوە. وەك لە ئایەتەكانی پێشوو دەركەوت.

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((الدعاء هو العبادة)) .

واتە: هاوار كردن و داوا لێ كردن و پاڕانەوە عیبادەتە.

كەواتە چۆن دەبێت ئەم عیبادەتە كە پاڕانەوەیە بۆ غەیری خوا بكرێت ؟!

وە هەروەها سەربڕین (النحر) عیبادەتە؛ چونکە خوا فەرمانی کردوە سەربڕین بکەین بۆ خوا ﴿ فَصَلِ لربك وانحر ﴾.

کەواتە هەروەك چۆن نوێژ عیبادەتەو کردنی بۆ غەیری خوا شیرکە بەهەمان شێوەش سەربڕین عیبادەتەو سەربڕین بۆ پیاوچاکان شیرکە.

وەهەروەها گەورەترین عیبادەت بە دڵ دەکرێت، کە ئیعتیقادت تەنها بە خوا بێت، سوودو قازانج و زەرەر و زیانی بەدەستەو دڵت بەو خۆش بێت و تەنها لەو بترسیت و ئەو بە گەورە دابنێیت و پشت بەو ببەستیت، بەڵام ئیعتیقاد بوون بە غەیری خواو داواکردن لە غەیری خواو بە گەورەدانانی شیرکەو دینی موشریکانە، چونکە عیبادەتی موشریکەکان بۆ بتەکانیان بریتی بوو لەم ئیعتیقاد پێ بوون و داوا لێ کردن و نەزر بۆ کردن و پەنا پێگرتنەی کە ئەمڕۆ بۆ قەبری پیاوچاکانی دەکەن!! .

وە ئیمامی الصنعاني فەرموویەتی سەبارەت بەم شوبهەیە:

( هذا جهل بمعنى العبادة، فإنها ليست منحصرة فيما ذكرت ـ يعني الصلاة والصوم والحج ـ بل رأسها وأساسها الإعتقاد. وقد حصل في قلوهم ـ يعني عُبّاد القبور ـ ذلك، بل يسمّونهُ معتقداً و يصنعون له ما سمعتهُ مما تفرع عن الإعتقاد: من دعائهم وندائهم والتوسل هم والإستغاثة والإستعانة والحلف والنذر وغير ذلك )[١].

(( فهولاء القبوريّون والمعتقدون في جهال الأحياء وضلالهم سلكوا مسالك المشركين حَذْو القذّة بالقُذّة فاعتقدوا فيهم مالا يجور أن يعتقد إلا في الله، وجعلوا لهم جزءاً من المالِ، وقصدوا قبورهم من ديارهم البعيدة للزيارة، وطافوا حول قبورهم، وقاموا خاضعين عند قبورهم، وهتفوا هم عند الشدائد ونحروا تقرُّباً إليهم ))[٢].

(( فإن قلت: هولاءِ القبوريّن يقولون: نحن لا نشرك بالله تعالى ولا نجعل له ندّاً الى الأولياء ليس شركاً.قلت: نعم ( يقولون بأفواههم ما ليس في قلوهم ) لكن هذا جهلٌ منهم بمعنى الشرك، فإنّ تعظيمهم الأولياء ونحرهم النحائر لهم شركٌ. والله تعالى يقول:

---

(١) تطهير الإعتقاد ص :(١١١ ).

(٢) تطهير الإعتقاد ( ص:١٠٨)

**﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾** أي له لا لغيره، كما يفيدُهُ تقديم الظرف. ويقول تعالى: **﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا﴾** .

فهذا الذي يفعلونه لأوليائهم هو عين ما فعله المشركون وصاروا به مشركين ولا ينفعهم قولهم: نحن لا نشرك بالله، شيئاً، لأنّ فعلهم أكذَبَ قولَهُم ))[٣].

(( فإفراد الله تعالى بتوحيد العبادة لا يتم إلا بأنّ يكون الدعاءُ كله له والنداء في الشدائد والرخاء لايكون إلا لله وحدهُ، والاستعانة بالله وحده، واللّجأ الى الله واالنذر والنحر له تعالى، وجميع أنواع العبادات: من الخضوع والقيام تذلُّلاً لله تعالى، والركوع والسجود والطوافِ والتجرد من الثياب، والحلف والتقصير كله لايكون إلا لله عز وجلّ ومن فعل شيئاً من ذلك لمخلوق حيٍّ أوميت أو جماد أو غيره فقد أشرك في العبادة، وصار من تُفعَلُ له هذه الأمور إلهاً لعابديه، سواء كان ملكاً أو نبيّاً أو وليّاً أو شجراً أو قبراً أو جنّاً أو حيّاً أو ميتاً.

وصار العابدُ بهذه العبادة أو بأي نوعٍ منها عابداً لذلك المخلوق مشركاً بالله. وإن أقرّ بالله وعبدهُ، فإنّ إقرار المشركين بالله وتقربهم إليه لم يخرجهم عن الشرك وعن وجوب سفك دمائهم وسَبي ذراريهم وأخذ أموالهم غنيمةً. قال الله تعالى:﴿ أنا أغنى الشركاء عن الشرك ﴾

سورة ص: ١٠٠

**کەواتە: بۆمان دەرکەوت شەخس پەرستان خوای پەروەردگاریان بە تەنها نەپەرستووە، شەریکیان بۆ داناوە، وەکو موشریکەکانی ڕابردوو، چونکە هەروەکو چۆن موشریکەکانی کۆن شیرکەکەیان بریتی بوو لە ئیعتیقاد بوون بە غەیری خواو هاوار کردنە غەیری خوا... بەهەمان شێوەش ئەمڕۆ شەخس پەرستان ئیعتیقادیان بە غەیری خوا هەیە کە: سوودیان بۆ بهێنن و زیانیان لەسەر لاببەن، وە هاواریان دەکەنێ و بە گەورەیان دادەنێن و لێیان دەترسن و نەزرو سەربڕینیان بۆ دەکەن، وە بەمە پەرستویانن و کردوویانن بە شەریکی خوا لەم پەرستنەدا.**

**ئەنجار بابزانین چ شوبهەیەکی تریان هەیە بۆ خۆ جیاکردنەوە لە موشریکان:**

---

(٣) تطهير الإعتقاد (ص:١٠٦)

## شوبهەی چوارەمی شەخس پەرستان

دەڵێن: ئێمە وەکو موشریکەکان ئیعتیقادمان بە بت و سەنەم نیە و هاواریان ناکەینۆ و هیچ بت ناپەرستین. بەڵکو ئێمە ئیعتیقادمان بە ( أولیاء الله ) دۆستان و خۆشەویستانی خوا هەیە وەك پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان. وە هاوار دەکەینە ئەوان و داوا لەوان دەکەین.

کەواتە چۆن دۆستانی خوا ( أولیاء الله ) دەهێننە ریزی بت و سەنەم. وە چۆن ئێمەی رێز گرتوو لە خۆشەویستانی خوا دەهێننە ریزی بت پەرستان ؟

## هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی چوارەم

لەوەڵامدا ـ بە پشتیوانی خوا ـ دەڵێین:

ئەگەر وا گومان بەرن کە موشریکەکانی کۆن تەنها بت و سەنەمی روت و بێ گیانیان دەپەرستن ئەوە دیارە زۆر نەفام و بێ ئاگان لە قورئان و حەدیس و مێژوو (تأریخ).

چونکە ئەگەر سەیری ئەم سێ سەرچاوانە بکەن بۆتان دەردەکەوێت کە موشریکەکانیش وەکو ئێوەی شەخس پەرست ونەفام، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان و فریشتەکان و جنۆکەیان دەپەرست. وە ئەو بتانەش کە دایان نابوون بریتی بوون لە پەیکەری پیاوچاکان و فریشتەکان و مەبەستیان هاوار کردنە پیاوچاکەکان بوو نەك بتە داتاشراوە بێ گیانەکان وەك لەم بەڵگانەی داهاتوودا دەردەکەوێت.

### (أ)ـ بەڵگەی ئەوەی کە موشریکەکان جنۆکە شەیتانەکانیان دەپەرست

١ـ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْأِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقاً﴾ (الجن:٦)

واتە: لەبەرەی مرۆڤدا پیاوانێك پەنایان دەگرت بە پیاوانێك لە جنۆکەو داوای پەناگرتنیان لەئەوان دەکرد. وە داوای پەنا گرتنیش پەرستن بۆکردنەو دانانی جنۆکەیە بە پەرستراو واتە ( إله )و شەریك بۆ خوا دانانە لە پەرستن بۆکردندا؛ بۆیە پەروەردگار دەیفەرموو:

٢ـ ﴿وجَعَلُوا للهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وخَلَقَهُمْ ...﴾ (الأنعام:١٠٠)

واتە: موشریكەكان جنۆكەیان دانابوو بە شەریك بۆ خوا لـە پەرستن و، پـەنا پێ گرتنـدا. چونكە ئیعتیقادیان وابوو كە جنۆكە سوودو زەرەر دەگەیەنن. لەكاتێكدا كە جنۆكە شایـستەی ئەوە نین ئەم جۆرە ئیعتیقادەیان پێ ببرێت و پەنایان پێ بگیرێت لەگەڵ خـوا؛ چـونكە جنۆكـە دروستكراوی خوایەو تەنها خوا خالیقە؛ كەواتە تـەنها خـالیق شایـستەی ئـەم ئیعتیقـاد پـێ بوونەیە نەك دروستكراویش !!

٣ـ وەهەروەها لەم دوو ئایەتەی سورەتی( الـسبأ ) دا پـەروەردگار خەبـەرمان دەداتـێ كـە موشریكەكان فریشتەو جنۆكەیان دەپەرستن لەگەڵ خوادا، وەك دەفەرموێت:

[وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلائِكَةِ أَهَؤُلاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ. قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمْ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ] (سـبأ: ٤٠-٤١).

واتە: لە ڕۆژی قیامـەت پـەروەردگار موشـریكەكان و پەرستراوەكانیـشیان لـە مەلائیكـە كۆدەكاتـەوە، واتـە موشـریكەكان و پەرستراوەكانیـشیان كـە فریـشتەكان بـوون، لەپاشـان پەروەردگار بە فریشتەكان دەفەرموێت: ئەوە ئەو موشریكانە ئێوەیان دەپەرست لەگەڵ خوا ؟!

فریشتەكانیش دەفەرموون:(سبحانك) واتە پاكی بۆ تۆیـە ـ ئـەی پـەروەردگار ـ لەهـەموو هاوبەش و شەریكێك و كەس شایستەی ئەوە نیـە بكرێتە شەریكی تۆ لە پەرستندا.

وە ئێمە فەرمانمان بەو موشریكانە نەكردبوو كە غەیری تۆ بپەرستن و ئێمە بكەنە هاوبەشی تۆ لە پەرستندا؛ چونكە ئێمە بەندەی تۆین و تەنها تۆش پەرستراوو خۆشەویستی ئێمەی نـەك ئـەو موشریكانە دۆستمان بن و گوێڕایەڵمان بن و بە فەرمانی ئێمە شەریكیان بـۆ تـۆ قـەرار دابنێ !!.

بەڵام موشریكەكان جنۆكە شەیتانەكانیان دەپەرست و گـوێ ڕایـەڵی ئـەوانیان دەكـرد بـۆ پەرستنی غەیری خواو شەیتانەكان هانیان دەدان هاوارو پەرستن بۆ پێغەمبەران (علیهم الـصلاة والسلام) و فریشتەكان و جنۆكەكان و پیاوچاكان بكەن و ئـەم شـەریك بـۆ خـوا دانانـەیان بـۆ دەڕازاندنەوە،و موشریكە نەفامەكانیش گوێ ڕایەڵی جنۆكە شەیتانەكانیان دەكـردو زۆربـەیان باوەڕیان پێدەكردن و بە قسەیان دەكردن وەك خوا دەفەرموێت:

﴿بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ﴾.

**وە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی شەیتانەکان بریتییە لە عیبادەت بۆ کردنیان چونکە گوێڕایەڵی کردن عیبادەتە. بۆیە پەروەردگار دەیفەرموو:**

﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لَا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ﴾ ( یس: ٦٠).

**واتە: ئەی بەرەی ئادەم فەرمانم پێنەکردن کە شەیتان نەپەرستن. ( وە پەرستنی شەیتان بریتییە لە گوێ ڕایەڵی کردنی شەیتان لەوەدا کە هاوار بکەینە پێغەمبەران** (علیهم الصلاة والسلام) **و فریشتەکان و پیاوچاکان و جنۆکەکان و پەنا بە ئەوان بگرین و سەر بڕینیان بۆ بکەین و ئیعتقادی سوودو زەرەرمان پێیان بێت ).**

**وە بۆیە ئەگەر هاوار بکەنە هەر شتێك و پەرستن بۆ هەر یەکێك بکەن جگە لە(ﷲ) ئەوە هاوارتان کردۆتە شەیتان و ئەوتان پەرستووە؛ چونکە بە قسەی شەیتان هاوارتان کردۆتە غەیری خواو گوێ ڕایەڵی شەیتانتان کردووە لە هاوارکردنە غەیری خوا. وە زانیشمان گوێڕایەڵی شەیتان یەعنی پەرستنی شەیتان. وە پەرستنی شەیتان هەر ئەوە نیە کە سوجدەو ڕکوعی بۆ ببەن !!.**

**خوای پەروەردگار دەفەرموێت:**

﴿إِنْ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِنْ يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَرِيدًا﴾ (النساء:١١٧)

**واتە: هاوار ناکەنە هیچ یەکێ غەیری خوا، تەنها هاوار دەکەنە شەیتان و ئەو دەپەرستن و هاوارەکەیان بەو دەگات، ئەگەر بە گومانی خۆیان هاواریشیان کردبێتە پێغەمبەران** (علیهم الصلاة والسلام) **و پیاوچاکان و فریشتەکان، چونکە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاك و فریشتەکان ڕازی نین هاوار بکرێتە ئەوان نە لەگەڵ خوا، وە نە بەبێ خوا (سەربەخۆ). وە ئەوەی کە ڕازییە بە هاوارکردنە غەیری خوا تەنها جنۆکە شەیتانەکانن و ئەوان لە پێش چاوی خەڵکی ئەم شیرکە دەڕازێننەوەو بەناوی لە خوا نزیك بوونەوەو وەسیلە دانان و خۆش ویستنی پێغەمبەران** (علیهم الصلاة والسلام) **و پیاوچاکان و ڕێزگرتن لێیان خەڵکی تووشی شیرك دەکەن !!**

## (ب)ـ بەڵگەى ئەوەى كە موشريكەكان پێغەمبەران و چاكەكاران و فريشتەيان دەپەرست

لە زۆر ئايەتى قورئاندا بۆمان دەردەكەوێت كە پێغەمبەرانيش (عليهم الصلاة والسلام) دەپەرستران و كرابوون بە پەرستراو ( إله ) لەگەڵ خوادا. وەك: ((عيسا)) وەهەروەها چاكەكارو صاڵحانيش پەرستراون و كراون بە ( إله ) وەك ((مريم))ـەى دايكى((عيسا)) ـ عليهما السلام ـ.

بۆيە پەروەردگار ڕۆژى قيامەت ڕوو دەكاتە (عيسا) و پێى دەفەرموێت:

(١)ـ [ وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ] (المائدة:١١٦)

واتە ئەى ( عيسا )ى كوڕى ( مريم ) ئەوە تۆ بە خەڵكيت وتووە: من و دايكم بكەن بە دوو پەرستراو ؟

( عيسا ) لە وەڵامدا دەفەرموێت: ( سبحانك ) پاكى بۆ تۆيە ـ ئەى پەروەردگار ـ لە هەموو هاوەڵ و شەريكێك. بۆ من نەهاتووەو شايستەى من نيە شتێك بە خەڵكى بڵێم كە مافى من نەبێت بەڕاستى، واتە پەرستن تەنها مافى تۆيە ئەى خوايە وە بۆمن نيە بڵێم بم پەرستن لەگەڵ خوا !!...

كەواتە: موشريك و كافرەكان تەنها بەردو دارو بت و سەنەمى بێ گيانيان نەدەپەرستن بەڕووتى، بەڵكو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و چاكەكارانيشيان دەپەرستن و دەيان كردن بە(إله) لە پەرستن بۆ كردن و هاوار لێ كردن، نەك لە دروست كردن و پەروەردگاريتيدا!!!

* وە بەڵگەى تريش لە قورئان زۆرە كە موشريكەكان پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و فريشتەيان دەپەرستن وەك ئايەتى:

(٢)ـ[وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَقُولُ أَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَٰؤُلَاءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ ؟ قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ يَنبَغِي لَنَا أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَآبَاءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا الذِّكْرَ وَكَانُوا قَوْمًا بُورًا] (الفرقان: ١٧-١٨) .

واتە: پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکاتەوە موشریکەکان و پەرستراوەکانیشیان جگە لە (الله) کە بریتی بوون لە فریشتەو پێغەمبەر ( عیسا ) و ( عوزەیر ) وەك لە ئایەتەکانی پێشوودا دەرکەوت. وە پەروەردگار بە پەرستراوەکان دەفەرموێت: ئایا ئێوە بەندەکانی منتان گومڕا کردووەو پێتان وتوون ئێمە بپەرستن لەگەڵ خوا ؟! یان خۆیان لە خۆیانەوە بێ قسەی ئێوە گومڕا بوون و ئێوەیان دەپەرست؟

لە وەڵامدا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و فریشتەکان دەفەرموون:

( سبحانك ) واتە پاکی بۆ تۆیە لە هەموو ڕێنەو هاوشێوەو شەریکێك. شیاوی ئێمە نەبووە کە غەیری تۆ دۆستمان هەبێت وە شیاوی بەرەی دروست کراوان نیە کە غەیری تۆ بپەرستن و پەرستراوی تریان هەبێت..

## (ج)ـ وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی موشریکەکان ئەو پیاوانەشیان دەپەرستن کە بە چاکیان دادەنان ئەمانەن:

بەڵگەی یەکەم: قورئان بۆمان باسی قەومی نوح دەکات کە پێنج پیاوچاکیان دەپەرستن، ناویان:( ود ) و ( سواع ) و ( یغوث ) و ( یعوق ) و ( نسر ) بوو.

وەك پەروەردگار لە سورەتی(نوح:٢٣،٢٤)بە درێژی بۆی باس کردوین کە کێشەی (نوح ﷺ) لەگەڵ قەومەکەی لەسەر ئەوە بوو کە نوح بانگی دەکردن بۆ پەرستنی خوا بە تەنهاو وازهێنان لەپەرستنی ئەو پێنج پیاو چاکەی کردبوویانن بەپەرستراو (إلـه)و ئیعتیقادیان پێیان بوو و پەرستنیان بۆ دەکردن. بەڵام قەومەکەی بەردەوام بوون لەسەر پەرستنیان و وازیان لێ نەدەهێنان و بەیەکتریان دەوت:

[وقالوا لا تذرنَّ آلهتكم، ولا تذرنَّ ودّاً ولا سواعاً ولا يغوثَ ويعوقَ ونسراً، وقد أضلُّوا كثيراً ] نوح.

واتە: واز مەهێنن لە پەرستراوەکانتان و واز لەم پێنج پەرستراوانە مەهێنن.

وعن ابن عباس: صارت الأوثانُ التي كانت في قوم نوحٍ في العرب بعدُ، أما (( ودٌّ )) كانت لكلبٍ بدومة الجندلِ، وأما (( سواع )) كانت لِهُذيلٍ، وأما (( يغوثَ )) فكانت لمرادٍ، ثم لبني غُطيفٍ بالجوفِ عند سبأ. وأما (( يعوقُ )) فكانت لهمدانَ. وأما (( نسر )) فكانت لحِمْيَر، لِآل ذي الكلاعِ، أسماءُ رجالٍ صالحين من قومِ نوحٍ. فلما هلكوا أوحى الشيطان إلى قومهم: أن

انصبوا الى مجالسهم التي كانوا يجلسون أنصاباً وسمُّوها بأسمائهم فَفعلوا. فلم تُعبدْ، حتى إذا هلك أولئك و تَنسَّخَ العلمُ عُبدتْ)[١].

واتە: پەرستراو( آلهة )ـەكانی قەومی نوح مانەوە، تا كاتی عەرەبە نەفامەكانیش، وەئەوانیش دەیان پەرستن تا دوای ناردنی پێغەمبەریش ﷺ وەهەریەك لەم پێنج پەرستراوانە بوون بە پەرستراوی ناوچەیەك لەناوچەكانی عەرەبەكان بەم شێوەیە:

یەكەم: ( ود ) پەرستراوی نەوەو عەشیەتی ( كلب ) بوو لە شوێنێك بەناوی (دَوْمَة الجندل) لە جیهەتی شام لەناو خاكی سعودیە .

دووەم: ( سواع ) پەرستراوێكی هوزەیلیەكان بوو، كە لە ناوچەی حیجاز، نزیك (مەككە).

سێهەم: ( يغوث ) پەرستراوی موڕادیەكان بوو، لە ناوچەیەكی ولاتی ( یەمەن ). وە دوایی ئەم بتە بوو بە پەرستراوی نەوەكانی ( غُطَيف ) لە شاری ( جوف ) لای سبأ.

( چوارەم ): ( يعوق ) پەرستراوی عەشیەتی هەمدانیەكان بوو ( هەمدان ) عەشیەتێكی گەورەیە لە باكوری ڕۆژهەلاتی ( یەمەن ).

( پێنجەم ): ( نسر ) پەرستراوی ( آل ذي الكلاع ) بوو كە ( حیمیەرین ) و یەمەنین.

بەم شێوەیە ئەم پێنج پەرستراوانەی قەومی نوح مانەوە لەناو عەرەبەكانداو هەریەكەیان بوو بە پەرستراوی ناوچەیەكی عەرەبەكان.

وە لەبنەڕەتدا ئەم پێنج ناوە ناوی پێنج پیاوچاكی قەومی نوح بوون. كاتێك كە مردن، خەلكەكە زۆر بە پەرۆش بوون بۆیان و شەیتانیش ئەمەی بە هەل زانی بۆیە وەسوەسەی خستە دلّی خەلكەكەو هانیدان پەیكەرو وێنەی ئەو پیاوچاكانە دروست بكەن و لە دانیشگاو پەرستگاكانیاندا دایان بنێن بۆئەوەی وەكو ئەوان خوا پەرستی بكەن. وە خەلكەكەش پەیكەرەكانیان دروست كردن و هەریەكەی بەناوی خۆیەوە. وە نەیان دەپەرستن. تاوەكو ئەو جیلە مردن و جیلی تازە هاتن كە نەیان دەزانی باب و باپیرانیان بۆ چ مەبەستێك دروستیان كردون. وە شەیتانیش جارێكی تر هەلی بۆ ڕەخساو وەسوەسەی خستە ناو دلّی ئەم جیلە تازەیەو وای تێگەیاندن كە پێشینەكانیان بە واسیتەی ئەوان داوایان لە خوا دەكردو بەپەرستنی ئەوان لە

---

(١) ( صحيح البخاري ) ( ٤٩٢٠ ) .

خوا نزیك دەبوونەوە؛ چونکە ئەم پێنجە پیاوچاك و لە خوا نزیك بوون ! بەم شێوەیە پلە بە پلە شەیتان ڕایکێشان بەرەو پەرستنیان و پەرستران.

وە ئەم سونەتە نەفامیە شیركیە، درێژەی کێشا تا سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و گەیشتە عەرەبەکانیش.

کەواتە لەم ئایەتەی سوڕەتی ( نوح ) و تەفسیرەکەی لەلایەن (ابن عباس)ـەوە چەند ڕاستیەکمان بۆ دەرکەوت:

١ـ سەرەتای دەرکەوتنی شیرك بۆ خوا دانان لە پەرستندا لە قەومی ( نوح )ەوە دەستی پێ کرد.

٢ـ شەریك بۆ خوا دانانەکەیان بریتی بوو لە پەرستنی پیاوچاکانی مردوو لەگەڵ خوا.

٣ـ ئەو بت و پەیکەرەی کە دەیان پەرستن مەبەستیان پێی خودی ئەو بتانە نەبوو بەڵکو مەبەستیان ئەو پیاوچاکانە بوو کە پەیکەرەکانیان بۆ داتاشی بوون .

٤ـ سەبەبی شیرك بۆ خوا دانان زێدەڕەوی بوو لە پیاوچاکان و ئیعتیقاد پێ بوونیان.

٥ـ لەسەردەمی عەرەبەکانیش بتی ئەو پێنج پیاوچاکانەی قەومی ( نوح )یان دەپەرستن.

٦ـ خوای گەورە پێغەمبەرانی(علیهم الصلاة والسلام) ناردن یەك لەدوای یەك لە ( نوح)ەوە تا (محمد) سەلامی خوایان لەسەر بێت بۆ بانگ کردنی خەڵکی بۆ خواپەرستی بە تەنها و وازهێنان و دوور کەوتنەوە لە پەرستنی ئەو پیاوچاکانەو غەیری ئەوانیش هەر یەکێکی تر پەرسترا بێت لەغەیری خوا.

کەواتە: ئەوەی مەبەستمان بوو لە ئایەتەکەی سوڕەتی ( نوح )و تەفسیرەکەی ابن عباس ئەوە بوو کە بزانرێت موشریکەکانی کۆن پیاوچاکانیان دەپەرستن و یەکەم شیرك کە پەیدا بوو بریتی بوو لە پەرستنی پیاوچاکان. کەوابوو شوبهەی شەخس پەرستانی ئەمڕۆ ڕاست نیە کە دەڵێن: موشریکەکان تەنها بت و بەردو داریان دەپەرست بەڵام ئێمە بت پەرست نین، بەڵکو هاوار دەکەینە پیاوچاکان. چونکە بۆمان دەرکەوت کە موشریکەکانیش شیرکەکەیان بریتی بوو لە پەرستنی پیاوچاکان و داواکردن لە ئەوان.

وە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە تەفسیرەکەی ابن عباس وتەی چەند زانایەك دەخەینە ڕوو تا زیاتر بۆت دەرکەوێت کە قەبر پەرستی ئەم سەردەمە، جیاوازی نیە لەگەڵ بت پەرستی سەردەمی

**موشریکەکان و هەردوولایان پیاوچاك پەرستن، بەڵام پێشینەکان وێنەو پەیکەریان بۆ داتاشی بوون و شوێن کەوتەکانیشیان لەم سەردەمە وێنەو قەبرەکانیان دەپەرستن:**(١)

(1)* **ابن حجر الشافعي لە شەرحی ئەم ڕیوایەتەدا دەفەرموێت:**

( ذكر السهيلي أنَّ يغوثَ هو ابن شيث بن آدم فيما قيل، وكذلك سواع وما بعده **وكانوا يتبرّكون بدعائهم، فلما مات منهم أحدٌ مثلوا صورته وتمسَّحوا بها الى زمن مهلائيل فعبدوها بتدريج الشيطان لهم**، ثم صارتْ سنَّة في العرب في الجاهلية، ولا أدري من أين سرتْ لهم تلك الأسماء؟ من قِبَل الهند... أم الشيطان ألهمَ العرب ذلك. إنتهى وما ذكره مما نقلهُ تلقاهُ من تفسيرِ بقيَ من مخلد... وفيه أن تلك الاسماء وقعت الى الهند فسموا بها أصنامهم ثم أدخلها الى أرض العرب عمرو بن لُحي ))فتح الباري :٩/٦٧٠.

* **ابن جرير الطبري الشافعي بۆمان دەگێڕێتەوە لە** محمد بن قيس:

( أن يغوث ويعوق ونسراً كانوا قوماً صالحين من بني آدم وكان لهم أتباعٌ يقتدون بهم. فلما ماتوا قال اصحابهم: لو صورناهم كان أشوقُ لنا الى العبادة؛ فصورروهم، فلما ماتوا وجاء آخرون دبَّ إليهم إبليس فقال: إنما كانوا يعبدونهم وبهم يسقون المطر. فعبدوهم ).

* **و الامام القرطبي: فەرموویەتی:**

( وإنما صورَ أوائلهم الصُّورَ لِيتأسوا بهم ويتذكروا أفعالهم الصالحة، فيجتهدوا كاجتهادهم، ويعبدوا الله عند قبورهم. ثم خلفهم قومٌ جهلوا مرادهم فوسوس لهم الشيطان، أن أسلافهم كانوا يعبدون هذه الصُّور ويعظّمونها ).

* **والإمام ابن قيم الجوزية فەرموویەتی:**

( وما زال الشيطان يوحي الى عُبادِ القبور ويلقي إليهم:

١ـ أنّ البناء والعكوف عليها من محبة أهل القبور من الأنبياء والصالحين، وأن الدعاءَ عندها مستجابٌ، ثم ينقلهم من هذه المرتبة الى:

٢ـ الدعاء بها، والإقسام على الله بها، فإنّ شأنَ الله أعظمُ من أن يُقسمَ عليه أو يسالَ باحدٍ من خلقه؛ فإذا تقرّرَ ذلك عندهم نقلهم منه الى:

٣ـ دعائه وعبادته؛ وسُؤالِ الشفاعة من دون الله، واتخاذ قبره وثناً تُعَلّقُ عليه القناديلُ والستور، ويطاف به ويُستَلم ويُقبّلُ؛ ويحجُّ إليه ويذبحُ عنده.

**بەڵگەی دووەم: وە یەکێك لە پەرستراوە (إله)کانی موشریکەکانی عەرەب بریتی بوو لە (لات) وەك قورئان باسی کردووە دەفەرموێت:**

﴿ أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى. وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى ﴾ (النجم:١٩،٢٠).

**وە ئەو بتەی کە ناوی ( لات ) بوو لە بنەڕەتدا پیاوێك بوو خزمەتی حاجیەکانی دەکرد. وە کاتێك کە مرد لەسەر قەبرەکەی دەمانەوەو وردە وردە ئیعتیقادیان پێ زیاد دەبوو تا گەیشتە ئەوەی پەرستنیان بۆ دەکردو پەیکەریان بۆ داناو بوو بە بت و پەرستراو (إله)ی موشریکەکان.**

**بەڵگەش لەسەر ئەوە:**

**١- ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە(عن ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ في قوله** (اللات والعزى) **کە فەرموویەتی:** ( كان اللات رجلاً يلتُّ سويقَ الحاج )[1]

**٢- وە ابن جرير الطبري المفسِّر: ڕیوایەتی کردووە لە** قتادة وابن عباس ومجاهد وابن زيد: (أن اللاتَّ بتشديد التاءِ. رجلٌ كان يلت السويق للحاج فمات فعكفوا على قبره فعبدوه)[2]

---

فإذا تقرّر ذلك عندهم نقلهم منه إلى:

٤ـ دعاء الناس الى عبادته، واتخاذِه عيداً ومنسكاً، ورأوا أنّ ذلك أنفع لهم في دنياهم وأخراهم.

وكل هذا مما قد عُلِمَ بالإضطرارِ من دينِ الإسلام أنّه مضادٌّ لما بعث الله به رسوله ﷺ من تجريد التوحيد، وأن لايعبد إلا الله.

فإذا تقرّرَ ذلك عندهم نقلهم منه إلى:

٥ـ أنّ من نَهَى عن ذلك فقد تنقّص أهل هذه الرتب العلية وحطهم عن منزلتهم، وزعم أنه لا حرمة لهم ولا قدر، فغضب المشركون واشمأزّت قلوبهم، كما قال تعالى: ﴿ وإذا ذكر اللهُ وحده اشمأزّتْ قلوب الذين لايومنون بالآخرة، وإذا ذكر الذين من دونه إذا هم يستبشرون ﴾

وسرى ذلك في نفوس كثيرٍ من الجهال والطغام؛وكثير ممن ينتسب الى العلم والدين، حتى عادوا أهل التوحيد و رَمَوْهم بالعظائم ونفّروا الناس عنهم، و والَوْا أهل الشرك وعظّمُوهم، وزعموا أنهم أولياء الله وأنصار دينه ورسوله، ويأبى الله ذلك [وما كانوا أولياءَهُ، إنْ أولياوه إلا المتقون﴾ **بڕوانە** فتح المجيد (٢٢٤ – ٢٢٨).

(١) صحيح البخاري(ك ٦٥ / ب ٢ ).

(٢) تفسير الطبري ( ٢٧ / ٥٨ ـــ ٥).

کەواتە بتەکانی موشریکەکان تەنها دارو بەرد نەبوون بەڵکو قەبری ئەو پیاوانەش بوو کە بە خوا پەرست و چاکیان دادەنان و بتیان بۆ دانابوون و دەیان پەرستن.

بەڵگەی سێهەم: هەروەها لە دوو ئایەتی تریشدا بۆمان دەردەکەویت کە پیاو چاکان پەرستراون لەگەڵ خوای پەروەردگارداو، هاواریان کراوەتێ لەلایەن موشریکەکانەوە، وەك پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُمْ مِنْ دُونِهِ فَلا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنْكُمْ وَلا تَحْوِيلاً . أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُوراً ﴾ الاسراء:٥٧-٥٨.

واتە: ئەی محمد: بفەرموو بە موشریکەکان: ئەوانەی کە ئێوە هاواریان دەکەنێ لە غەیری خوا بۆ ئەوەی ناڕەحەتیتان لەسەر لابەرن و سوودتان پێ بگەیەنن و لە خوا نزیکتان بکەنەوەو شەفاعەتتان بۆ بکەن، ـ بفەرموو ـ ئەوانەی کە هاواریان دەکەنێ و ئیعتیقادتان پێیانە جگە لە خوا هیچیان بە دەست نیەو لە دەسەڵاتیاندا نیە ناڕەحەتیتان لەسەر لابەرن، یان بیگۆڕن بە ئاسان تر. چونکە ئەوانەی ئێوە هاواریان دەکەنێ و داوایان لێ دەکەن خۆیان دەیانەوێت لە خوا نزیك ببنەوە بە کردەوەی چاکەو گوێ ڕایەڵی خواو ڕۆیشتن لەسەر ڕێبازە ڕاستەکەی، وە مونافەسەو پێش برکێیانە لە نزیك بوونەوە لە خوا بە کردەوەی چاکە. وە خۆیان ڕەجای ڕەحمەتی خوا دەکەن بۆ خۆیان و بە ئومێدی میهرەبانی پەروەردگارن و دەشترسن لە سزای خوای گەورە؛ چونکە سزای پەروەردگارت پێویستە مرۆڤ لێی بترسێت و خۆپارێزی لێ بکات !!

کەواتە ئەوانەی کە ئێوە ـ ئەی موشریکەکان ـ هاواریان دەکەنێ و ئیعتیقادی خێرو شەڕتان پێیانە، خۆیان بۆ نەفسی خۆشیان خێرو شەڕو سوودو زەرەریان بەدەست نیەو خۆیان لە خوا دەترسن سزایان بدات، وە کردەوەی چاکە دەکەن بۆ ئەوەی لە خوا نزیك ببنەوەو ڕەحمەتی خوایان بەرکەوێت و لە سزاکەی ڕزگاریان بێت.

جا یەکێك خۆی ئەوە حاڵی بێت چۆن دەبێت هاواری بکرێتێ و داوای هێنانی خۆشی و لادانی ناخۆشی لێ بکرێت ؟!

**وە لە لایەکی ترەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەویت کە ئەوانـەی موشـریکەکان هاواریـان دەکەنێ تەنها بێ گیان و بێ عەقڵ و بەردو دارو خۆرو مانگ و ئەستێرە نـەبـوون. بەڵکـو پیاوچاکان و پێغەمبەرانیش بوون هەروەك لێرەدا دەرکەوت.**

**چونکە بێگیان و بت و سەنەم، کردەوەی چاکە ناکات و هەوڵی لەخوا نزیك بوونەوە نادات و رەجای رەحمەتی خوا ناکات و لە سزای خوا ناترسێت؛ چونکە ئـەم سـیفات و کارانـە سـیفاتی گیان لەبەرێکی عاقڵی چاکن. نەك سیفاتی بێ گیانی بێ عەقڵ بن**[1].

**وە شێخ ابن عثیمین لە**(القول المفید شرح کتاب التوحید)(١٨٤/١)**دا فەرموویەتی:**

---

(١) **لە کتابی** ( قرة عيون الموحدين )**دا هاتووە لە تەفسیری ئەم ئایەتـەدا:**( وفيه الردّ على من ادعى أن شرك المشركين إنما هو بعبادة الاصنام وتبيّن بهذه الآية أنّ الله تعالى أنكر على من دعى معه غيره من الأنبياء والصالحين والملائكة ومن دونهم، وأنّ دعاء الأموات والغائبين لجلب نفعٍ ودفع ضرٌ من الشركِ الأكبر الذي لا يغفره الله، وأنّ ذلك ينافي ما دلّتْ عليه كلمة الإخلاص).

فتدبّر هذه الآية العظيمة يتبيّن لك التوحيد، وما ينافيه من الشرك والتنديد؛ فإنها نزلت فـيمن يعبُدُ الملائكةَ والمسيحَ وأُمهُ والعزير، فَهُم المعنيّون بقوله تعالى: ﴿ قل ادعوا الذين زعمتم من دونـه فلا يملكون كشفَ الضرِّ عنكم ولا تحويلاً ﴾ ثم بيَّن تعالى أنَّ هؤلاءِ المشركين قد خالفوا ماكـانوا يدعونهُ في دينه فقال: ﴿ أولئك الذين يدعون يبتغون الى ربهم الوسيلة أيُّهُم أقربُ ﴾ وقدَّمَ المعمول لِأنّهُ يفيد الحصر يعني يبتغون الى ربهم الوسيلة لا الى غيره. وأعظم الوسائل الى الله تعالى التوحيـد الذي بعث به الله أنبياءهُ ورُسُلَه. وخلق الخلق لِأجله.

ومن التوسل اليه: التوسل بأسماءِهِ وصفاتِهِ... وغير ذلك من الأعمال الصالحة الخالصة الـتي لم يَشُبْها شركٌ. فالتوسلُ الى الله هو بما يحبهُ ويرضاهُ، لا بما يكرههُ ويأباهُ من الشرك الذي نزَّهَ نفـسهُ عنه... ثم قال:

وأما ما ورد في معنى الآية عن ابن مسعودٍ قال: (( كان ناسٌ من الإنس يعبدون ناساً من الجنِ، فَأسلم الجنُّ وتمسَّكَ هؤلاءِ بدينهم )). فإنّه لا يخالفُ ما تقدمَ؛ لِأنَّ هذه الآية حجة على كلِ من دعا مع الله ولياً من الأولين والآخرين... فإنَّ الآية تعُمُّ من كان معبودهُ عابداً لله سواء كان من الملائكةِ أو من الجنِّ أو من البشر ) ( ٤٣ ــ ٤٤ ــ٤٥) بإختصار .

( وهذا ينطبق على كل من دُعيَ، وهو داعٍ؛ كعيسى ابــن مــريم، والملائكـــة، والأوليـــاء، والصالحين.

وأما الشجر والحجر؛ فلا يدخل في الآية) .

**واتە: ئەو حاڵەت و سيفاتانە لە هەموو يەكێكدا دێتەجێ كە هــاوارى بكرێتــێ و ئــەويش خۆى هاوار بكاتە خواو خۆى داوا لە خوا بكــات، وەك عيــساى كــوڕى مــريم و فريــشتەكان و پياوچاكان.**

**بەڵام دارو بەرد ناچنە ناو ئايەتەكەوە؛ چونكە ئەو سيفاتانەيان نين.**

**لە كۆتايدا بۆمان دەركەوت كە ئەم ئايەتەش ئاشـكراترين بەڵگەيـە بـۆ هەڵوەشـاندنەوەى شوبهەى هاوبەش پەيداكەران، كە دەڵێن موشريكەكان بەوە بە كافر دانران كە هاوارياں دەكردە بەردو دارو بت و سەنەم، بەڵام ئێمە بت و سەنەم ناپەرستين و هاوارو داواكاريمان لە پياوچـاكان و پێغەمبەرانە** (عليهم الصلاة والسلام) **!!** .

**وە بۆمـان دەركەوت كە هاوار كردنە پياوچاكان لەلايەن خەڵكى ئەمڕۆ داواكردن لە قــەبرو مـردوو يان لە زيندووى غائيب. وە ئەم كارەى خەڵكى لەسەر قەبر دەيكەن وەك: هــاوار كردنــە مـردووان و داواكردن لێيان و سەربڕين لەسەر گۆڕيان و ترسان لێيان، هيچ فەرقى نيــە لەگــەڵ حاڵى موشريكەكانى سەردەمى پێغەمبەر ﷺ لەم ڕوانگەيەوە.**

**وە ئەگەر بڵێن: چۆن ئـەو ئايەتانـەى باسى موشـريكە بـت پەرستەكان دەكات بەسـەر ئێمەى موسڵمانى هاواركردووە شێخ و پياوچاكاندا تەتبيق دەكەن ؟!**

**لە وەڵامدا دەڵێين:**

**١ـ عيبرەت بە عمومى لەفزەكانى قورئانە، نەك بەهۆى دابەزينى ئايەتەكە بە تايبەتى، وەك زانراوە لاى زانايانى (أُصُولُ الفِقه) كە دەڵێن:** (العبرةُ بِعُمُومِ اللفظ لا بِخُصُوصِ السَّبَبِ).

**وە لەفزى ئايەتەكان گشتين و گشت ئەوانە دەگرنەوە كە هاوارياں دەكرێتێ لە غـەيرى خـوا؛ جا زيندووى غـائيب بن يان مردوو؛ لە پياوچاكان و پێغەمبەران** (عليهم الصلاة والسلام) **و جنۆكـەكان و دارو بەردو خۆرو مـانگ و ئەستێرەو بت و سەنەم و گياندارو بێ گيان و عـاقڵ و ناعـاقڵ. گشت ئەوانە دەگرێتەوە. هەروەك لە تەفسيرى (المُيَسَّر)دا تەفسيرى ـ ئايەتى (٥٦، ٥٧)ى الإسراء بەم شێوەيە كراوە:**

( وهذه الآية عامةٌ في كل ما يُدعى من دون الله، ميّتاً كان أو غائباً، من الأنبياء والصالحين وغيرهم، بلفظ الاستغاثة أو الدعاء أو غيرهما، فلا معبود بحقٍ إلاّ الله ).

**٢ـ وەهەروەها جگە لەو گشتێتی (عمومی) یەی مانای ئایەتەکانیش، چەندان ئایەتی ترمان باس کرد بەڵگە لەسەر ئەوەی کە موشریکەکانی ڕابردوو بۆیە بەکافرو موشریك دادەنران؛ چونکە هاواریان دەکردە پیاوچاکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و فریشتەو جنۆکە، نەك هەر لەبەر ئەوە بە موشریك حیساب کرابن چونکە هاواریان دەکردە بت و سەنەم و ئەوانیان دەپەرست !!. چونکە بۆمان دەرکەوت کە بت و سەنەمەکەش بۆ فریشتەو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان دانرابوون و بەناوی ئەوان دەپەرستران و هاواریان دەکرایە.**

**وەهیچ جیاوازی نییە لەنێوان بت پەرستی و قەبر پەرستی و شەخس پەرستی. چونکە هەر یەکێك بپەرسترێت غەیری خوا ئەوا هەر شیرکە، جا فریشتەیەکی لەخوا نزیك بێت، یان پێغەمبەرێکی نێردراوی خوا بێت، یان پیاوچاکێك بێت، یان شەیتانی لەعنەت لێکراو بێت !!؛ چونکە هیچ یەکێك جگە لە خوا شایستەی پەرستن نییە[١].**

---

(١) **ئیمامی الصنعانی فەرموویەتی:**

( والنذر بالمال على الميّتِ ونحوه، والنحرُ على القبر والتوكّلُ به وطلب الحاجات منه هو بعينه التي كانت تفعله الجاهلية، وإنّما كانوا يفعلونه لِما يُسمُّونه وثناً وصنماً وفعله القبوريّون لما يسمّونه ولياً وقبرا ومشهداً، والأسماءُ لا أثرَ لها ولا تغير المعاني،ضرورةٌ لغوية و عقليّة وشرعية، فإنَّ مَنْ شَرِبَ الخمرَ وسمَّاها ماءً، ما شرِب إلا خمراً وعقابه عقاب شارب الخمر. ولعله يزيدُ عقابه للتدليس والكذب في التسمية.

وكذلك تسمية القبر مشهداً، ومن يعتقدون فيه ولياً: لا يخرجهُ عن اسم الصنم والوثن، إذ هم معاملون لها معاملة المشركين للأصنام. ويطوفون طواف الحجاج ببيتِ الله الحرام، ويستلمونهم استلامهم لأركان البيت، ويخاطبون الميّتَ بكلمات كفرية من قولهم: على الله وعليك، ويهتفون بأسمائهم عند الشدائد ونحوها. وكل قوم لهم رجلٌ ينادونه... وهذا هو بعينه فعل المشركين في الأصنام )) (تطهير الاعتقاد) .

# شوبهەی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم و هەشتەم

دەڵێن:

٥ـ * موشریکەکان بتەکانیان کردبوون بە ( آلهة ) و بە پەرستاریان دادەنان.

٦ـ * موشریکەکان ئیعتیقادیان وابوو کەبتەکانیان شایستەی عیبادەت بۆ کردنن.

٧ـ * موشریکەکان بە واقیعیش عیبادەتیان دەکرد بۆ ئەو بتانەیان.

٨ـ * موشریکەکان بە هۆی پەرستنی بتەکانیان دەیان ویست لە خوا نزیك ببنەوە و خێرو خۆشیان تووش بێت.

بەڵام ئێمە جیاوازین لە موشریکەکان لە هەموو ئەم خاڵانەی پێشوو: چونکە:

* پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان بە ( آلهة ) دانانێین و هیچ کەسێك لە ئێمە ناڵێت: شێخ عبدالقادر ـ بۆ نمونە ـ ( إله ) ـە یان پێغەمبەر ﷺ ( إله ) ـە!

* وە ئێمە ئیعتیقادمان وانیە کە ئەوان شایستەی پەرستن بن.

* وە ئێمە ئەوان ناپەرستین تاوەکو لە خوا نزیکمان بکەنەوە، بەڵکو بە پیرۆزیان دەزانین و داوای بەرەکەت و شەفاعەتیان لێدەکەین ) !

## هەڵوەشاندنەوەی شوبهەکانیان

لە وەڵامدا ـ بە پشتیوانی خوا ـ دەڵێین:

لە وەڵامی شوبهەکانی ڕابردوو وەڵامی ئەم شوبهانەشمان دایەوە، بەڵام بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەو بن بڕ کردنی شوبهەکانیان، زیاتر درێژە دەدەین بە ڕوون کردنەوەی حەق و پوچەڵ کردنەوەی باطل ـ إن شاء الله ـ بۆیە دەڵێین:

دیارە ئەو گۆڕپەرست وشەخس پەرستانە زۆر نەفامن، بۆیە شەیتان جۆرەها شوبهەی سەیرو پوچیان بۆ دەنێرێت و گاڵتە بە عەقڵ و هەستیان دەکات و دەیان خەڵەتێنێت و وایان لێ دەکات وا هەست بکەن کە هیدایەت دراون و لەسەر حەقن و عیلمیان پێیەو خاوەن بەڵگەن. بەڵام لە ڕاستیدا هەوڵەکانیان پوچەڵەو بەڵگەکانیان شوبهەنەو ئاوەکەیان سەرابە. دیارە ئەم جاهیلانە نازانن: ( إله ) یەعنی چی !.

وە عیبادەت چیەو جۆرەکانی چین !

**زانایانی زمانەوانی ( اللغويُّون ): واتای ( إله) یان بەم شێوەیە لێك داوەتەوە: بۆ نمونە لە (القاموس المحيط) دا هاتووە:**

(( أَلَهَ، إلهَةً، و أُلوهَةً: عَبَدَ عبادَةً، ومنه لفظُ الجلالة ( الله )... وأصله: إله بمعنى: مألوه، وكلُّ ما اتُخذَ معبوداً إلهٌ عند مُتَّخذه. والتألُّه: التنسّك والتَعَبُّدُ )).

**واتە: ( أَلَهَ ) یەعنی پەرستی. ( إله ) یەعنی پەرستراو. وە هەر شتێك پەرستنی بۆ کرابێت ئەوە بە ( إله ) دانراوە لای ئەوەی پەرستنی بۆ کردووە. وە (تألُّه) بریتییە لە بەندایەتی کردن و عیبادەت کردن.**

**وە شێخ سليمان بن سَحمان فەرموویەتی:**

(( الإلهُ معناهُ: الذي تألَهُهُ القلوب بالمحبَّةِ، والخضوع والخوف والرجاءِ وتوابع ذلك، من الرغبةِ والرهبَةِ، والتوكلِ والإستغاثة، والدعاءِ والذبحِ، والنذر والسجودِ، وجميع أنواع العبادة الباطنة والظاهرة، فهو إله بمعنى مألوه: أي معبود.

**واجمع أهل اللغةِ على أنَّ هذا معنى الإله... و جميع العلماء من المفسرين، و شُرَّاحِ الحديث والفقه وغيرهم، يُفسِّرون ( الإله ) بأنَّه المعبود.**

**فإذا كان هذا هو معنى ( الإله ) في اللغة والشَرعِ، فهو المستحقّ بالعبادة ــ المتقدم ذكرها ــ ويقصد لِأجل هذه الأمور:**

**فمن صرف من هذه العبادة المتقدم ذكرها ـ شيئاً لغير الله فقد اتخذهُ إلهاً، لأنَّه صرف خالص حقّ الله لغيره، وأشركه معه في عبادتِه، ومن أشرك باللهِ أحداً في عبادتِه كان مشركاً، سواء كان المدعو المستغاث به ملكاً أو نبيّاً، أو وليّاً، أو صنماً.**

**وإن اعتقد أن من يدعوه، ويستغيث به، ويرجوه، ويذبح لهُ، ويلجأُ إليه، ويُعَلِّقُ آمالَهُ به، لا يضُرُّ ولا ينفع، وأنَّه ليس إلهاً، ولا يستحق العبادة !!**

ولا ينفعهُ اعتقاده أن الله إلهٌ واحدٌ، وهو يعبد معه غيره، ولا تنفعه معرفته أن الانبياء أنبياءٌ، والأولياءَ أولياءٌ وهو يُشركهم في عبادة الله !!!

فإذا صرف المشركون لمن يعتقدون منه، شيئاً من هذه العبادة كانوا بذلك مشركين، فكذلك من يزعم أنَّه مسلم، ويتلفظ بالشهادتين، ويقرُّ بسائر الأركان إذا صرف من هذه العبادة شيئاً لغير الله كان مشركاً.

**وە فەرموویەتی:**

(( فإن العبادة التي لا يستحقّها إلا الله مع الاقرار بتوحيد الربوبيّة هي أفعالُ العبد الصادرة منه، كالدعاء، والحُبِّ، والخوف، والرجاء، والخضوع، والخشوع، والإنابة، والتوكل، والمحبة والتعظيم، والإستغاثة، والإستعاذة والذبح، والنذر، وغير ذلك من أنواع العبادة التي اختصّ الله بها دون مَنْ سواه، وهو المستحق لها دون مَنْ عداه، فمن صَرف منها شيئاً لغير الله كان مشركاً، سواء اعتقد التأثير فيمن يدعوه، ويستغيث به، أو أنه مستحق، أو لم يعتقد ذلك، وإن فَرَّ من تسمية فعله ذلك شركاً، وتألُّها، وعبادة، فإنَّه من المعلوم عند كُل عاقلٍ أنّ حقائق الاشياء لا تتغيرّ بتغيُّر أسمائها، فلا تزول هذه المفاسد بتغيُّر أسمائها، كتسمية عبادة غير الله توسُّلاً، وتشفعاً، أو تبّركاً، وتعظيماً للصالحين وتوقراً، فإن الاعتبار بحقائق الأمور لا بالأسماءِ والاصطلاحات، والحكم يدور مع الحقيقة وجوداً وعدماً لا مع الاسماء )).

(( فمن تَألَّـهَ غير الله فقد اعتقد أنه مستحق للعبادة بتألُّهِهِ إياه بأنواع هذه العبادة، شاء أم أبى، ولا ينفَعُهُ إقراره أن المستحق للعبادة هو الله وحده، وهو يُشرك به غيره ))

(( إن المشركين عبدوا تلك الآلهة بالفعل الصادر منهم، كالدعاء، والحب، والخوف، والتعظيم، والرجاء، والاستغاثة، والإستعاذة، والذبح لهم، والنذر، والالتجاء إليهم، فصرفوا لهم هذه العبادة، ليشفعوا لهم عند الله، وليقربوهم الى الله زلفى،

[ إنما كانوا يعتقدون حصول البركة منها بتعظيمها، ودعائها، والاعتماد عليها في حصول ما يرجونه منها، و يُومّلونه ببركتها و شفاعتها، وغير ذلك ].

وهكذا حال مشركي هذه الأزمان، إنما عبدوهم بالفعل والاعتقاد فيهم، وتوسَّلوا بهم، وقصدوهم لِأجل التبرّك بهم، والاستشفاع بجاههم، لا لِأجل أنهم مستحقون للعبادة، ولا أنهم مستقلون بالخلق والإيجاد، والنفع والضر.

وأيضاً فإنّ بمجرد ارتكاب فعلٍ أو قول، أو اعتقادٍ لغير الله، مما يُعَدّ من العبادة، من الدعاء، والذبح، وما تقدَّم ذكره- مُوقِعٌ في الإشراكِ، سواء وجد معه اعتقادُ ألوهيةِ غير الله، أم لا))[1].

(1) (( الضياء الشارق في رد شبهات الماذق المارق)) الشيخ سليمان بن سحمان.

واتە: ( إله ) بريتىيە لەوەی كە دڵەكان دەيپەرستن بە خۆش ويستنی و مل كەچ بوون بۆی و لێ ترسانی و ڕەجای خێر بوون پێی... وە پشت پێ بەستنی و داوای فرياكەوتن لێی و هاوار كردنی و سەربڕين بۆ كردنی و نەزر كردن و سوجدە بردن بۆی. وە هەروەها پەرستنی بە هەموو جۆرەكانی عيبادەتی ناوەكی و دەرەكی. ( دڵ و زمان و لاشە ).

وە گشت زانايانی زمانەوانی و مانا لێك دەرەوانی قورئـان ( المفسِّرون ) و شـەرح كـارانی حەديس و زانايانی فيقهو غەيری ئەوانيش بەم شێوەيە مانای ( إله )يان لێك داوەتەوە.

جا كە مانای ( إلـه ) لە زمانی عەرەبيداو لە شەرعيشدا بريتی بێت لـەوەی پەرسـتنی بـۆ دەكرێت و لەبەر ئەم شتانەی پێشوو ( خۆشويستن و بە گەورەدانان و داوا لێ كـردن ... ) ڕووی تێ بكرێت. كەوابوو هەر كەسێك يەك جۆر لە جۆرەكانی عيبادەت بكات بۆ غەيری خوا، ئـەوە كردوويەتی بە ( إلـه ). چونكە حەقی ( الله )ی بەخشيوە بەو غەيری خوايـەو كردوويـەتی بـە شەريكی ( الله ) لە پەرستندا. وە هەر كەسێكيش يـەكێكی تـر بكاتـە شـەريكی خـوا لـە پەرستندا ئەوە موشريكە جا، ئەو كەسەی هاواری دەكاتێ و پەرستنی بۆ دەكات فريشتە بێـت، يان پێغەمبەر ﷺ يان وەلی، يان بت، يان دار، يان بەرد، يان قەبر، يان جنۆكە، فـەرقی نيـە. ئەگەر ئيعتيقاديشی وابێت كە ئەوەی هاواری دەكاتێ و داوای فرياكەوتنی لێ دەكـات و ڕەجـای خێری لێ دەكات و سەربڕينی بۆ دەكات و پەنای پێدەگرێت و ئاواتەكانی بەوەوە دەبەسـتێتەوە ـ زەرەرو سوود ناگەيەنێت و ( إله )يش نيەو شايستەی عيبادەتيش نيـە!.

وە ئەگەر ئيعتيقاديشی وابوو تەنها ( الله ) ( إله )ە، وە هيچ پەرستراوو ئيلاهی تريش نيـە، ئەم ئيعتيقادە سوودی نيـە لە كاتێكدا كە ئەو كەسە عيبادەت بكـات بـۆ غـەيری ( الله ). وە هەرچەندە واش بزانێت كە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) تـەنها پێغەمبـەرن و پياوچـاكان تەنها( أولياء )ن، سوودی نيە، لە كاتێكدا كە ئەو بيانكات بە شەريكی خوا لـە پەرسـتنداو، لەگەڵ خوا هاواريان بكاتێ و بيان پەرستێت؛ چونكە چـۆن موشـريكەكان بـەهۆی عيبـادەت كردنی پەرسـتراوەكانيان بـوون بـە موشـريك، بەهـەمان شـێوەش هەركەسـێك لەوانـەی كـە موسڵمانن و شايەدی دەهێنن و دان دەنێن بـە ڕوكنـەكانی ئيـسلام؛ ئەگـەر بێـت و ئـەوانيش جۆرێك لە جۆرەكانی عيبادەت بكەن بۆ غەيری خوا ئەوە پێی دەبن بە موشريك لای خوا.

وە فەرمووی: ئەو عیبادەتەی کە کەس شایستەی نیە تەنها ( الله ) نەبێت لەگەڵ دان نان بە تەنها پەروەردگاریەتی ( الله ). بریتیە:

لەو کردەوەو گوفتارانەی کە لە عەبدەوە دەردەچن وەك هاوار کردن و خۆش ویستن و لێ ترسان و ڕەجا کردن و مل کەچ بوون و زەلیل بوون و پشت پێ بەستن و بە گەورە دانان و داوای فریاکەوتن و پەناگرتن، و سەربڕین و نەزرو غەیری ئەوانەش لە جۆرەکانی تری عیبادەتی دڵ و زمان و لاشەو ماڵ، کە تەنها خوا شایستەیانەو پێویستە بۆ ئەو بکرێن بە تەنها نەك بۆ کەسی تریش. جا هەر کەسێك هەر جۆرێك لەم جۆرانەی عیبادەت بکات بۆ غەیری خوا ئەوە موشریکە لەهەموو حاڵەتێکدا: باوەڕی وابێت کە ئەوەی هاواری کردۆتێ و عیبادەتی بۆ کردوە کاریگەری و تەئسیری هەیە یان نا، شایستەی عیبادەتە یان شایستە نیە، هەروەکو یەکە. (هەرچەندە ڕابکات لەناونانی کارەکەی بە شیرك و، ڕابکات لە ناونانی پەرستن بۆ کراوەکەی بە (إله) و، پەرستنەکەی بە عیبادەت !! ) ئەم ڕاکردنە دادی نادات؛ چونکە لە ناوەڕۆکدا کارەکەی عیبادەتەو بۆ غەیری خوای کردوەو کردوویەتی بە پەرستراو (إلـه)و شەریکی خوا هەرچەندە ئەم ناوانەشیان لێ نەنێت، چونکە زانراوە لای هەموو عاقڵێك کە ( ناوەڕۆکی شتەکان ناگۆڕێت بە گۆڕینی ناوەکانیان ). وەك گۆڕینی ناوی (عیبادەت کردنی غەیری خوا ) بە ناوی (توسُّل) و(تشفُع) و (تبرُك) و بە گەورەدانانی پیاوچاکان و ڕێز لێنانیان.

چونکە عیبرەت بە ناوەڕۆکی شتەکانە نەك بە ناوەکانیان، وە حوکم لەگەڵ ناوەڕۆك و حەقیقەتدا دەسوڕێت بە بوون و نەبوون نەك لەگەڵ ناودا.

جا هەرکەسێك عیبادەت بکات بۆ غەیری خوا ئەوە لە ڕاستیدا ئیعتیقادی وابووە کە شایستەی عیبادەتە بە هۆی پەرستن بۆکردنی بەم جۆرە پەرستنانەوە. وە سوودی پێناگەیەنێت کە بەدەم دەڵێت تەنها خوا شایستەی عیبادەتە؛ چونکە لە ڕاستیدا شەریکی بۆ خوا داناوە.

وەقورئان و سوننەت بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك ئیعتیقادی بە یەکێك بێت و خۆشی بوێت و بەگەورەی دابنێت و ڕەجای خێری لێ بکات یان هاواری بکاتێ و داوای فریاکەوتنی لێ بکات یان نەزری بۆ بکات و سەربڕینی بۆ بکات، ئەوە کردوویەتی بە( إلـه ) پەرستراو و بەشایستەی پەرستنی داناوەو، لە واقیعدا پەرستنی بۆ کردوە، ئەگەر خۆیشی هەست بەمە نەکات و ناوی ( إله ) و پەرستن بۆ کردنیشی لێ نەنێت و، بە شیرکیشی نەزانێت: وە ئێستاش فەرموو لەگەڵ ئەم بەڵگەیە:

* عن أبي واقد الليثي قال: (( خرجنا مع رسول الله ﷺ إلى حنين ونحن حُدثاءُ عهدٍ بكفرٍ، وللمشركين سِدرةٌ يعكفون عندها، وينوطون بها أسلحتهم، يقال لها ذات أنواط، فَمَرَرنا بِسِدرةٍ، فقلنا يا رسول الله، اجعل لنا ذات أنواطٍ كما لهم ذاتُ أنواط، فقال رسول الله ﷺ : [ الله أكبر إنها السُّنن، قلتم والذي نفسي بيده كما قالت بنو اسرائيل لموسى:﴿ اجعل لنا إلهاً كما لهم آلهةٌ قال إنكم قومٌ تجهلون ﴾[1] لتركبنَّ سنن من كان قبلكم][2]

**مانایەکەی: أبو واقد ڕەزای خوای لێ بێت فەرموی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین بەرەو (حنين). وە ئێمەش تازە وازمان هێنابوو لە کوفر، زۆر دەمێك نەبوو ئیمانمان هێنابوو ( واتە تەواو ڕیشاڵی جاهیلیەت لە بیرو بۆچوونماندا دەرنەهاتبوو ).**

**وە موشریکەکان درەختێکیان هەبوو چەکەکانیان پێ هەڵدەواسی، وە لەژێری و دەوری دادەنیشتن و ئیعتیقادیان وابوو کە درەختێکی پیرۆزو بەرەکەتو سەرکەوتنیان لێ وەدەست دەکەوێت، وە بە درەختەکەیان دەوت ( ذات أنواط ) واتە: درەختە خاوەن لقە چەك پێ هەڵواسراوەکە. أبو واقد فەرمووی: وە ئێمەش بەلای درەختێکی تردا ڕۆیشتین و وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا: تۆش درەختێکی پیرۆز بۆ ئێمە دیاری بکە تاوەکو چەکەکانمانی پێ هەڵواسین و پیرۆزی و بەرەکەت بڕژێت بەسەرماندا بەهۆی درەختەکەوە، هەروەك چۆن موشریکەکان درەختێکیان بۆخۆیان دیاری کردوەو ئیعتیقادیان پێیەتی کە پیرۆزو بەرەکەتی پێوەیە !!.**

**وە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی داواکاریەکەیاندا ـ بەتووڕەیی و سەر سوڕمانەوە فەرمووی: الله أكبر، ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕێبازو ڕێچکەی کافرو موشریکەکانە. وە سوێند بەوەی نەفسی منی بە دەستە قسەیەکتان کرد وەك قسەی جولەکەکان. کە دوای ئەوەی لە بەحرەکە ڕزگاریان بوو و پەڕینەوە، بەلای قەومێکدا هاتن کە بتیان بۆ خۆیان دانابوو و پابەندی بتەکانیان بوون، بە موسا پێغەمبەریان ـ** عليه السلام **ـ وت: ﴿** اجعل لنا إلهاً كما لهم آلهة **﴾ وە تۆش ئەی موسا پەرستراوێك (إله)ێك بۆ ئێمە دابنێ هەروەکو چۆن ئەو قەومە بت پەرستە پەرستراو ( ئالیهە ) یان هەیە !! موساش پێی فەرموون ئێوە قەومێکی نەفام و جاهیلن ئەگینا چۆن داوای ئەوەم لێ دەکەن پەرستنی غەیری خواتان نیشان بدەم، لەکاتێکدا تەنها (الله) پەرستراوی حەق و پەروەردگاری هەموو بوونەوەرەو ئەویش ئێوەی ڕزگار کرد لە فیرعەون، وە**

---

(1) الأعراف ( ١٣٨ )

(2) رواه أحمد والترمذي وقال ( حسن صحيح ) .

ئێوەی پەڕاندەوە لە بەحرەکەو ئەوانیشی خنکاند !! کەوابوو چۆن داوا دەکەن غەیری ( الله ) بپەرستن کە خاوەنی ئەو هەموو نیعمەتە گەورەیەیە لەسەر ئێوە بە تایبەتی ؟!

ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە تەشبیهی داواکاری هاوەڵانی خۆی کرد بە داوای هاوەڵانی موسا، فەرمووی:

ئێوە ـ ئەی ئومەتی من ـ شوێن ڕێبازی کافرو موشریکەکانی پێشوو دەکەون!.

کەواتە لەم حەدیسە صەحیحەدا چەند دەرسێک وەردەگرین:

١ـ هەر کەسێك ئیعتیقادی بە غەیری خوا ببێت؛ بە درەختێك یان بەردێك یان قەبرێك یان پیاوچاکێکی زیندوو یان مردوو، وە پێی وابوو بە شتێك لەمانە بەرەکەت و پیرۆزی لێ وەدەست دەکەوێت، یاخود لای درەختەکە یان لای قەبرەکە بمێنێتەوە (عکوف) بەو نیازەی کە دوعا لای ئەو قبوڵەو شوێنێکی بەبەرەکەتەو ئیعتیقادی بکاتە سەرو هاواری بکاتێ و ڕەجای خێرو بەرەکەت دەستکەوتنی لێوە بکات ئەوا:

( أ) ـ ئەو درەختە، وە ئەو قەبرەی کردوە بە ( إله ).

(ب) ـ بە شایستەی پەرستنی داناوە لە ئیعیقادی خۆیدا.

(ج) ـ پەرستنی بۆ کردوە.

(د) ـ کردوویەتی بە شەریك و ڕێنە ( نِدّ )ی خوا لە پەرستن بۆ کردن و ئیعتیقاد پێ بووندا. ئەگەر خۆیشی هەست بەوە نەکات و بە شیرکی دانەنێت و نەشزانێت کە ئیعتیقادو کارەکەی ئەمە دەگەیەنێت؛ چونکە ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ کە تازە وازیان لە کوفر هێنابوو و تەواو شارەزا نەبوون لە ئیسلام وایان نەدەزانی کە ئەم داواکاریە وەك داواکاری هاوەڵانی موسایەو داوای ( إله ) دانانە لەگەڵ خوا!!. وە لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆیان وایان حیساب نەدەکرد، بەڵام داواکەیان ئەوەی دەگەیاند. پێغەمبەر ﷺ داوایەکەی ئەوانی چواند بە داوای (بنو إسرائیل ) وە داوای بەنو ئیسڕائیل بریتی بوو لە دانانی بتێك بە ( إله ) بۆ پەرستنی لەگەڵ خوا. هەرچەندە کە ئەوانیش نەفام و جاهیل بوون بۆیە موسا فەرمووی:﴿ إنكم قومٌ تجهلون ﴾.

کەواتە مرۆڤ ئیعتیقادی بەهەر شتێك بێت وەك پیاوچاکان و گۆڕەکانیان و دارو بەردو شاڵ پەڕۆی سەر قەبران و... وە بە گەورەیان دابنێت و ڕەجای خێری پێ بێن و داوایان لێ بکات ئەوە بە ( إلـه )ی داناوەو کردویەتی بە وێنە( ندّ ) و شەریك بۆ خواو پەرستنی بۆ کردوەو بە

شایستەی پەرستن بۆ كردنی دانـاوە، ئەگەر خۆیشی وانەڵێت و را حیساب نەكات و واش نەزانێت !.

كەواتە ئەو شتەی مرۆڤ ئیعتیقادی پێیەتی جگە لە خوا، وە ئیعتیمادی كردۆتە سەرو هاواری دەكاتێ، ئەوە كردوویەتی بە ( إله )، ئەگەر ناوی ئیلاهیشی لێ نەنێت و بەناوی ( ذات أنـواط ) نـاوی بنێت، یان بە قەبر یان بە شێخ یان بە پێغەمبەر ﷺ ... چونكە جۆری ئیعتیقادو ئیعتیمادەكە حیسابە نەك ناو. وە چونكە پێغەمبەر ﷺ سوێندی خوارد لەسەر ئەوەی كە داوای هاوەڵانی هاوشێوەی داوای هاوەڵانی موسایە لەناوەڕۆكدا هەرچەندە لەناویشدا جیاواز بوون !! .

وە هەرچەندە هاوەڵان داوای ئەوەیان نەكرد درەختەكە بپەرستن، بەڵكو داوایەكەیان بـۆ ئـەوە بوو بەرەكەتیان دەست كەوێت لێی. بەڵام دیارە ئەوەش هەر نادروستەو سەر دەكێشێ بۆ شیرك.

وە شێخ عبدالرحمن بن حسن لە شەرحی ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی:

( أخبر ـ أي النبيُّ ﷺ أنّ التبرُّك بالآشجار يجعلُها آلهةً، وإن لم يُسمُّوها آلهة. ولِذلك شبَّه قولهم هذا بقولِ بني إسرائيل لموسى: ﴿ اجعل لنا إلهاً كما لهم آلهة.. ﴾ فظهر بهذا الحديث أن التعليق على الاشجار والأحجار وغيرها لِطلب البركة بها شركٌ في العبادة كشركِ عبادة الأصنام )[1].

واتە پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەیەدا خەبەری داوە كە تەبەڕوك كـردن (واتـە ئیعتیقـادی بەرەكەت بوون) بە درەخت و بەرد، كردنیانە بـە پەرسـتراو (ئالیهـە) ئەگـەر نـاویش نـەنرێن ئالیهە. بۆیە پێغەمبەر ﷺ قسەی هاوەڵەكانی خۆی چواند بە قسەی هاوەڵانی موسا كـە داوای ( إله ) دانانیـان لێی كرد.

كەواتە بەم حەدیسە دەركەوت كە دڵ بەستنەوە بە درەخـت و بـەردو غـەیری ئەوانـەش بـۆ بەرەكەت دەست كەوتن لێیان، شەریك دانانە لەعیبادەتدا وەك شەریك دانان بە بت پەرستی!.

تێبینـی: ئەم هاوەڵانە داوای ئەم شتە هەڵەیان كرد لە پێغەمبەر ﷺ كە تـازە دوای فـەتحی مەككە موسڵمان ببوون و تەواو لە ئیسلام شارەزا نەبوون. وە بەم داوایەش نەبوون بە موشریك چونكە بە كردەوە نەیان كرد، بەڵكو تەنها داواكردن بوو، وە لە نەزانینیشەوە بـوو، وە دوایـیش پەشیمان بوونەوە لەم داوایەو بیروباوەڕە .

---

(١) ( قرة عيون الموحدين ص ٦٦ ) .

## شوبهەی نۆیەم

دەڵێن:

باشە بۆمان دەرکەوت کە موشریکەکانیش هاوارو پەرستنیان بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان بوو وەکو وەکو ئێمە، بەڵام ئەوان داوایان لە خودی پیاوچاکەکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەکرد سەربەخۆ، واتە داوایان لە ئەوان دەکرد فریایان بکەون و پەرستنیان بۆ ئەوان دەکرد سەربەخۆ، بەڵام ئێمە مەبەستمان خودی پیاوچاکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نیە کاتێك هاواریان دەکەینێ و داوایان لێدەکەین، واتە ناڵێین با ئەوان خۆیان وەڵامـان بدەنـەوە بەڵکو دەڵێین با بۆمان لە خوا بپارێنەوەو لەو نزیکمان بکەنەوەو شەفاعەت و تکامان بۆ بکەن لای ئەو. کەواتە ئێمە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان وەك (وەسیلە) بەکار دەهێنین بۆ ئەوەی ببنە (واسیتە)مان لای خوا و(شەفاعەتمان) بۆ بکەن لای خواو لەو نزیکمان بکەنەوە.

بەڵام موشریکەکان مەبەستیان لە هاوارکردنی پیاوچاکان پەرستنی خودی پیاوچاکەکان بوو نەك وەك: (واسیتە) و (شەفاعەتکار) و (وەسیلە) داوایان لێ کردبن. کەواتـە: موشـریکەکان بۆیە کافر بوون و بە موشریك دانران چونکە سەربەخۆ داوایان لە پیاوچاکان دەکردو ئـەوانیان دەپەرست. بەڵام ئێمە ئەوان ناپەرستین و داوای واسیتەو شەفاعەتیان لێدەکەین و وەسیلەمانن بۆ نزیك بوونەوەمان لە خوا !!.

## وەڵامی شوبهەی نۆیەم

لەوەڵامدا دەڵێین:

بەڕاستی ئێوە قسەیەکتان کرد وەك هەمان قسەی موشریکەکانی پێشوو، وەك پـەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ بل قالوا مثل ما قال الأولون ﴾ ٨١ : المومنون.

چـونکە موشـریکەکانی پێـشوش هـەمان قـسەی ئێوەیـان دەکـرد، وە هـەمان شـوبهەیان دەهێنایەوە کە دەیان وت تەنها (الله) خالیقـەو خوایـە، بـەڵام پەرسـتراوەکانمان واسـیتەمانن و شەفاعەتمان بۆ دەکەن !!، وە دڵی موشریکەکانی کـۆن و نـەفامانی تـازە هاوشـێوەی یـەکن و هەمان شوبهەیان لێوە هەڵ دەقوڵێت. وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ كذلك قال الذين من قبلهم مثل قولهم تشابهت قلوبهم قد بيّنا الآيات لقوم يوقنون ﴾ ١١٨ ـ البقرة.

وە بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا بیت ـ خوێنەری هۆشیار ـ کە موشریکی کۆن و گۆڕپەرستە نەفامەکانی تازە لەیەك دەچن لە بیروڕاو ئیعتیقادا، بە بەڵگەی قورئان چەند ڕاستیەکت دەخەمە بەرچاو بۆ ئەوەی بەڕاستی موشریکەکانی کۆن بناسیت تا بتوانیت نەفامەکانی ئەم سەردەمە بەراوورد بکەیت لەگەڵیان و بۆت دەرکەوێت کە هیچ جیاوازیان نیە لە شەریك بۆ خوا داناندا.

خوای گەورە لە قورئاندا بۆی ڕوون کردووینەوە کە موشریکەکانیش لە هاوار کردنە غەیری خواو پەرستنی بت و پەیکەری پیاوچاك و فریشتەو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) مەبەستیان نزیك بوونەوە بوو لە خوا بە هۆی شەفاعەتی ئەم واسیتانەوە. وەك لەم دوو ئایەتەدا دەردەکەوێت:

١.[ والذين اتخذوا من دونه أولياء ما نعبدهم إلا ليُقربونا الى الله زلفي إنَّ الله يحكم بينهم فيما هم فيه يختلفون إنَّ الله لا يهدي من هو كاذبٌ كفّارٌ ] ٣.الزمر

واتە: ئەوانەی کە غەیری خوا چەند دۆست و خۆشەویست و ئەولیایان دانابوون بۆ خۆیان، دەیان وت: ئێمە نایان پەرستین تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە لە خوا نزیکمان بکەنەوە. چونکە ئەوان لە خوا نزیکترن!. بێگومان خوا داوەری دەکات لە نێوانیاندا، لەو شتانەدا کە کێشەیان لەسەری هەیەو، ڕایان دەربارەی جۆراو جۆرە. بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەڕە چەوتەیان ـ کە واسیتە دانانە ـ لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموونی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن !.[1]

٢.[ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لاَ يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلاَ فِي الأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ] (يونس:١٨)

واتە: جگە لە خوا شتانێك دەپەرستن کە نە زیانیان پێدەگەیەنن و نە سوودیش. وە دەڵێن: ئەوانە شەفاعەتکارمانن لای خواو شەفاعەتمان بۆ دەکەن بۆیە دەیان پەرستین تاوەکو شەفاعەتمان بۆ بکەن !! .

---

١. بۆ تێگەیشتنی مانای ئەم ئایەتە زۆر بە تەواوی بڕوانە: ((تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)) العلاّمة عبدالرحمن بن ناصر السعدي.

كەواتە بەم دوو ئایەتە قورئانیە پیرۆزە دەركەوت كە ئەم دوو شوبهەیە (واسیتەو شەفاعەت لەبنەڕەتدا شوبهەی موشریكە كافرەكانن بۆ نەفامە گۆڕپەرستەكان ماونەتەوە؛ چونكە ئەوانیش وەكو ئەمانە هەمان عوزریان بۆخۆیان دەهێنایەوە، كەواتە لەم بوارەشەوە هیچ جیاوازیەك نیە لەگەڵ موشریكەكانی كۆن و شەخس پەرستە نەفامەكانی ئەمڕۆ. وە كاری هەردووكیشیان بە شیرك دادەنرێن چونكە:

هاواركردنە غەیری خواو، پەرستنی غەیری خوا شیركە؛ جا سەربەخۆ بێت یان بە واسیتە، واتە بەهەر شێوەیەک هاوار بكەیتە غەیری خوا هەر شیركە؛ جا باوەڕت وابێت كە خودی پیاوچاكەكە وەڵامت دەداتەوە سەربەخۆ، یان باوەڕت وابێت بۆت لە خوا دەپارێتەوەو واسیتەت بۆ دەكات لای خوا، بۆ ئەوەی خوا وەڵامت بداتەوە. هەمووی هەر شیركەو كوفرە، وەك لە كۆتایی دوو ئایەتەكەی پێشوو بۆمان دەردەكەوێت:

١ـ لە كۆتایی ئایەتەكەی واسیتە پەروەردگار فەرمووی:

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ سورة الزمر : (٣) .

واتە: پەروەردگار هیدایەتی ئەو كەسە نادات كە درۆ بكات بە ناوی خواوەو لە خۆیەوە بەناوی خوا دینێك بۆ خۆی دابنێت و بشڵێت: خوا لەوە ڕازیە. وەهەروەها خوا هیدایەتی كافران نادات، كەواتە بە دوو وەسف خوای گەورە وەسفی ئەو كەسانەی كرد كە واسیتە لە نێوان خۆیان و خوادا دادەنێن (كاذب كفّار) درۆزن و كافر.

كەواتە هەركەسێك پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكان بكاتە واسیتە لە نێوان خۆی و خوادا، وە هاواریان بكاتن و داوایان لێ بكات بەو نیازەی كە لە خوا نزیكی بخەنەوە ئەوە درۆی بەناوی خواوە كردووەو كافریشە (كاذب كفّار) وە خواش هیدایەتی نادات.

٢ـ وەلە كۆتایی ئایەتەكەی شەفاعەت: پەروەردگار فەرمووی:

﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ يونس : ١٨

واتە: پەروەردگار پاك و بەرزە لەو شەریكەی بۆی دادەنێن بەناوی شەفاعەت كارەوە.

كەواتە هەر كەسێك هاوار بكاتە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكان و داوای شەفاعەتیان لێ بكات لە دوونیا دوای مردنیان ئەوە شەریكی بۆ خوا داناوەو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكانی كردون بە شەریكی خوا. پەنا بە خوا.

کەواتە ئەگەر شەخس پەرستانی ئەمڕۆ بەوە دڵی خۆیان خۆش بکەن و بڵێن ئێمە شەریکمان بۆ خوا دانەناوە، چونکە وەك واسیتە پیاوچاکان حیساب دەکەین و داوای شەفاعەتیان لێ دەکەین لای خوا؛ ئەوە با بزانن بەمە توشی کوفر دەبن، چونکە دەرکەوت بە بەڵگەی قورئانی کە ئەمە شیرکەو کوفرەو، موشریکەکانی کۆنیش لەسەر هەمان بیروبڕوا بوون، بۆیە خوا بە کافرو موشریکی دانان. وە گۆڕپەرستانی ئەمڕۆ زۆرجار داواکاریان لە خودی شێخ و پیاوچاکە مردووەکانە سەربەخۆ، واتە: ئیعتیقادیان وایە کە شێخ وەڵامدانەوەی داواکاریەکانی لە توانادایە دوای مردنیش سەربەخۆ !!

وە زانای المفسّر عبدالرحمن بن ناصر السعدي فەرموویەتی:

(دعاء أهل القبورِ والإستغاثة بِهم وطلبُ الحوائجِ الدنيوية والأخروية منهم،... شرك أكبر، وهو عين ما يفعله عباد الأصنام مع أصنامهم.

ولا فرق في هذا بين:

١. أن يعتقد الفاعل لذلك أنّهم مستقلُّون في تحصيل مطالبه،٢. أو متوسـطون الى الله؛ فـإنّ المشركين يقولون : ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ ﴿وَيَقُولُونَ هَؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ﴾.

فمن زعم أنّه لا يكفر من دعا أهل القبورِ حتى يعتقد أنّهم مستقلُّون بالنفعِ ودفع الـضرر، وأنّ من اعتقد أنّ الله هو الفاعل وأنّهم وسائطٌ بين الله وبين من دعاهم واستغاثَ بِهم لم يكفر ـــ مـن زعم ذلك فقد كذّب ما جاء به الكتاب والسنَّة، وأجمعت عليه الأمة من أنّ مَنْ دعا غير الله فهـو مشركٌ كافرٌ في الحالينِ المذكورينِ سواء اعتقدهم مستقلّين أو متوسطين.

وهذا معلومٌ بالضرورة من دينِ الإسلام. فعليك هذا التفصيل الذي يحصل به الفرقـان في هـذا الباب المهم الذي حصل به من الإضطرابِ والفتنة ما حصل، و لم ينجُ من فتنتهِ إلا مَنْ عَرف الحـقَّ واتَّبعهُ)[1]..

وە زانای پایە بەرز شێخ سلیمان بن سحمان ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ سەبارەت بەوانەی کە هاوار دەکەنە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان و دەیان کەن بە وەسیلەو واسیتەو داوای شەفاعەتیان لێ دەکەن فەرموویەتی:

---

(١) (القول السديد شرح كتاب التوحيد ص ـ ٧٥ ـ).

((لا يخلوا معتقد هذه الأفعال عن أحدِ ثلاثة أمُورٍ

١ـ إما أن يعتقد أنهم مُسْتحقون للعبادة من دون الله، أو مع الله.

٢ـ وإما أن لا يعتقد ذلك، لكن ليقربوهم إلى الله زلفى.

٣-وإمّا أنْ لا تكون هذه الأفعال عبادة)).

(٣) فإن كان أراد أن هذا الافعال ليست بعبادة؛ فقد كابر العقل والشرع وباهت في الضروريات؛

[ فإنّ العبادة التي لا يستحقها إلا الله مع الإقرار بتوحيد الربوبيّة هي أفعال العبد الصادرة منه، كالدعاء، والحب، والخوف، والرجاء، والخضوع، والخشوع، والانابة،والتوكل، والتعظيم، والاستغاثة، والدعاء، والالتجاء، والاستعانة، والاستعاذة، والذبح، والنذر، وغير ذلك من أنواع العبادة التي اختصَّ الله بِها دون من سواه، هو المستحق لها دون من عداه، فمن صرف منها شيئاً لغير اللهِ كان مشركاً، سواء اعتقد التأثير فيمن يدعوه، ويستغيث به، أو أنّه مستحق لذلك، أو غير مستحق، أو لم يعتقد ذلك، وإنْ فَرّ من تسمية فعلِه ذلك شركاً، وتألُّها، وعبادةً، [ **فإنه من المعلوم عند كل عاقل أنّ حقائق الاشياء لا تتغيّر بتغيّر أسمائها، فلا تزول هذه المفاسد بتغيُّر أسمائها، كتسميةِ عبادة غير الله توسُّلاً، وتشفُّعاً، أو تَبَرُّكاً، وتعظيماً للصالحين، وتوقيراً، فإنّ الاعتبار بحقائق الامور لا بالأسماء والاصطلاحاتِ، والحكم يدور مع الحقيقةِ وجوداً وعدماً، لا مع الاسماء.** ]

(١) وإن كان أراد بها ليقربهم الى اللهِ زُلفى، مع اعتقادهم أن الله هو النافع، الضار، المدبر لجميع الأمور، وأنه لا خالق إلا الله، فهذا هو شرك الجاهلية.

(٢) وإن أراد أنهم مستحقون للعبادة من دون اللهِ، أو مع الله، كان هذا أعظم من شرك الجاهليةِ، فإن هذا شركٌ في الربوبيّةِ والأُلوهية معاً)[1].

**وە دوای ئەوە كە بۆمان دەركەوت: موشريكەكانی كۆنيش هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەران** (عليهم الصلاة والسلام) **و پياوچاكانيان دەپەرست تاوەكو لە خوا نزيكيان بكەنەوەو شەفاعەتيان بۆ بكەن وەك**

---

(١) (الضياء الشارق في ردّ شبهات الماذق المارق-٤٠٧-) .

شەخس پەرستانی ئەمڕۆ ـ پێویستە زیاتر لەم شوبهەیەی شەخس پەرستان بگەین بە ڕوونی کە دەڵێن:

مەبەستمان لە هاوارکردنە پیاوچاکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەیە وەك (وەسیلە) بەکاریان بهێنین بۆ ئەوەی ببنە (واسیتە)مان و لای خوا (شەفاعەتمان) بۆ بکەن، بۆیە پێویستە لەم شوبهە سێ سوچە بگەین کە بریتییە لە:

**((توسل))، ((واسیتە))، ((شەفاعەت)).**

جا بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم شوبهە سێ سووچە، دانە دانە باسیان لێوە دەکەین و ڕوونیان دەکەینەوەو شوبهەی موشریك و شەخس پەرستانیان تێدا پوچەڵ دەکەینەوە.بە پشتیوانی خوا. وە بۆ ئەوەی بە تەواوی شوبهەیان نەهێڵین و بۆ ئەوانیش و خەڵکیشی بسەلمێنین کە شەخس پەرستان ونەفامانی ئەمڕۆ لەسەر دینی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان نین کە دینی ئیسلامە، بەڵکو لەسەر دینی موشریکەکانی کۆنن!!.

وە تاوەکو ڕوون بێتەوە کە ئەوانەی بە تەنها خوا دەپەرستن و هاوار دەکەنە ئەو، تەنها ئەوان لەسەر دینی دێرینی ئیسلام ماونەتەوەو ڕێبازی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکانیان گوم نەکردووە. بەڵام شەخس پەرستان کە هاوار دەکەنە غەیری خوا دینێکی تازەیان هێناوەتە ناو خەڵکەوە کە نوێکەرەوەی دینی موشریکانە.

# ﴿شوبهەی دەیەم﴾

# ﴿هۆکارو ڕێگاکانی نزیك بوونەوە لە خوا بۆ گیرا وونی دوعا﴾

# ﴿ الوسيلة ﴾

خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ ﴾ (المائدة : ٣٥)

واتە: ئەی بڕواداران تەقوای خوا بکەن و، وەسیلەی نزیك کەرەوە بگرنە دەست بۆ لای خوا.

بەڵام شەخس پەرستان لایان وایە وەسیلە بریتییە لە حەزرەتی شێخ و پیاوچاکان، وە وا دەزانن کە ئەوان لەخوا نزیکیان دەکەنەوە، لەبەرئەوە کردوویانن بە واسیتە بۆلای خواو داوای لە خوا نزیك کردنەوەیان لێ دەکەن!.

## وەڵامی شوبهەی دەیەم ﴿ الوسيلة ﴾

بێگومان بۆچوونەکەیان هەڵەیەو پاشماوەی دینی موشریکەکانە کە واسیتەی عیبادەت و هاوار کردن و شەفاعەت بۆ کردنیان دادەنا لەنێوان خۆیان و خوای گەورە.

وە زانایانی مانا لێك دەرەوەی قورئان (المفسّرون) فەرموویانە وەسیلە بریتییە لە (نزیك بوونەوە لە خوا بە: <u>کردنی فەرمانەکانی</u> و <u>دوورکەوتنەوە لە نەهیەکانی</u> بە <u>خالیسی لەبەر خواو بەم شێوەیەش کە محمد ﷺ پێی ڕاگەیاندووین لە پەروەردگارەوە</u>). وەك پەروەردگار خۆی لە حەدیسێکی قودسیدا دەفەرموێت:

﴿ وما تقرَّب إليَّ عبدي بشيءٍ أحبُّ إليَّ مِمّا افترَضْتُهُ عليه، ولا يزال عبدي يتقرَّبُ إليَّ بالنوافلِ حتى أحبّه﴾[1].

واتە: بەندەی من لێم نزیك نابێتەوە بە هیچ شتێك خۆشەویست تر لام، لە بەجێ گەیاندنی ئەو کارانەی فەرزم کردون لەسەری. وە بەردەوام بەندەی من لێم نزیك دەبێتەوە بە سوننەتەکانیش تا خۆشم دەوێت.

کەواتە: وەسیلەی نزیك بوونەوە لە خوا ئەنجامدانی فەرزەکان و سوننەتەکانە.

---

(١) رواه البخاري.

**وە زانای(المفسّر) [ الإمام الشنقيطي ﴾ لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی:**

(اعلم أنّ جمهور العلماء على أنّ المراد بالوسيلة هنا هو **القربة الى الله تعالى**: بامتثال أوامره، واجتناب نواهيه؛ على وفق ما جاء به محمد ﷺ باخلاص في ذلك لله تعالى، لأنّ هذا وحده هو الطريق الموصلة إلى رضا الله تعالى، ونيلِ ما عنده من خير الدنيا والآخرة.

وأصل الوسيلة: الطريق التي تُقرِّب إلى الشيء، وتوصل إليه وهي العمل الصالح بإجماع العلماء، لأنهُ لا وسيلة الى الله تعالى إلا باتباع رسوله ﷺ ، وعلى هذا فالآيات المبينة للمراد من الوسيلة كثيرةٌ حداً كقوله تعالى: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ﴾ ...

﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1] .

**وبهذا التحقيق تعلم أنّ ما يزعمه كثيرٌ من ملاحدةِ أتباع الجهال المدّعين للتصوّف من أن المراد بالوسيلةِ في الآية الشيخُ الذي يكون له واسطة بينه وبين ربّه، أنّه تخبُّطٌ في الجهل و العمى و ضلال مُبين و تلاعب بكتاب الله تعالى، واتخاذ *الوسائط* من دون الله من أصول كُفر الكفار**، كما صرّح به تعالى في قوله عنهم: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ وقوله : ﴿وَيَقُولُونَ هَؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ﴾... سبحانه وتعالى عمّا يُشركون ، **فيجب على كل مكلّفٍ أن يعلم أن الطريق الموصلة إلى رضى الله وجنّتة ورحمته هي اتّباع رسوله ﷺ** ، **ومن حاد عن ذلك فقد ضلّ سواء السبيل))**[2].

قال تعالى: ﴿قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾ الإسراء: ٥٦.

معنى الآية إنكم تدعون مخلوقين من أنبياء وملائكة وجن وإنس وغيرهم فهولاء لا يستطيعون أن يكشفوا عنكم أي ضر ولا يحولوه عنكم...وهم أنفسهم أي الأنبياء وغيرهم يدعون ويتغون إلى ربهم الوسيلة بطلبهم قربه ورحمته سبحانه ويخافون عذابه... فإذا كان هذا حالهم فكيف تجعلونهم أنتم وسيلة إلى ربكم . يقول العلامة الآلوسي في روح المعاني ١٢٤/٦ وكذلك في تفسير القاسمي ١٩٦٨/٦ ان الوسيلة في الآية هنا تطلق على الأعمال الصالحة.

---

(1) يقول ابن عباس والسدي وقتادة في تفسير هذه الآية (( أي تقربوا اليه بطاعته والعمل بما يرضيه )) قال ابن كثير (( وهذا الذي قاله هؤلاء الائمة الأربع لا خلاف فيه بين المفسرين )) تفسير ابن كثير ٥٢/٢- ٥٣ .

(2) (أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن) .

## تێبینی: تەوەسسول دوو جۆرە:

# یەکەم: تەوەسولی شەرعی و جۆرەکانی

## التوسُّل الشرعي وأنواعه

١. التوسُّل بـ: أسماء الله الحسنى وصفاته العُلى.

واتە پاڕانەوە لە خواو داوای لێ نزیك بوونەوەی بە خاتری زات و سیفاتی خوا، سوننەتە.

داوا لە خوا بکەیت بە ناوە جوان و سیفاتە بەرزەکانی. بۆ نمونە بڵێیت :

ئەی پەروەردگاری بە ڕەحم روحمم پێ بکە.

ئەی پەروەردگاری دەوڵەمەند ماڵێکی حەلاڵ و بەخێرم پێ ببەخشە.

ئەی پەروەردگاری لێبوردە لێم ببورە. وە بەم شێوەیە. وەك لە ئایەتەکانی قورئادا دەیبینین: ﴿رب اغفر وارحم وأنت خير الراحمين﴾ ﴿... وأنت خير الغافرين﴾.

٢. التوسُّل بـ: إيمانك بالله وبما جاء عن الله سبحانه، و بـأعمالك الصالحة.

واتە پاڕانەوە لە خواو داوای لێ نزیك بوونەوەی بە خاتری ئیمانەکەت بە خواو بەو شتانەش کە لەوەوە هاتوون، سوننەتە. وە هەروەها بە خاتری کردەوە چاکەکانی خۆت.

واتە بڵێیت خوایە بۆ خاتری ئەو ئیمانەم کە هەمە بە تۆو بە نێرراوەکەت و... بەو شتانەش کە لەتۆوە هاتوون، وە بۆ خاتری ئەو کردەوە چاکانەی کە بۆ تۆم کردوون، وە بۆ خاتری ئەو خۆشەویستیەم کە بۆ نێرراوەکەتم هەیە، ڕوحمم پێ بکەو وەڵامم بدەوەو، داواکاریم بەجێ بێنە.

وە ئەم جۆرە تەوەسسولە سوننەتەو بەڵگەی زۆری لە سەرە، بۆ نمونە:

* ﴿ فآمنا ربنا فاغفر لنا وارحمنا ﴾.

* حەدیسی سێ کەسەکەی کە بەردێکی گەورە دەرگای ئەشکەوتەکەیانی گرت.

٣. التوسُّل بدعاء الأنبياء والصالحين :

پاڕانەوە لە خواو داوای لێ نزیك بوونەوەی بە خاتری دوعاو پاڕانەوەی غەیری خۆت بۆت، سوننەتە. وەك:

(أ) دوعای پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکان لە ژیانی دونیایاندا، بچیتە لایان وە داوای دوعایان لێ بکەیت:

(ب) وە لە ڕۆژی دواییشدا موسڵمانان دەچنە لایان و داوای شەفاعەتیان لێ دەکەن.

ئەو تەوەسولە نزیك بوونەوەیەکی شەرعییە لە خوا، وە بەڵگەی قورئان و سوننەتی لەسەرە.

بەڵام لە خوا پاڕانەوە بە خاتری زاتی دروستکراوان بیدعەیە.

## دووەم: تەوەسولی نا شەرعی (التوسل الشركي و البدعي)

بەڵام لە دونیا داواکردنی دوعاو شەفاعەت لە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکان، دوای مردنیان، ئەوە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و ئاشکرا لەسەر شەرعیەتی نیە، بەڵکو بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر ناشەرعیەتی و شیرکیەتی؛ چونکە داواکردن لە مردووان شیرکەو کوفرە، هەروەکو دەیەها بەڵگەمان باس کرد لەسەر ئەوە لە ڕابردوو، وەهەروەها ئەگەر دروست بوایە، ئەوا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەیانکردو دەچونە سەر گۆڕەکەی و، داوای دوعایان لێ دەکرد، بەڵام هیچ کام لەم شتانە نەبووە؛ چونکە دەیان زانی شیرکە، وە هەر لەبەر ئەوە:

* لەو ساڵەی کە باران نەباری (عمر)ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ، چوو بۆ لای (عەباسی) مامی پێغەمبەر ﷺ و داوای دوعاکردنی لەو کرد، بۆئەوەی دوعایان بۆ بکات باران ببارێت، وە نەچوون بۆ سەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ داوای دوعا لەو بکەن کە گۆڕەکەی لە ناو خۆیاندابوو لەبەر دەستیان !.

وەئیمامی بوخاری ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە لە صەحیحەکەیدا دەفەرموێ:

ئیمامی(عومەر)ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ موسڵمانانی کۆکردەوەو لە (مـصلّى) (گۆڕەپانی شوێن نوێژ)، وە نوێژە بارانە (صلاة الإستسقاء) و، داوای باران بارینیان کردو، (عمر) ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ وتی:

(اللهم إنّا كنّا نتوسلُ إليك بنبيّنا فتسقينا، وإنّا نتوسّلُ إليك بعمِّ نبيّنا فاسقِنا، قُمْ يا عباس فادعُ لنا).

ئەی پەروەردگار ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر باران نەباریبایە داوامان لێ دەکردیت بە پێغەمبەرەکەمان، واتە داوامان لەو دەکرد لێت بپاڕێتەوەو داوای باران بارینت لێ

بكات، تۆش بارانت بۆدەباراندین، بەڵام ئـەمڕۆ كـە پێغەمبـەرﷺ نـەماوە، داوات لێ دەكـەین بەهۆی دوعای مامی پێغەمبەر ﷺ، دە ئەی پەروەردگارمان دوعـای (عبـاس) قـەبوڵ بكـەو بارانمان بۆ ببارێنە. ئەمجار (عمر) فەرمانی كرد بە (عبـاس) - ڕەزای خوای لێ بێـت - دوعایـان بـۆ بكات و فەرمووی: (قُم یا عباس فادعُ اللە لنا). واتە: فەرمووی ئەی عباس هەستە دوعامان بۆ بكە. وە ئەم ڕووداوەش بە ئامادەبوونی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو، چونكە كۆ ببوونەوە بۆ نوێژە بارانە. وە هەمووشیان ڕازی بوون لەسەر ئەو كارەی كە عمر كردی - ڕەزای خوای لێ بێت -.

* وە هەروەها موعاویە ﷺ داوای دوعاكردنی لە یەزیدی كوڕی ئەسوەدی جورەشی كرد بۆ باران بارین، هەروەك لەو ئەسەرەدا دەردەكەوێت:

قال الحافظ العَلم یعقوب بن سفیان في كتابه((المعرفة والتـاریخ))(٢/٣٨٠-٣٨١): حـدثنا أبو الیمان، قال حدثنا صفوان عن سُلَیم بن عامر الخبائري: أن السماء قحطت، فخـرج معاویـة بن أبي سفیان وأهل دمشق یستسقون، فلما قعد معاویة على المنبر قال: أین یزید بـن الأسـود الجرشي؟ فناداه الناس. فأقبل یتخطى الناس، فأمره معاویة فصعد المنبر فقعد عند رجلیه، فقال معاویة: اللهم إنا نستشفع إلیك الیوم بخیرنا وأفضلنا، اللهم إنا نستشفع إلیك بیزید بن الأسود الجرشي. یا یزید ارفع یدیك إلى الله، فرفع یزید یدیه، ورفع الناس أیدیهم. فمـا كـان أوشـك أن فارقت سحابة في الغرب كأنها ترسٌ، وهبتْ لها ریحٌ، فسقینا حتـى كـاد النـاس أن لا یبلغـوا منازلهم.[1]

كەواتە:

١. ئەگـەر داواكـردن لـە مـردوان شیـرك نەبوایـەو دروسـت بوایـە، ئـەوا عومـەرو هاوەڵانی ﷺ وازیان نەدەهێنا لە پێغەمبەر ﷺ بۆ عباس ﷺ.

٢. وە هەروەها ئەگەر لە خوا داواكردنەكەی عومەر بۆ خاتری زات و شەخسی عبـاس (التوسّل بشخصه) بوایـە، خـۆ خـاتری پێغەمبـەر ﷺ بـەرزترە هـەموو كـاتێـك، كـەوابوو دەبوایە بڵێن بۆ خاتری زات و شەخسی پێغەمبەر ﷺ. كەواتە دەركـەوت كـە داوای لـە

(1) وأخرجه ابن سعد في الطبقات))(٧/٤٤٤) وأبو زرعة في ((تاریخ دمشق))(١/٦٠٢) و إسناده مسلسل بالثقات الكبار، فهو في غایة الصحة.

**خوا نەکرد بۆ خاتری شەخسی عباس، بەڵکو داوای لە خوا کرد بۆ خاتری دوعاو پاڕانەوەی عباس** !!.(توسَّلَ بِدُعائه، و لم يتوسَّلْ بِشَخصِهِ).

**کەواتە لەم حەدیسە ڕاستەدا بۆمان دەرکەوت کە:**

١. (التوسل بدعاء الصالحين في حياتهم الدنيا سنَّة): لەخوا نزیك بوونەوە بەهۆی دوعای پیاوچاکان کارێکی شەرعی و پیرۆزە. واتە داوا لە چاکەکارێك بکەیت دوعای خێر بکات بۆموسڵمانان تا لە ژیاندا مابێت و داوای تۆی پێ بکات.

٢. (التوسل بذوات الصالحين بدعة): لە خوا نزیك بوونەوەو داوا لێکردنی بۆ خاتری زات و شەخسی پێغەمبەران ـ عليهم الصلاة والسلام ـ و پیاوچاکان، بێ شەرعییە، واتە دروست نیە بڵێیت: خوایە بۆ خاتری پێغەمبەر ﷺ ، یان بۆ خاتری پیاوچاکان لێم خۆش بیت و ڕەحمم پێ بکەیت؛ چونکە ئەم شێوە دوعایە نەهاتووە، نە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، وە نە لە هاوەڵانیشیەوە. وە هەر شتێکیش ئەوان نەیان کردبێت، بۆ ئێمە ناشێت بیکەین و لەخۆمانەوە دایبهێنین چونکە (وكل محدثة بدعة) واتە هەموو داهێنراوێك لە عیبادەت و دیندا بیدعەو گومڕاییەو (من عَمِلَ عملاً ليس عليه أمرنا فهو ردٌّ) واتە: هەر کەسێك کردەوەیەك بکات فەرمان و ڕوخسەتی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ڕەت کراوەیەو قەبووڵ نیە.

٣. التوسُّل بطلب الدعاء من الصالحين بعد موتهم، أو في غيابهم شركٌ:

وە دوای مردنی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان، دروست نیە داوای دوعاو پاڕانەوەیان لێ بکەیت جا لە دوورەوە بێت، یان لەسەر گۆڕەکەیانەوە؛ چونکە ئەمە شەریك بۆ خوا دانانە، لەبەر ئەوە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نەیان کردووە، هەرچەندە قەبری پێغەمبەر ﷺ لەهەموو کەسێك لێیانەوە نزیکتر بوو. بۆیە داوایان لە زیندووی صالح دەکرد، هەروەکو داوایان لە عباس کرد دوعایان بۆ بکات. نەك لە مردوی لەم صالح تر.

* * * *

کەواتە هەر کەسێك داوا لە مردوان بکات دوعاو شەفاعەتی بۆ بکەن، ئەوە لە جیاتی ئەوەی بەختەوەر بێت بە دوعاو شەفاعەتیان، بێ بەش دەبێت لە شەفاعەتیان[1] ؛ چونکە

(1) ئیمامی ڕازی لە تەفسیرەکەیدا (٢٥/٢٥٤-٢٥٥) دەڵێت: (( فبطلبكم الشفاعة تفوّتون على أنفسكم الشفاعة )).

شیركی كردووەو پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاكانیش ناتوانن شەفاعەت بۆ هاوبەش پەیداكەران بكەن و، ڕێگای ئەوەیان پێ نادرێت داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بكەن.

هەروەك چۆن نوح ﷺ ڕێگای پێ نەدرا شەفاعەت بۆ كوڕەكەی خۆی بكات و، لێـی قـەبوڵ نەكرا. وە هەروەكو چۆن ئیبراهیم ﷺ نەیتوانی شەفاعەت بۆ باوكی بكـات بـە بـەردەوامی، وە هەروەكو چۆن پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێ نەدرا شەفاعەت بكـات بـۆ مونافیقـان. وە نـەیتوانی شەفاعەتی لە ئاگر ڕزگار بوون بۆ(أبو طالب)ی مامی بكات، كە زۆر چاك بوو بىۆ پێغەمبـەر ﷺ و بانگەوازیەكەی !!.

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ ڕێگای پێ نەدرا شـەفاعەت و داوای لێ خـۆش بـوون بكـات بـۆ دایكی خۆی هەروەك لە (صحیح مسلم)دا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

(استأذنتُ رَبِّي أن أستغفرَ لِأُمّي فلم يأذن لي، واستأذَنْتُهُ أنْ أزورَ قبرها فأذِنَ لي).

واتە: داوام كرد لە پەروەردگار ڕوخسەتم بدات داوای لێ خۆش بوون بكەم بۆ دایكم، كەچـی ڕوخـسەتی نـەدام. بـەڵام داوای ڕوخـسەتی زیـارەتی قەبرەكـەیم كـرد ڕوخـسەتی دام. دوایـی فەرمووی: (فزوروا القبور فإنّها تُذكّر الموت) واتە زیـارەتی گۆڕسـتان بكـەن چـونكە مردنتـان دەخاتەوە یاد !!.

كەواتە: خۆشەویست ترین كەس لای خوا كە (محمد)ە ﷺ ڕێگای پێ نەدرا شەفاعەت بكات بۆ نزیكترین كەس لێی كە دایكی بوو !!. كەواتە كێـی تـر غـەیری پێغەمبـەر ﷺ دەتوانێـت شەفاعەت بكات بۆ هاوبەشی پەیداكەران ؟!!.

❁ ❁

فوائد منتقاه من كتاب :

(**عقيدة الوسيلة والتوسل**):

## التوسل بالنبي ﷺ :

التوسل: التوسل بالمخلوقات لا يجوز قطعا ... وأما التوسل بالنبي ﷺ ففيه معنيان صحيحان ومعنى ثالث غير صحيح.

## أما المعنيان الصحيحان فهما :

١. التوسل بالإيمان به صلى الله عليه وسلم وهذا أصل الإيمان. أي كقولك (أتوسل إليك يا ربي بإيماني بمحمد ﷺ). وهذا التوسل يكون حال حياته ﷺ وبعد وفاته.

٢. التوسل بدعائه وشفاعته ﷺ : كمن يأتي للرسول ﷺ حال حياته ويطلب منه أن يدعو الله له بالغفران أو يستشفع الله له بأن يكشف ضره وكربته ... وهذا التوسل يكون حال حياته ﷺ فقط... لذلك عدل عمر بن الخطاب عن الإستسقاء برسول الله ﷺ بعد وفاته الى الإستسقاء بالعباس. وكذلك استسقى معاوية حين أجدب الناس في الشام بيزيد بن الأسود الجرشي وعدل عن الاستسقاء برسول الله ﷺ ، وكلاهما فعل ذلك بحضرة جمهرة من الصحابة والتابعين وأهل البيت الكرام.

## وأما المعنى الثالث غير الصحيح فهو:

٣-التوسل بذاته ﷺ وأن نسأل الله بذاته ﷺ أو نُقسِمَ على الله بذاتِه ﷺ.. فهذا لم يقل به أحد من الصحابة والتابعين ولا العلماء الأعلام ولا أصحاب المذاهب الأربعة كما سيأتي إن شاء الله.

**

*- قال إمام أهل الاسلام البخاري رحمه الله تعالى في كتاب التوحيد من صحيحه قال: (باب السؤال باسماء الله تعالى والاستعاذه بها)، ومقصوده بذلك أنها غير مخلوقة فإنه لا يُستعاذ بمخلوق ولا يُسأل به .

*****

*- يقول الشعراني (( ولو أنّ احداً من الخلق كان يكفي ان نستعيذ به لأمرنا الله ان نستعيذ بمحمد ﷺ وجبريل أو غيرهما من الأكابر، ولكن علم الله عجز الخلق عن ردّ كيده الاّ مع استعاذتهم بالله عز وجل)). لطائف المنن ٥٨٣ .

* قال الشيخ ابو الطيب شمس الحق العظيم آبادي في (التعليق المغني على سنن الدارقطني)ص٥٢٠ - ٥٢١:

(( ومن أقبح المنكرات وأكبر البدعات وأعظم المحدثات ما اعتاده اهل البدع من ذكر الشيخ عبد القادر الجيلاني رحمه الله تعالى بقولهم: يا شيخ عبد القادر الجيلاني شيئاً لله. والصلوات المنكوسة الى بغداد، وغير ذلك مما لا يُعَدُّ، هؤلاء عبدة غير الله ما قدروا الله حق قدره و لم يعلم هؤلاء السفهاء أن الشيخ رحمه الله لا يقدر على جلب نفع لأحد ولا دفع ضرر عنه مقدار ذرة ، فلِمَ يستغيثون به و لِمَ يطلبون الحوائج منه؟ أليس الله بكافٍ عبده؟ اللهم إنّا نعوذُ بك من أن نشرك بك أو نعظم احداً من خلقك كتعظيمك).

***

## قياس التوسل على التبرك لايجوز

* قالوا إذا جاز التبرك بآثار النبي ﷺ فانه يجوز التوسل بها الى الله ومِن ثَمَّ يجوز التوسل بذاته ﷺ .

الرد عليهم: التبرك بآثار النبي ﷺ امرٌ مشروع حدث في زمانه ﷺ من الصحابة و لم ينكره عليهم وحدث بعد وفاته ﷺ بآثاره وثيابه وشعره وفضل وضوئه ... ولكن هو مشروط بشرطين :

الأول : أن يكون المتبرّكُ مؤمناً بالله ورسوله .

الثاني : أن يكون الأثر حقيقة هو للنبي ﷺ... فمن جاء بشعرة وقال هذه للنبي ﷺ نطالبه بأن يثبت لنا انها له ﷺ فاذا حصل الشك لا يجوز التبرك بها . إذا قلنا ذلك ... هل معنى ذلك أنه يجوز أن يقول الانسان ويتوسل الى الله ويقول (( أسألك اللهم ببصاق النبي ﷺ أن ترحمنا )) أو غير ذلك ... فهذا لم يقله أحدٌ من الأئمة المتقدمين والمتأخرين فضلاً أنه لم يأت دليل صحيح على ذلك . فبطل قولهم .

* **حديث الاعمى**: عن عثمان بن حنيف رضى الله عنه ( أن رجلاً ضرير البصر أتى النبي ﷺ فقال: ادعُ الله ان يعافيني قال: ان شئت دعوتُ لك وان شئت أخرتُ ذاك فهو خير (وفي رواية: وإن شئت صبرت فهو خير لك) فقال: ادعه. فأمره ان يتوضأ فيحسن وضوءه فيصلي ركعتين ويدعو بهذا الدعاء: اللهم إني اسألك وأتوجه إليك بنبيك محمد نبي الرحمة، يا محمد إني توجهت بك إلى ربي في حاجتي هذه فتقضى لي ، اللهم فشفعه فيَّ وشفعني فيه، قال : ففعل الرجل فبرأ )[1].

---

(1) أخرجه احمد في المسند (١٣٨/٤ ) واللفظ له ورواه الترمذي ( ٢٨١/٤-٢٨٢ بشرح التحفة ) ( وابن ماجة ٤١٨/١) والطبراني في الكبير (٢/٢/٣ ) والحاكم ٣١٣/١ وقال الترمذي ( حسن صحيح غريب) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي ((قلت : ولكن هذا مرفوع بأنّ الصواب أنّه الخطمي نفسه )).

عن ابي امامة بن سهل بن حنيف عن عمه عثمان بن حنيف ( ان رجلاً كان يختلف الى عثمان بن عفان رضي الله عنه في حاجة له، فكان عثمان لا يلتفت اليه ولا ينظر في حاجته فلقي عثمان بن حنيف فشكا ذلك اليه ، فقال له عثمان : ائت الميضأة، فتوضأ ثم أئت المسجد فصل فيه ركعتين ثم قل : اللهم اني اسألك واتوجه اليك بنبينا محمد ﷺ نبي الرحمة يا محمد إني اتوجه بك الى ربك عز وجل فتقضي حاجتي وتذكر حاجتك ورح اليّ حتى أروح معك ، فانطلق الرجل فصنع ما قال ثم أتى باب عثمان رضى الله عنه فجاء البواب حتى أخذ بيده فأدخله عليه فاجلسه معه على الطنفسة وقال حاجتك ؟ فذكر فقضاها له) ....

الرد عليه: هذا الحديث مختلف فيه بين مصحِّح له وبين مُضَعِّف. والمصححون اكثر وقد أعل الحديث وضعفه صاحب (صيانة الانسان) وصاحب (تطهيرالجنان) ص٣٧ وغيرهما لأن في اسناده أبا جعفر الرازي قال الترمذي: لا نعرفه إلا من هذا الوجه من حديث ابي جعفر وليس الخطمي[1]، فقالوا هو اذن الرازي وهو صدوق سيء الحفظ. وقد صححه غيرهم من العلماء. والحديث لا حجة فيه للمتوسلين بالذوات، بل هو دليل آخر على التوسل بدعاء الاحياء من باب التوسل المشروع بدعائه ﷺ والادلة على ذلك من الحديث نفسه : -

١- أن الأعمى جاء إلى رسول الله ﷺ ليدعو له وذلك بقوله ( ادع الله أن يعافيني ). ولو كان قصد الاعمى التوسل بذات رسول الله ﷺ أو جاهه لكان له ان يجلس في بيته او في أي مكان ويسأل الله بذاته وجاهه ﷺ ولكنه لم يفعل ذلك لانه عربي يفهم معنى التوسل في لغة العرب حق الفهم ويعرف انه ليس كلمةً يقولها صاحب الحاجة يذكر فيها اسم المتوسَّل به؛ بل لا بد أن يشتمل على المجئ الى من يعتقد انه الأصلح ويطلب الدعاء منه. هذا هو معنى التوسل الصحيح وهو طلب الدعاء من الصالح الحي أن يدعو له.

٢- أنّ النبي ﷺ وعده بالدعاء مع تبيان الافضل له وهو قوله:(إن شئت دعوتُ وان شئت صبرتَ فهو خير لك).

٣- اصرار الأعمى على ان يدعو له رسول الله ﷺ بقوله ( فادع ) فهذا يقتضي ان الرسول ﷺ دعا له . ثم ان الرسول ﷺ وَجَهَّهُ الى النوع الثاني من التوسل وهو التوسل بالعمل الصالح فأمره ان يتوضأ ويصلي ركعتين ثم يدعو لنفسه وهذا هو من ابتغاء الوسيلة الى الله بالعمل الصالح .

(1) يقول الالباني في كتاب التوسل ص ٧٦ الحاشية .

٤- ورد بنص الحديث قوله (( اللهم فَشَفِّعْهُ فيَّ)) . وهذا من المستحيل حمل هذه اللفظة على التوسل بذاته ﷺ او جاهه او حقه اذ المعنى : اللهم اقبل شفاعته ... أي اقبل دعائه في ان تــردّ علـــي بـــصري، فالشفاعة: لغةً الدعاء.

قال في لسان العرب: ( الشفاعة كلام الشفيع للملك في حاجة يسألها لغيره، والشافع الطالب لغيره يُتشفع به الى المطلوب، يقال تشفعت بفلان الى فلان فشفعني فيه). وهكذا يثبت انّ توسل الاعمى كان بدعائه ﷺ لا بذاته.

٥- فهمنا من الحديث شفاعته ﷺ للاعمى ... ولكن نسأل المتوسلين بالذوات ما معنى ما جاء في الحديث ( فشفعني فيه) وكيف ستكون شفاعة الأعمى في الرسول ﷺ ؟. معناها هنا أي اقبل شفاعتي أي دعائي في ان تقبل دعاء رسول الله ﷺ في ان ترد الي بصري .

٦- انّ هذا الحديث ذكره العلماء في معجزاته ﷺ ودعائه المستجاب . فانه بدعائه ﷺ لهذا الاعمى اعاد الله بصره ولذلك رواه المصنفون في ( دلائل النبوة ) كالبيهقي وغيره ... والسرّ هنا في شفاء الاعمى دعاؤه ﷺ ... ولو كان السرّ بشفاء الاعمى التوسل بالجاه او بالذات كما فهمه بعض المتأخرين لكان من المفروض ان يحصل الشفاء لكل اعمى يتوسل بالذات او الجاه بعد وفاة الرسول ﷺ وإلى يوم القيامة.

٧- إذاً يتبين مما سبق أن توسل الاعمى انما كان بدعائه ﷺ ففي قوله (( اللهم اني اسألك واتوسل اليك بنبيك محمد ﷺ ... )) . أي بدعاء نبيك ... وهو على حذف المضاف وهذا أمرٌ عُرف في اللغة العربية كما في قوله تعالى { واسأل القرية التي كنا فيها والعير التي اقبلنا فيها } أي اسأل أهل القرية واسأل اصحاب العير. فنحن وهم متفقون انّ التقدير هنا على حذف المضاف. ولكن ما هو المضاف؟ .

فعندهم ( نبيك ) أي ( بذات نبيك ) أو ( جاه نبيك ). وعندنا ( بنبيك ) أي ( بدعاء نبيك ). ولا بد من ترجيح احد التقديرين .. فهنا لا بد من سوق الادلة على ترجيح احد التقديرين ... ونحن نطالبهم بدليل واحد على انّ الباء في ( بنبيك ) تقديرها ( بذات نبيك او جاه نبيك ) نطالبهم بدليل واحد من القرآن والسنة الصحيحة وفعل الصحابة وجمهور السلف الصالح وجمهور العلماء الاعلام اصحاب المذاهب .

٨- أما تقديرنا ( بدعاء نبيك ) فقد دلت عليه كل الادلة السابقة التي قدمناها في اول البحث من القرآن الكريم والسنة وفعل الصحابة كعمر بن الخطاب ومعاوية بن ابي سفيان وبأقرار الصحابة في زمانهم والتابعين .

٩- ولو كان الحديث يدل على التوسل بالذات ... فما معنى وجود (( اللهم فشفعه فيّ وشفعني فيه )). وهذا لا يجوز ابداً والا سيكون الحديث يعارض بعضه بعضاً ... ففهم اذن ان التوسل في الحديث هنا التوسل بدعائه ﷺ لا بذاته .

١٠- قصة الرجل مع عثمان بن عفان التي ذكرت بعد حديث الأعمى . هذه القصة فيها عدة علل.

أ- رواها ابن وهب عن شبيب بن سعيد الحبطي ابو سعيد البصري التميمي ومثل هذه الرواية يقول عنها ابن عدي في كتابه المسمى (( بالكامل في اسماء الرجال )) والذي لم يصنف في فنه مثله يقول : ابن وهب حدث عن شبيب بالمناكير. فإذن هذه الرواية منكرة. ويقول الطبراني هذه الزيادة تفرد بها شبيب بن سعيد. وشبيب هذا مُتكلَّمٌ فيه وخاصة في رواية ابن وهب عنه ... والزيادة هنا كذلك برواية ابن وهب عنه .

ب- اهل السنن كالطبراني والنسائي وابن ماحة وابو داود اعرضوا عن هذه الزيادة.

ج- اضطراب لفظها.

وبمثل هذه العلل تسقط الرواية . ثم هل يعقل ان يرفض عثمان ابن عفان وهو مَن هو ... يرفض ان ينظر في حاجة مسلم ولا يلتفت اليه ... فكيف يتفق هذا مع ما عرف بالنص الصحيح ان عثمان من شدة حيائه تستحي منه الملائكة ومع ما عرف عنه من رِفِقه بالناس وبِرّه بهم ولينه معهم .... وهذا كله مما يستبعد صحة هذه الزيادة .

د- ومن تخبط المتوسلين بالذوات ... انّ هذه الزيادة التي يسوقونها دليل على التوسل بالذات انما تُساق كدليل ضدهم بانّ حديث الاعمى انما كان توسله بالدعاء لا بالذات . بدليل انّ عثمان بن حنيف حين علّم الرجل الذي لا يلتفت اليه عثمان بن عفان الدعاء ... لم يقل له وهو يعلمه الدعاء قل ( اللهم فشفعه فيّ وشفعني فيه ) لانه فهم بسليقته العربية انّ هذا القول يستلزم وجوده ﷺ حياً اذا من المعلوم لغةً وعقلاً ... انك اذا قلت بعد وفاته ﷺ : ( اللهم فشفعه فيّ وشفعني فيه ) يصبح كلاماً غير مستقيم في سياق هذا الدعاء لذلك ثبت ان الاعمى انما توسل بدعائه ﷺ لا بذاته ... اذ لو كان بذاته لكان الاعمى في زمن عثمان ذكر نفس النص الاول . وقال (( اللهم فشفعه فيّ وشفعني فيه )) ولكنه لم يقلها .

لأن صاحب الشفاعة ﷺ قد مات .

**-** ونريد ان نردَّ هاهنا على فِرية : نحن أهل السنة والجماعة حينما نقول بمنع التوسل بالذات والجاه ... ليس معناه أننا ننكر فضله ﷺ أو فضل الانبياء والصالحين او نقول بانهم ليسوا وجهاء عند الله ، حاشا لله ذلك .... ولكننا كمسلمين يجب ان ننضبط بالدليل فما قام به الدليل الصحيح أخذنا به .**

**وأما ما قام به دليل ضعيف وفيه من دَخن العقول والاهواء او تفسير للدليل ليس بالقوي فنحن لسنا مجبورين على الاخذ به .** قال تعالى { قل ان كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم}آل عمران : ٣١. فعلامة الحب الصادق لرسول الله ﷺ هو اتباعه بما يأمر من اعتقاد وقول وعمل

انظر إلى هذا الحديث الصحيح عن عبد الرحمن بن ابي قراد رضي الله عنه انّ النبي ﷺ توضأ يوماً فجعل اصحابه يتمسحون بوَضوئه ، فقال لهم النبي ﷺ (( ما يحملكم على هذا )) قالوا حب الله ورسوله . فقال النبي ﷺ : (( **مَن سرّه أن يحب الله ورسوله ، أو يحبه الله ورسوله فليصدق حديثه اذا حدّث وليؤد أمانته اذا اؤتمن وليحسن جوار من جاوره** )) .

وهو حديث ثابت له طرق وشواهد في معجمي الطبراني وغيرهما وقد اشار المنذري في الترغيب ٢٦/٣ الى تحسينه وفي (الصحيحة ) رقم ( ٢٩٩٨ ) .

**-* يقول المتوسلون بالذات ... لو كان معنى الباء في قولنا (( اسألك بنبيك )) بدعاء نبيك ... لماذا لا نقول بحلها (اسألك بدعاء نبيك ) .**

نجيبهم بقولنا أن النبي ﷺ هو الذي علمنا عنه هذه الاضافة حين قال: (( انما ينصر الله هذه الامة بضعيفها : بدعوتهم وصلاتهم واخلاصهم )) رواه البخاري (٢٨٩٦ ) والنسائي(٤٨/٦). ففهم بانّ الباء من قوله ( بضعيفها ) معناها الدعاء والصلاة والاخلاص لله تعالى ... وليس معناها انصر هذه الامة بذوات ضعفاء الامّة فهل لهم من حجة بعد ذلك يحتجون بها . وعلى فرض صحة الزيادة في حديث الاعمى زمن عثمان بن عفان .... نقول لو صح انّ الصحابي عثمان بن حنيف علّم الرجل الذي لا يلتفت اليه عثمان بن عفان ذلك الدعاء وبتلك الصيغة .. فهذا يعتبر من فعل آحاد الصحابة الذي اذا خالفه جمهور الصحابة والادلة .. فيعتبر من باب الاجتهاد الخاطئ للصحابي ... وقد ثبت ان جمهور الصحابة لم يفعلوا ذلك و لم يرد عنهم أي قول في ذلك . وكل الأدلة تشير لخلاف فعله ... فهنا لو صحت هذه الزيادة ( وهي غير صحيحة) .. فهو من فعل آحاد الصحابة .... .

**وللأمانة العلمية لا بّد أن نذكر نص ما قاله الشيخ الالباني في كتاب التوسل وأنواعه بحوث جمعها محمد عيد عباس المكتب الاسلامي الطبعة الرابعة ص ٨٣ :**

(( على أنني اقول : لو صحّ انّ الاعمى انما توسل بذاته ﷺ فيكون حكماً خاصاً به صلى الله عليه وسلم ، لا يُشاركه فيه غيره من الانبياء والصالحين والحاقهم به مما لا يقبله النظر الصحيح، لانه صلى الله عليه وسلم سيدهم وأفضلهم جميعاً، أن يكون مما خصّه الله به عليهم لكثير مما صح به الخبر وباب الخصوصيات لا تدخل فيه القياسات، فمن راى ان توسل الاعمى كان بذاته (ﷺ) لله ، فعليه ان يقف عنده، ولا يزيد عليه كما نُقِل عن الامام احمد والشيخ العز بن عبد السلام رحمهما الله تعالى، هذا هو الذي ينقضه البحث العلمي مع الانصاف والله الموفق للصواب )) .

**ولا بدّ من تسجيل ما قاله شيخ الاسلام ابن تيمية بعدم تكفير المتوسل بذات النبي صلى الله عليه وسلم اذ يقول:** (( ومن لم يقل احدٌ : إن من قال بالقول الاول فقد كفر ولا وجه لتكفيره ، فانّ هذه مسائلة خفية ليست أدلتها جلية ظاهرة ، والكفر انما يكون بانكار ما علم من الدين بالضرورة ، او بانكار الاحكام المتواترة والمجمع عليها ذلك . بل المكفر بمثل هذه الامور يستحق من غليظ العقوبة والتعزير ما يستحقه امثاله من المفترين على الدين لا سيما مع قول النبي ﷺ ((أيــما رجل قال لاخيه : يا كافر فقد باء احدهما )) ذكر ذلك في مجموع فتاوى ابن تيمية ١٠٦/١

نقول: وإن كان الامام احمد والعز بن عبد السلام يتوسلون بذاته صلى عليه وسلم لا بذات غيره من الانبياء والصالحين .... فإننا ندور مع الدليل حيث دار وحجتنا هي الدليل ونحن نشهد للامامين الجليلين بالفضل والكرامة لكنّا نقول ان آحاد الصحابة اذا قال راياً يخالفه جمهورهم وكان الدليل أقوى من قوله ... فنأخذ برأي الجمهور الذي يدعمه الدليل . وهذه القاعدة تنطبق من باب الأولى على سائر العلماء ... ومنها مسألة التوسل بذات النبي صلى الله عليه وسلم... وهذه قاعدة أصولية عظيمة يقرّها العلماء .

وأخيراً ... ننهي موضوع نشرتنا هذا بهذا الحديث النبوي : عن جبير بن مُطعم، قال: جاء اعرابي الى النبي ﷺ فقال يا رسول الله نُهكت الانفس وجاع العيال وهلكت الاموال فاستسقِ لنا ربك ، فإنا نستشفع بالله عليك وبكَ على الله . فقال النبي ﷺ (سبحان الله ، سبحان الله ) فما زال يُسبِّحُ حتى عُرِف ذلك في وجوه الصحابة.ثم قال **((ويحك،أتدري مالله؟ إن شأن الله أعظيم من ذلك انه لا يُستشفع بالله على أحد))**[1] .

---

(1) رواه ابو داوود في السنن ( ٤٧٢٦) واخرجه البخاري في التأريخ الكبير ( ٢٢٤/٢وصححه ابن القيم في ( تهذيب السنن ٧/ ٩٥ ).

## شوبهەی یانزەهەم

# ﴿ واسیتە دانان ﴾ ﴿ الواسـطـة ﴾

دەڵێن هەروەك لە دونیادا خەڵكی پێویستی بە واسیتە هەیە لە نێوان خۆیان و دەسەڵات دارو کاربەدەستان، بەهەمان شێوەش بۆلای خوا پێویستمان بە واسیتە هەیەو ئێمە داوا لەم واسیتانە دەکەین کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکانن ﴿ دوای مردنیان ﴾ و ئەوانیش داوا لە خوا دەکەن هیدایەتمان بدات و ڕزق و بەختەوەریمان پێ ببەخشێت و ناڕەحەتی و زەرەرو ناخۆشیمان لەسەر لابات و سەرمان خات؛ چونکە ئەم واسیتانە لە خوا نزیکن و وا جوانترە ئێمە ڕاستەوخۆ داوا لە خوا نەکەین و داوایەکەمان لە ڕێگای واسیتەکانەوە بێت؛ چونکە داوای ئەوان بۆ ئێمە باشترە لە داوای ڕاستەوخۆی خۆمان.

## هەڵوەشاندنەوەی ئەم شوبهەیە

لە وەڵامی ئەم بۆچوونە هەڵەیەدا دەڵێین: ئەم جۆرە بیروباوەڕو بۆچوونە سەرچاوەکەی زۆر تاوانێکی گەورەیە چونکە لەوەوە سەری هەڵداوە کە تەشبیهی خوای پەروەردگار کراوە بە دەسەڵات دارێکی دروست کراو. واتە خوای پەروەردگار چوێنراوە (شُبِّهَ) بە بەندەی دروستکراو. وە ئەم وێچواندن و تەشبیەکردنەش:

لەلایەکەوە شیرك بڕیاردانە بۆ خواو، هاوشێوەو هاوەڵ دانانە بۆ پەروەردگار ؛ کە وەك کاربەدەستێك بڕوامان پێی بێت، واتە چۆن پێویستیمان بە واسیتە هەیە بۆلای کاربەدەستێکی (زاڵم) یان (بێ ئاگا) یان (بێ دەسەڵات)، بەهەمان شێوەش وابزانرێت پێویست بە واسیتە دەکات بۆلای خوای (عادڵ) (بە ئاگای) (بە دەسەڵات).

وە لەلایەکی تریشەوە دابەزاندنی ڕێزو قەدرو گەورەیی خوایە کە (تەشبیه) بکرێت بە کاربەدەستێك) لەوەدا کە پێویست بە واسیتە بکرێت بۆلای و بەبێ واسیتە وەڵامان نەداتەوەو یارمەتیمان نەدات ، وە بە هۆی واسیتە بتوانرێت کاریگەری لەسەر بکرێت و واسیتەکە تەنسیری لێ بکات !!. سبحان الله پەروەردگار زۆر پاك و بەرزترە لەم جۆرە باوەڕو بۆچوونەی نەفامان.

وە ئەگەر ورد بینەوە بۆ ئەوەی بزانین بۆچی لە دونیادا خەڵکی پێویستی بە واسیتە دەکات بۆلای کاربەدەستان، ئەو کاتە بۆمان دەردەکەوێت کە پەروەردگار وەك کاربەدەستان نیەو، بەهیچ شێوەیك دروست نیە واسیتەی بۆ دابنرێت. چونکە سیفاتی پەروەردگار زۆر بەرزترە لە سیفاتی بەندەی کاربەدەست.

## هۆی یەکەمی پێویست بە واسیتە کردن بۆ لای کار بەدەستان

بۆ نمونە خەڵکی پێویستیان بەواسیتە هەیە بۆلای کاربەدەستێکی زاڵم، چونکە بەهۆی واسیتە نەبێت ئەم کاربەدەستە زاڵمە کاری خەڵکەکە ناکات و بەزەیی پێیاندا نایەتەوەو بە عەدالەت حوکم ناکات. جا لەبەرئەوە خەڵکی ناچاردەبن و پێویستیان دەبێت کە واسیتەیەکی نزیك لە حاکمی زاڵم پەیدا بکەن، بۆ ئەوەی تەئسیر لە حاکم بکات و حەقی خۆیانی پێ داوا بکەن.

کەواتە لەبەر زوڵمی حاکم و ناعەدالیێتی و نەبوونی بەزەیی و ڕەحم، خەڵکی پێویستیان بە واسیتە کرد. بەڵام ئەگەر بێت و حاکمەکە عادل و بەبەزەیی و حەق ویست بێت و لوت بەرز نەبێت ئەوا هەموو هەژارێك و بێ دەسەڵاتێك دەتوانێت بە ئاسانی بگاتە لای حاکم و داوای مافی خۆی لێ بکات. هەروەکو چۆن خەڵکی بۆ خۆیان بەبێ واسیتە دەچوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای خۆیانیان لا باس دەکرد بێ واسیتەو بێ جیاوازی لەنێوان موسڵمانان و ناموسڵمانان !! هەموویان بە ئاسان دەگەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ ڕاستەوخۆ دەدوان لەگەڵیدا.

وە هەروەها لە دوای ئەویش هەر چوار خەلیفەکان ـ ڕەزای خوایان لێ بێت ـ وە خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش - ڕەحمەتی خوای لێ بێت- خەڵکی ڕاستەوخۆو بێ واسیتە داخوازی خۆیانیان لاباس دەکردن بێ جیاوازی لەنێوان دوورو نزیك و خزم و بێگانە و هەژارو دەوڵەمەندو موسڵمانو کافرا!؛ چونکە ئەوانیش لەسەر سوننەتی ئەو پێشەوایە ﷺ دادپەروەرە بەبەزەییە (متواضع)ـە دەڕۆیشتن ،

کەواتە ئەگەر کاربەدەست عادل و بەویژدان بوو خەڵکی پێویستی بە واسیتە ناکات، ئەدی چۆن پێویستیان بە واسیتە دەکات بۆلای پەروەردگار کە لەهەموو کەس بەبەزەیی ترو دادپەروەرترو حەق ویست ترەو (أرحم الراحمين) و (أعدل العادلين)ـە !!. وە تۆسقاڵێکیش زوڵم

ناکات و ستەم لەکەس ناکات ﴿ولا یظلم ربك أحداً﴾ وە هەروەها هەرکەسێك تۆسقاڵێك مافی هەبێت پەروەردگار پاداشتی دەداتەوە ﴿ فمن یعمل مثقال ذرة خیراً یره ﴾.

وەهەروەها حەق لە ئاژەڵی شاخ دار (قۆچ دار ـ قرناء) دەستێنێتەوە بۆ بێ شاخ. وە مافی کەس پێشێل ناکات و وەڵامی هەموو کەس و هەموو ستەم لێ کراوو هەژارێك دەداتەوە؛ کافر بێت یان موسڵمان. وەك دەفەرموێت:

﴿ أمّن یُجیبُ المُضطرَّ إذا دعاهُ ویکشفُ السوءَ ویجعلکم خلفاءَ الأرضِ ءإلهٌ مع الله ؟ قلیلاً ما تذکّرون﴾ النمل ٦٢.

واتە: کێ وەڵامی لێ قەوماو دەداتەوە ئەگەر هاواری بگاتێ، وە ناڕەحەتی لەسەر لادەبات ؟! ئایا لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوی تر هەیە هاواری بکرێتێ و وەڵامی لێ قەوماوان بداتەوە ؟! بێگومان تەنها (الله) بە فریامان دێت.

وە پەروەردگار وەکو حاکمە زاڵمەکان نیە، حەز نەکات داوای حەقی لێ بکرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر حەز دەکات داوای لێ بکرێت و ڕاستەوخۆ بێ واسیتە هاواری بکرێتێ لە خۆشی و ناخۆشیدا. وە توڕە دەبێت لەوانەی داوای لێ ناکەن و هانای بۆ نابەن. وەك لەم ئایەت و حەدیسانەدا دەردەکەوێت:

[ وقال ربکم آدعوني أستجب لکم إنّ الذین یستکبرون عن عبادتي سیدخلون جهنّم داخرین] الغافر ٦٠.

واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی داوام لێ بکەن ڕاستەوخۆ بێ واسیتەو هاوارم بکەنێ وەڵامتان دەدەمەوە. وە ئەوانەی خۆیان بە زل دەزانن لە ئاستی پاڕانەوەو داواکردن لە من، و خۆیان بێ پێویست دەزانن ئەوانە دەچنە ناو دۆزەخ بە حاڵەتی تێداماوەیی.

* وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((إنّه مَنْ لم یسألِ الله یَغْضَبْ علیه))[1].

واتە ئەوەی داوا لە پەروەردگار نەکات لێی توڕە دەبێت.

* وە بەڕێزترین شت لای پەروەردگار لێ پاڕانەوەیەتی: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((لیس شيءٌ أکرم علی الله من الدعاء))[2].

* وە لە حەدیسێکدا دەفەرموێت:

---

(١) صحیح سنن الترمذي .

(٢) صحیح التر مذی وابن ماجة .

((إنَّ الله حَيِيٌّ كريم، يستحي من عبده أنْ يبسُطَ إليه يديه ثم يَرُدّهما خائبتين))[٣].

واتە: پەروەردگار ئەوەندە بەڕێزو خاوەن حەیایە، شەرم دەكات لە بەندەی خۆی كە دەستی پاڕانەوەی بۆلا ڕابكێشێت و ئەویش ڕەتی بكاتەوە بە بێ ئومێدی و دڵ شكاوی.

* وە هەر كەسێك داوای شتێك لە پەروەردگار بكات پەروەردگار بەشێوەیەك لەم سێ شێوەیە پاداشتی دەداتەوە:

١ ـ یان داواكاریەكەی بۆ بەجێ دەگەیەنێت.

٢ ـ یان بۆی دەكا بە خێرو پاداشت بۆ ڕۆژی دوایی.

٣ ـ وە یان بە ئەندازەی ئەو داواكاریەی شەڕو خراپەو زیانی لەسەر لادەبات ئەگەر داواكاریەكەیشی بۆ جێ بەجێ نەكات لەبەر حیكمەت و مەصڵەحەتێك. وەك لەم حەدیسەدا هاتووە:

((ما من مسلمٍ يدعو الله بدعوةٍ ليس فيها إثمٌ ولا قطيعةُ رحمٍ إلاَّ أعطاهُ الله بها ثلاثَ خصالٍ: إمّا أن يُعجِّل له دعوته، وإمّا أن يَدَّخِرَها له في الآخرة، وإمّا أن يصرفَ عنه من السوء مثلها، قالوا: إذاً نُكثرُ، قال: اللهُ أكثر))[٤].

كەواتە پەروەردگاری بەبەزەیی نابێت بشوبهێنرێت بە بەندەی بێ ڕەحمی زاڵم، وە پێویستی بوون بە واسیتە بۆلای دەسەڵاتداری زاڵم نابێت وامان لێ بكات گومانی خراپ بەرین بە پەروەردگار، كە ئەویش بێ واسیتە وەڵامان ناداتەوە؛ چونكە ئەم گومان بردنە بە پەروەردگار زۆر گوناهێكی گەورەیە؛ وە كەم كردنەوەی قەدر گەورەیی و عەدالەت و بەزەیی خوایە، وە دابەزاندنیەتی بۆ ڕیزی كاربەدەستە ستەمكارەكان كەبێ واسیتە وەڵامی كەس نادەنەوە.

وە هەروەها نابێت وا گومان بەرین كە هەروەكو چۆن واسیتەی دونیایی تەئسیر لە كاربەدەستان دەكات لەو شتەشدا كە كاربەدەستان حەزی پێ نەكەن، بەهەمان شێوەش واسیتە تەئسیر لە خوا دەكات لەوەدا كە خۆی نەیەوێت. بۆ نموونە ئەگەر كاربەدەستێك حەز نەكات كاری فلان كەس جێ بەجێ بێت لەبەر چەند هۆیەك، ئەوا ئەو فلانە كەسە ئەگەر واسیتەی زۆر نزیك لە كاربەدەستەكە پەیدا بكات دەتوانێت كاری خۆی پێ جێ بەجێ بكات و

(٣) صحيح سنن الترمذي ( ٣ / ١٧٩ ) .

(٤) رواه الحاكم وصححه (١ / ٦٧٠)، والبخاري في (الأدب المفرد) .

کاربەدەستەکەش ناچار بڕیاری لەسەر بدات بە نابەدڵی بێ ئەوەی حەزیشی لەو بڕیارە بێت، جا یان لەشەرمی واسیتەکە بڕیاری بۆ دا، وە یان لە ترسان، وەیان لەبەر مەصلەحەتێکی داهاتووی خۆی!. چونکە ئەگەر قسەی واسیتەکان بشکێنێت ئەوا لێی هەڵدەگەڕێنەوەو زەرەری لێ دەدەن، یان جارێکی تر پشتیوانی و هاوکاری و لایەنگری ناکەن. کەواتە واسیتەی دونیا تەئسیر لە کاربەدەستان دەکات.

بەڵام ئەگەر پەروەردگار حەز نەکات شتێك ببێت ئەوا کەس ناتوانێت پێی بکات و تەئسیری تێ بکات.

بۆ نموونە پەروەردگار نەیویست لە موشریك و مونافیقان خۆش بێت، بۆیە بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاند کە تکای لێ نەکات و داوای لێ خۆش بوونیان بۆ نەکات چونکە داوا بکات یان نەیکات، خوا لێیان خۆش نابێت ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکات. وەك فەرمووی:

﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ﴾ التوبة: ٨٠ .

﴿سَوَاء عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾ المنافقون: ٦ .

وە پەروەردگار چ شتێکی حەز لێ بێت هەر ئەوە دەبێت و چی نەویت بە هەموو بوونەوەریش ناتوانرێت پێی بکرێت: (ماشاء الله کان ومالم یشأ لم یکن) .

وە کەس ناتوانێت ڕەخنە بگرێت لە بڕیارەکانی و پاشکۆی حوکمەکانی بکات و پێیاندا بچێتەوە: ﴿ والله يحكمُ لا مُعقّبَ لِحُكمه ﴾ الرعد: ٤١.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿ فإنّه لا مُكْرِهَ له ﴾[١]. واتە پەروەردگار زۆرلێکەری نیە. وە هیچ کەسێك ناتوانێت بێ ڕوخسەتی ئەو داوای تکا کردنیش بکات:

﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ البقرة: ٢٥٦.

واتە کێیە ئەوەی شەفاعەت بکات لەلای خوا، مەگەر بە ڕێ پێدانی ئەو نەبێت؟!.

کەواتە لە دونیادا واسیتە پەیدا کردن بۆ شەفاعەت کردن لای دەسەڵاتداران سوودی هەیەو تەئسیری خۆی هەیەو دەسەڵاتداران ناتوانن تکای تکاکاران بشکێنن هەموو کاتێك چونکە

---

(١) صحيح البخاري .

پێویستیان بەم تكاكارانە هەیەو پاڵپشت و یارمەتی دەریانن یان شەریك و هاوبەشیانن یان جێگای مەترسیە ڕەت كردنەوەی شەفاعەتیان ئەگەر شەفاعەتكارو واسیتەكە ژن و منداڵی خۆشیان بن !! واتە ئەوانیش تەئسیریان هەیە لەسەر كاربەدەستان.

بەڵام پەروەردگار نەخێزانی هەیە نە منداڵ، نە وەزیرو، نە هاوكار، نە شەریك و، نە پشتیوانكار، نە بەرامبەرو، نە پێشنیاركار، وەكو خۆی دەفەرموێت:

﴿ قُل ادعوا الذين زعمتم[1] من دون الله: ❶ لا يملكون مثقال ذرة في السماوات ولا في الأرض.

❷وما لهم فيهما من شرك ❸وما له منهم من ظهير ❹ ولا تنفع الشفاعة عنده إلا لمن أذن له ﴾السبأ ٢٢، ٢٣.

واتە ئەی محمد ﷺ بەو موشریكانە بفەرموو: ئادەی هاوار بكەنە ئەوانەی كە وا گومان دەبەن شەفاعەتكارتان بن و ئیعتیقادی سوودو زیان و خۆشی و ناخۆشیتان پێیانە غەیری خوا، بزانن ئایا:

❶ هیچیان بە دەستە بۆ خۆشیان و بۆئێوەش ؟! لە كاتێكدا كە ئەوان ئەندازەی زەڕڕەیەكیان لە ئاسمانەكان و زەوی بە دەست نیەو خاوەنی نین، وە لەوەش كەم تر:

❷ بە شەراكەتیش لەگەڵ خوا هاوبەشی نین لە ئاسمانەكان و زەویدا، وەلەوەش كەمتر:

❸ تەنانەت یارمەتیدەرو یاریدەدەریش نین بۆ خوا، تا یارمەتیان لێ وەربگرێت و پێویستی پێیان بێت.

كەواتە: نە خاوەنی هیچ شتێكن بەتەنها لەم زەوی و ئاسمانانەدا. وە نە بە شەراكەتیش شەریكی خوان لە هیچ بەشێكی ئاسمانەكان و زەویدا. وەنە جێگرو وەزیرو یاریدەدەری پەروەردگاریشن لەم بوونەوەرەدا. كەواتە بەهیچ شێوەیەك هیچ شتێكیان بە دەست نیە لەگەڵ خوا یان بەبێ خوا، تەنها شەفاعەت كردن نەبێت لای خوا.

❹ وە شەفاعەت كردنەكەش نابێت تەنها دوای ئیزنی خوا، ئەویش بۆ كەسێكە كە خوا ڕوخسەتی بۆ بدات و ڕێگەی پێ بدات ئەگینا سوودی نابێت و ناكرێت!!

بەڵام لە دونیادا واسیتەكان شەفاعەت دەكەن لای كاربەدەستان بەبێ ڕوخسەتی كاربەدەستانیش وە بۆ كەسانێكیش كە كار بەدەستان حەزیان پێ نەكەن.[2]

---

(1) زعمتم أنهم آلهة أو أنهم شفعاء .

(2) وە زانای پایە بەرز إبن قيم الجوزية ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمویەتی:

**بەڵام پەروەردگار زۆر زۆر لەوە گەورەترە کە کەس بێ ئیزنی ئەو شەفاعەت بکات لای، وەیان شەفاعەتی لا بکەن بۆ کەسێك کە خۆی لێی ڕازی نەبێت:**

﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾ (الأنبياء:٢٨).

**واتە شەفاعەت کاران شەفاعەت ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە خوا لێی ڕازییە تکای بۆ بکرێت.**

**کەواتە: دەرکەوت خەڵکی لە دونیادا پێویستیان بە واسیتە هەیە بۆ لای حاکمە دەسەڵاتدارەکان لەم لایەنەوە کە (عەدالەت) و (بەزەیی) و (خۆ بەکەم گرتنیان) نیە.**

**بەڵام پەروەردگار بەهیچ شێوەیەك قەبوڵی نیە واسیتەی بۆ دابنرێت؛ چونکە خۆی ڕاستەوخۆ وەڵامان دەداتەوە بێ جیاوازی، وە زۆر دادپەروەرو بە بەزەییە لەگەڵماندا، وە مرۆڤ هەرچەندە تاوانباریش بێت ئەگەر لەخوا بپاڕێتەوە پەروەردگار عەفوی دەکات و لە گوناهی دەبوورێت، وەك فەرموویەتی:**

﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ الزمر : ٥٣.

**واتە بفەرموو: ئەی ئەو بەندانەی پەروەردگار کە زیادەڕەویتان کردووە لە تاوان و گوناه کردندا بێ ئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا چونکە پەروەردگار دەبوورێت لەهەموو تاوانەکان؛ چونکە بە ڕاستی خۆی لێبوردەو بەڕەحمە.**

---

وقد قطع الله الأسباب التي يتعلق بها المشركون جميعاً، فالمشرك إنّما يتخذ معبودهُ لما يحصلُ له من النفع، والنفع لايكون إلا ممن فيه خصلةٌ من هذه الاربع:

إمّا مالكٌ لما يريد عابده منه، فإنْ لم يكن مالكاً كان شريكاً للمالك، فإنْ لم يكن شريكاً له كان معيناً له و ظهيراً، فإن لم يكن معيناً ولا ظهيراً كان شفيعاً عنده.

فنفى الله سبحانه المراتب الأربع نفياً مرتباً؛ منتقلاً من الأعلى إلى الأدنى؛ فنفى **الملك** و**الشرك** و**المظاهرة والشفاعة التي يطلبها المشرك**، **وأثبت شفاعةً لانصيب فيها للمشرك، وهي الشفاعة بإذنه.**

فكفى بهذه الأية نوراً وبرهاناً وتجريداً للتوحيد وقطعاً لأصول الشرك ومواده لِمَنْ عقلها.

**والقرآن مملوءٌ من أمثالها ونظائرها، ولكن أكثر الناس لايشعرون بدخول الواقع تحته وتضمّنه له، ويظنّونها في نوعٍ وقومٍ قد خَلَوا مِنْ قبلُ ولم يُعقبوا وارثاً، فهذا الذي يحولُ بين القلب وبين فهم القرآن. ولَعمرُ الله؛ إن كان أولئك قد خَلَوا، فقد ورثهم مَنْ هو مثلهم أو شرٌّ منهم أو دونهم، وتناوُلُ القرآنِ لهم كتناوُلِه لأولئك.**

کەوابوو ڕەحم و بەزەیی خوا بۆ تاوانبارانیشە، کەواتە با شەیتان وەسوەسەمان بۆ دروست نەکات و فێڵمان لێ نەکات بەوەی کە بڵێین: ئێمە تاوانبارین و پیاوچاکان لای خوا خۆشەویستن، وە خوا لە ئێمە خۆش نابێت بەبێ واسیتەی ئەوان !!

بزانە ئەوە داوی شەیتانەو بەو شێوەیە تووشی شەریك بۆ خوا دانانت دەکات!! وریابە بەرای موسڵمان.

## هۆی دووەمی پێویست بە واسیتە کردن بۆ لای کار بەدەستان

ب ـ وە لەبەر هۆیەکی تریش خەڵکی لە دونیادا پێویستیان بە واسیتە هەیە بۆلای کاربەدەستانیان ئەم هۆیەش بریتییە لە: (بێ ئاگایی کاربەدەست لە حاڵی ژێردەستەکانی). واتە لەبەر ئەوەی کە حاکمی کاربەدەست ئاگای لە حاڵی تاك تاکی ژێردەستەکانی خۆی نیە؛ بۆیە خەڵکەکە پێویستیان بە واسیتە هەیە بۆ ئەوەی حاڵی خۆیان بگەیەنن بە حاکم. وە حاکمیش بەهۆی چەند واسیتەیەك نەبێت ناتوانێت ئاگادار بێت بەسەر حاڵی خەڵکەکە.

بەڵام پەروەردگار:

* ئاگاداری نهێنی و پەنهانیە (يعلمُ السِّرَّ وأخفى).
* وەهیچ شاراوەیەك لەخوا شاراوە نیە (لا تخفى عليه خافية).
* وە ئاگای لە دزەی چاو (سیلەی چاو)و شاراوەی ناو دڵەکانیشە (يعلمُ خائنة الأعيُنِ وما تخفي الصدور).
* وە ئاگای لە وەسوەسەی دەروونی ئادەمیزاد هەیەو لە ئێمە نزیکترە لە ڕەگی گەردنمان: [وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ] (ق:١٦).
* وە کلیلەکانی زانیاری غەیب لای خوایەو هیچ یەکێك بێجگە لەو بەوە نازانێت وە پەروەردگار ئاگای لەوە هەیە کە لە ووشکانی و دەریادا هەیەو، هیچ گەڵا دارێك ناوەرێت ئیللا خوا پێی ئاگایە وە هیچ دەنکە تۆوێك لە تاریکی زەویدا نییەو، هیچ تەڕو وشکێك نیە، ئیللا پەروەردگار ئاگای لێیەتی و لە کیتابدا تۆمار کراوە:

[وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي البَرِّ وَالبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ] (الأنعام: ٥٩)

* وە پەروەردگار بیسەرو بینایە (وهو السميع العليم).

* وە پەروەردگار ئاگای لێمانەو لەگەڵمانە بە عیلم و ئاگاداری خۆی لەهەر شوێنێك بین، وە دەمان بینێت:

[يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ] (الحديد: ٤).

* وە لە هیچ حاڵ و ئەندیشەیەكدا نین و هیچ بەشێك لە قورئان ناخوێنینەوەو هیچ كردەوەیەك ناكەین ئیللا پەروەردگار چاودێرو ئامادەیە بەسەرمانەوە هاوكات لەو دەمەدا كە دەچینە ناو كارەكە. وەهیچ شتێك لە زەوی و ئاسماندا لە پەروەردگار ون نابێت، بەئەندازەی تۆسقاڵێك، وەنە بچوكترو نە گەورەتر لەوەش، وە هەموو ئەو شتانەش لە كیتابدا نوسراون و پەروەردگار ئاگایی تەواوی هەیە پێیان.

[وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلاَ أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ] (يونس: ٦١)

* وە پەروەردگار بیسەری هەموو دەنگەكانە بەجۆرەها زمان بۆ جۆراو جۆری داواكاریان. وە دەنگی داوای هیچ كەسێك مەشغوڵی ناكات وە بێ ئاگای ناكات لە بیستنی دەنگی داواكارانی تر وە داواكاری كەسی لەیاد ناچێت وە بێزاریش نابێت بە زۆر داوا لێ كردن.

وەك زانایان فەرموویانە لە وەسفی خوادا:

(يَسمعُ ضجيج الأصواتِ باختلافِ اللغاتِ على تفنن الحاجات، لا يُشغِلهُ سمعٌ عن سمعٍ ولا تغلطه المسائل ولا يتبرم بإلحاح الملحّين).

كەواتە پەروەردگارێك كە بەم شێوەیە عیلم و ئاگاداری هەبێت بەسەر هەموو بوونەوەردا، وە بیسەرو بینا بێت بەم شێوەیە؛ ئایا پێویست دەكات بەهۆی واسیتەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكانەوە خەبەری داواكاریەكانی خۆمانی بدەینێ و ئەو واسیتانە پەروەردگار ئاگادار

بکەنەوە، هەروەکو چۆن لەم دونیایەدا خەڵکی بەهۆی واسیتەوە حاڵی خۆیان دەگەیەنن بەکار بەدەستان، چونکە کاربەدەستان ئاگایان لە حاڵی هەموو خەڵکی نیە ؟!

((سبحان الله)) بۆ بیرناکەنەوە ئەو کەسانەی واسیتە بۆلای خوا دادەنێن ! ئایا نازانن پەروەردگاری بەئاگای زانای بیسەری بینا (تەشبیە) ناکرێت بەکاربەدەستی بێ ئاگا ؟!

ئەوە بۆ قەدرو ئەندازەی پەروەردگار دادەبەزێنن و خوای گەورەو باڵادەست وەکو خۆی ناناسن بە گوێرەی ناوو سیفاتە بەرزو جوانەکانی؟ بۆچی پەروەردگار دادەبەزێننە ئاستی دەسەڵاتدارە بێ ئاگایەکان بەڵام بەپێچەوانەشەوە واسیتەکانیان کە ـ پیاوچاکەکانن ـ بەرز دەکەنەوە زیاتر لە ئاستی خۆیان بۆ ئاستی پەروەردگارو بەریان دەشوبهێنن ؟!

- وە ئەگەر بڵێن ئێمە پیاوچاکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە خوا ناشوبهێنن ﴿لانشبّه المخلوق بالخالق﴾ . لەوەڵامدا دەڵێین:

ئەگەر بەزمانی دەمیشتان وانەڵێن بەزمانی حاڵتان واتان وتووە چونکە ـ بۆ نمونە ـ هەزاران هەزار موسڵمانی نەفامی جاهیل لە هەزاران شوێنەوە بە هەزاران زمانەوە بۆ هەزاران ئیش لە یەك کاتدا هاوار دەکەنە شێخ عبدالقادری گەیلانی. وە هەموو یەکێکیش لەو کەسانەی کە هاواریان کردۆتە شێخ عبدالقادر باوەڕی وایە کە شێخ دەنگی ئەو دەبیستێت؛ وەك چۆن دەنگی ئەوانی تریش دەبیستێت لەهەمان کاتدا!!، وە باوەڕیان وایە کە بە مردوویی، لە وڵاتێکی دووریشەوە شێخ عبدالقادر گوێ بیستی هەموو هاوارو دەنگەکانە، وە لە هەموو زمانەکانیش دەگات چ عەرەبی چ کوردی چ ئینگلیزی و چ... وە دەنگەکانیش هەموو لێك جیادەکاتەوە، ئەمەیان هی کێیە! ئەوەی تریان هی کێیە وە داوای هەموشیان تێ دەگات و هیچ دەنگ و داوایەك بێ ئاگاو مەشغوڵی ناکات لە بیستن و تێگەیشتنی دەنگ و داوای ئەوانی تر، وە دوای بیستن و تێگەیشتنی هەموو داواکاریەکانیش دەتوانێت وەڵامی هەموویان بداتەوەو هەرکەسە داواکاری خۆی بۆ جێ بەجێ بکات و فلان لە نەخۆشی چاك بکاتەوەو فلان ژنی بۆ بێت و فلانە پیاوێکی دەست کەوێت، فلانە منالی کوڕی ببێت و فلان بەسەر دووژمندا سەرکەوێت و فلان دەوڵەمەند بێت و... هتد.

سبحان الله، ئایا ئەم بیرو بۆچوون و ئیعتیقادە تەنها لایەق و شایستەی خوایە یان لایەقی بەندەیەکیشە وەك شێخ عبدالقادری گەیلانی و پیاوچاکانی تر ؟!! بێگومان هەرکەسێك

زەڕڕەیەك عەقڵ و تێگەیشتنی هەبێت ئەم ئیعتیقادەی بە غەیری خوا نابێت، چونكە یەكێك توانای بیستنی ئەو هەموو دەنگە زۆرە لێك جیایەی هەیەو توانای تێگەیشتن و وەڵام دانەوەی داواكاریەكانی هەیە كە چەندان سیفەتی هەبن وەك (الحيّ) زیندوویەتی و(السميع) بیسەرێتی و (البصير) بینایێتی و (القادر) بەتوانا (القيّوم) ڕاگری غەیری خۆی (المغـني) دەوڵەمەندكارو (المعطي) بەخشەرو (ملك الملك) خاوەنی موڵك و...

وەئەم سیفاتانەش تەنها تایبەتن بە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی.

كەواتە كوفرە كە ئێمە ئەم سیفاتانەی خوا بدەینە بەندەی بێ دەسەڵات كە نەمردن و ژیان نە قازانج و زەرەری بەدەستە، وە كە مرد مێشوولەیەكی پێ لەخۆ دەرناكرێ و، دادەبڕێت لە ژیانی سەر زەوی و دەچێتە جیهانی ناو گۆڕ !!.

## هۆی سێهەمی پێویست بوون بەواسیتە بۆلای كاربەدەستان

وە هۆیەكی تر بۆ دانانی واسیتە لەنێوان خەڵك و كاربەدەستان ئەوەیە كە كاربەدەست لەبەر بێ توانایی خۆی ناتوانێت بەتەنها كاری ئەم خەڵكە ژێردەستە جێ بەجێ بكات و داواكاریەكانیان وەڵام بداتەوە هەرچەندە ئاگاداری داواكاریەكانیشیان بێت و حەزیش بكات لە وەڵام دانەوەیان، بۆیە پێویستی بەچەندان واسیتە هەیە كە ببنە یاریدەدەری و هاوكاری بكەن و پاڵپشتی بكەن.

بەڵام پەروەردگار خۆی بە تەنها دەسەڵاتدارو بەتوانایە لەسەر هەموو شتێك و هەر شتێكی بوێت ئەنجامی دەدات بەئاسانی و بێ ئەوەی پێوستی بە یارمەتی و كۆمەكی كەس بكات و پەروەردگار هیچ پاڵپشت و وەزیرێكی نیەو پێویستی بەكەس نیيە.

﴿ وقُلِ الحمدُ للهِ الذي لم يتخذْ ولداً ولم يكن له شريكٌ في الملك ولم يكن له وليّ من الذلِ وكبِّرهُ تكبيراً ﴾ الاسـراء (١١١).

واتە سوپاس بۆ ئەو پەرستراوەی كە هیچ منداڵی نیەو هیچ شەریكی نیە لەو موڵكەداو هیچ دۆستێكی نەگرتووە، لەبەر لاوازێتی و پێویست بوونی پێی تا بە هۆی ئەوەوە بەهێز بێت !!

وە هەروەها ﴿ وما له منهم من ظهير ﴾ پەروەردگار هیچ پشتیوانێكی نیە لە دروست كراوان.

**وە پەروەردگار ئەوەندە بە توانایە لەسەر جێ بەجێ کردنی داواکاری بەندەکانی بە شێوەیەکی وا کە هەموو ئینسان و جنۆکەکان لە یەکەمیانەوە تا کۆتاییان لەیەك کاتدا کۆببنەوە لەسەر بەرزاییەك وەبەیەکەوە هاوار بکەنە خوا، هەر یەکەی بەزمانی خۆی و بۆ ئیشی تایبەتی خۆی!!، پەروەردگار وەڵامی هەر هەموویان دەداتەوەو داواکاری هەر هەموویان جێبەجێ دەکات خۆی بەتەنها بێ ئەوەی هیچ لەموڵکی پەروەردگار کەم بێتەوە. وەك خۆی لە حەدیسێکی قودسیدا فەرموویەتی:**

((يا ابن آدم لو أنَّ أوّلكم و آخركم وإنسكم وجنّكم قاموا في صعيد واحد فسألوني، فأعطيتُ كلّ واحدٍ مسألَتَهُ، ما نقص ذلك مما عندي إلا كما يَنْقُصُ المخيطُ إذا أُدخِلَ البَحرَ ))[١].

**وە پەروەردگار ئەوەندە بە توانایە ئەگەر ویستی شتێك ببێت تەنها دەفەرموێت (كُنْ) واتە: ببە، وە یەکسەر دەبێت !!**

**کەواتە خوای پەروەردگار ئاوا بە تواناو دەسەڵاتە چۆن دەشوبهێنرێت بە کار بەدەستی بێ دەسەڵاتی موحتاج بەواسیتەو یارمەتیدەر ؟!.**

**پەروەردگار خۆی بە تەنها بەتوانایە لەسەر ئەنجام دانی هەموو پێداویستی بەندەکانی و هیچ پێویستی بە واسیتەو یاریدەدەر ناکات کەواتە بۆچی واسیتە دابنێین؟!.**

*+-+*+-+*+-+*+-+*+-+*

**کەواتە دوای دەرکەوتنی هۆکارەکانی پێویست کردنی بوونی واسیتە لە نێوان خەڵکی و کاربەدەستاندا زانیمان هۆکاری بنەڕەتی (بێ عەدالەتی) و (بێ بەزەییتی) و (بێ ئاگاییتی) و (بێ توانایەتی) کاربەدەستانە، بۆیە خەڵکی پێویستیان بە واسیتە هەیە تا داواکاریەکانیان بگەنە لای کاربەدەستان و وەڵام بدرێنەوە بەڵام پەروەردگار بە پێچەوانەی کاربەدەستان و دروستکراوان پاکەو دوورە لە هەموو سیفاتێکی کەم و ناتەواو وە خاوەنی هەموو سیفاتێکی بەرزو تەواوەو ئاگای لە هەموو بەندەکانیەتی و لێیانەوە نزیکە بە عیلم و بیستن و بینین و دەسەڵات. وە دەنگی هەموویان دەبیستێت و پێشی خۆشە داوای پێداویستیەکانمانی لێ بکەین و بەتواناشە لەسەر وەڵامدانەوەمان بێ پێویست بوون بە واسیتەو یاریدەدەرو لەکەسیش ناترسێت**

---

(١) رواه مسلم (٢٥٧٧).

و ئیشیش بەکەس نیەو، کەسیش ناتوانێت فەرمانی پێ بگۆڕێت، وە خۆی دانـاو کـار لـەجێ و بەخشندەو میهرەبانە (أرحم الراحمين)ە. وە (أعدل العادلين)ە، وە (أحكم الحاكمين)ە، وە خۆیشی فەرمانی پێ کردووین کە داوای لێ بکەین و بەڵێنی داوینێ کە وەڵامان بداتەوەو تورەش دەبێـت کە داوای لێ نەکەین ڕوو بکەینە یەکێکی. وە پێی ڕاگەیاندووین کە غەیری ئـەو هاواریـشی بکەینێ تەنها زەرەرمان بۆ دەمێنێتەوەو هیچ سوودی لێ وەرناگرین؛ چونکە هـیچ یـەکێکی تـر جگە لە خۆی هیچی بە دەست نیـەو توانای شەفاعەت و تکاکردنیـشیان نیـە بـە ئیزنـی ئـەو نەبێت بۆ ئەو کەسەش نەبێت کە پەروەردگار خۆی ڕازیە شەفاعەتی بۆ بکرێت !!

کەواتە دوای ئەم هەموو ڕوون کردنەوانەو ناسینی گەورەیی و قەدری خوا بۆمـان دەرکـەوت کە (تەشبیه) کردنی خوا بە کاربەدەستان و واسیتە دانان بۆلای خوا وەك چۆن واسیتە دادەنێین بۆلای کاربەدەسـتان ئـەم کـارە کـارێکی زۆر ناشـەرعی و نـا عەقـــــــلانەیەو گونـاهێکی گەورەیەو وەسوەسەی شەیتانە کە جارێکی تر بڵێین:

چۆن لە دونیادا پێویستمان بەواسیتە هەیە بە بۆلای کاربەدەستان، بەهەمان شێوەش بـۆلای خوا !!.

یان بڵێین: ئێمە تاوانبارین و پیاوچاکان لەخوا نزیکن و خوا لە ئێمە خۆش نابێت بێ تکـای پیاوچاکان!! .

یان بڵێین: وا جوانترە خۆمان ڕاستەوخۆ داوا لەخوا نەکەین چـونکە وا بـە ئـەدەب تـرە کـە لەڕێگای پیاوچاکان و پێغەمبەرانەوە (عليهم الصلاة والسلام)، داواکاریەکانمان بگەن بە خوا !!.

کەواتە ئەم وەسوەسانە هەمووی فێڵـی شـەیتانەو دەیـەوێت بـەم شـێوازە (بـەناوی لـەخوا ترسانەوە) شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دابنێین !! پەنا بەخوا.

وە ئایا ئەدەب و عەقڵ و لەخوا ترسان ئەوەیە کە بێ فەرمانی خوا بکەین ؟!

خوا دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾ (غافر: من الآية٦٠).

واتە پەروەردگارتان **فەرمانی پێ کردووین**: فەرموویەتی هاوارم بکەنێ و داوام لێ بکـەن، وەڵامـتان دەدەمـەوە. وە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَداً ﴾ (الجن: من الآية١٨).

واتە: **نەهی لێکردووین**: لەگەڵ خوا هاوار مەکەنە هیچ یەکێکی تر.

جا ئایا وازهێنانت لەو فەرمانەی خوا لەسەری واجب کردوی کە ـ تەنها دوا لەوکردنە ـ وە کردنی ئەو کارەی کەلێی قەدەغە کردویت و نەهی لێ کردویت، ـ کە بریتییە لە هاوار کردنە یەکێکی تر، وەك پیاوچاکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ـ، ئایا ئەمە ئەدەب و عەقڵ و تەقوایە ؟!.

وە هەر ئایەتێکی قورئان دەخوێنیتەوە سەبارەت بەم باسەوە، دەبینین فەرمان دەکات کە تەنها هاوار بکەنە (الله) و داوا لەو بکەن. وەك:

* ﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ...﴾ الأعراف: ٥٥.
* ﴿وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ الأعراف: ٥٦.
* ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾ الأعراف: ١٨٠.
* ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ غافر: ٦٠.
* ﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ غافر: ١٤.

وە بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو:

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ البقرة (١٨٦).

واتەی ئەی محمد ئەگەر بەندەکانی من پرسیاری منیان لێ کردیت، ئەوە من خۆم لێیان نزیکم و وەڵامی داوای داواکاران دەدەمەوە. وە نەیفەرموو با داوا لەتۆ بکەن و تۆش داوا لەمن بکەو ببە واسیتەی نێوانمان بۆ گەیاندنی پاڕانەوەو داوای بەندەکانم بەمن و، لێ خۆش بوونیان و، وەڵام دانەوەی منیش بەئەوان.

بەڵام بۆ ڕاگەیاندنی شەرعی خوا پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە کە هەر پرسیارێکی شەرعی خوایان لێ کرد خۆی لە جیاتی خوا وەڵامیان بداتەوەو ببێتە واسیتەی ڕاگەیاندن (واسطة البلاغ).

هەروەك دەبینین کە پرسیاری کاری شەرعی دەکرا پەروەردگار دەیفەرموو خۆت وەڵامیان بدەوە بەم شێوەیەی فێری دەکرد . بۆ نمونە:

﴿ ويسألونك عن الخمر والميسر قل فيهما إثم كبيرٌ ومنافع للناس وإثمهما أكبرُ من نفعهما﴾البقرة

﴿ ویسألونك عن المحیض قل هو أذىً...﴾ البقرة

﴿ ویسألونك عن الأهلّة قل هي مواقیتُ للناس ﴾ البقرة

﴿ ویسألونك ماذا ینفقون قل العفو...﴾ البقرة

بەم شێوەیە پەروەردگار [ پێغەمبەری ﷺ وەك واسیتەی ڕاگەیاندنی شەرعەكەی بۆ داناوین، بەڵام لێی حەرام كردوین وەك واسیتەی نزیك كەرەوە بۆلای خۆی دابنێین]؛ چونكە ئەم واسیتەیە پاشماوەی دینی موشریك و كافرەكانەو پەروەردگار پێویستی بە هیچ كەس ناكات خەڵكی بیكەن بەواسیتە بۆ ئەوەی لە پەروەردگاریان نزیك بكاتەوەو داواكاریەكانیان بكەیەنێت بەخوا.

وەبۆیە تكاو داوامان تەنها دەبێت ڕاستەوخۆ لە پەروەردگار بێت وەك خۆی فەرمانی بەوە كردوە لە ئایەتەكانی پێشوو. وە قەدەغەی كردوە لە بەندەكانی هاوار بكەنە غەیری ئەو، یان و داوا لە غەیری خۆی بكەن.

وە پێغەمبەری پێشەواش ﷺ لەسەر ئەو تەنها خوا پەرستیە هاوەڵانی پەروەردە دەكرد وەك دەبینین بە عبداللەی كوڕی عباسی فەرموە :

((وإذا سألت فاسألِ الله، وإذا استعنتَ فاستعن بالله))[1].

واتە ئەگەر داواكاریت هەبوو یەكسەر داوا لە خوا بكەو ئەگەر داوای یارمەتیشت كرد تەنها داوای یارمەتی لە خوا بكە !.

وە پێی نەفەرموو: هاوار بكە من یان داوای یارمەتی لەمن بكە ؟! كە دووریش بم لێت، یان مردووش بم!!

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ بە فاطیمەی كچی فەرموو:

((یا فاطمةُ سلیني من مالي ما شئتِ فإنّي لا أُغني عنكِ من اللهِ شیئاً)) .

واتە لە ماڵی دونیام چی حەز دەكەیت داوام لێ بكە بەڵام لای خوا من هیچ سوود بەتۆ ناگەیەنم و هیچم بە دەست نیە بۆت لای خوا، وە خاوەنی هیچ نیم !!.

* * * * * * * * * *

كەواتە ئەو دینە دێرینەی ئیسلام كە لە كۆنەوە خوا بە هەموو پێغەمبەرانی(علیهم الصلاة والسلام) دا ناردووەو پێغەمبەری ئێمەش محمد ﷺ پێی هاتووەو زانایان لەسەری ڕۆیشتوون

(1) أخرجه الترمذي: حديث حسن صحيح.

تا ئەم سەردەمەی ئێمە بناغەو بنەڕەتەكەی بریتییە لە بەتەنها پەرستنی خواو بەتەنها هاوار كردنە (الله) و تەنها لەو داوای یارمەتیكردن ﴿إِيَّاكَ نَعبدُ وإِيَّاكَ نستعين﴾ وە تەنها داوای بەفریاكەوتن لەو بكەین و لەگەڵ ئەو خوایە پەروەردگارە گەورەیەدا هاوار نەكەینە هیچ یەكێكی تر، بەڵام هەر لەكۆنەوە تا ئەمڕۆش نەفام و هاوبەش پەیداكەران ڕازی نەبوون بەم دینی ئیسلامەی كە لەسەر تەنها خوا پەرستی و تەنها هاوار كردنە ئەو دامەزراوە بەڵكو لەگەڵ پەروەردگار چەندان پەرستراوی تریان داناون و هاواریان كردوونێ بەنیازی لەخوا نزیك كردنەوەو شەفاعەت بۆكردن لای خوا. وەك بۆمان دەركەوت لەسەرەتای ئەم كتابەدا بە بەڵگەی قورئان و حەدیس. وەك لەم ئایەتەشدا ڕوون دەبێتەوە:

﴿ ذَلِكُم بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ﴾(غافر: ١٢).

واتە: ئەگەر بە تەنها هاوار بكرێتە خواو تەنها لەو بپاڕێنەوە، ئێوەی نەفام باوەڕ ناهێنن و بێ باوەڕ دەبن بەم مەنهەجە كە تەنها هاوار بكرێتە (الله).

بەڵام ئەگەر شەریك بۆ خوا دابنرێت لە هاوار بۆ كردن و پەرستندا ئەوا ئەو كاتە ئێوە ـ ئەی موشریكان ـ باوەڕ دەهێنن، واتە باوەڕ بە دینێك دەهێنن كە شیركەو لەگەڵ خوا هاوار بكرێتە غەیری خوا !!.

وە هەروەها پەروەردگار زیاتر پەردە لەسەر شیركی ئەم جۆرە خەڵكە نەفامە گومڕایە لادەدات و دەفەرموێت: ﴿ وإذا ذُكِرَ اللهُ وحدهُ اشمأزتْ قلوبُ الذين لا يومنون بالآخرة . وإذا ذُكِرَ الذين من دونه إذا هم يستبشرون ﴾ (الزمر: ٤٥) واتە : ئەگەر بەتەنها باسی (الله) بكرێت و یادی ئەو بكرێت دەروونی ئەوانەی كە باوەڕیان بە ئاخیرەت نیە دەگیرێ و تەنگ دەبێت، بەڵام كاتێك كە مەعبودەكانیتر یاد دەكرێن ئەو كاتە دڵیان شاد دەبێت !!

بەداخەوە ئەمەیە حاڵی نەفام و نەزانەكانی ئەمڕۆش ئەگەر بەتەنها بڵێیت: ﴿یا الله هاوار﴾ دەڵێن ئەوە بۆ ناڵێیت یا حەزرەتی غەوس هاوار ؟!، وە بۆ ناڵێیت یا رسول الله هاوار ؟!، وە یان ئەگەر بە تەنها باسی خوا بكەیت و بەس ناوی ئەو بهێنیت ڕازی نابن و، دەڵێن دەبێت لەگەڵ (الله) بڵێیت: ﴿یا محمد، یا غەوس﴾ یان دەبێت بڵێیت بە ناوی خوا و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)!.

کەواتە برای موسڵمان وشیاربەو بزانە کە: دینی دێرینی ئیسلام تەنها خوا پەرستیەو تەنها هاوارکردنە خوایە، وە هەرکەسێکی موسڵمانت بینی دەیوت تەنها هاوار بکەنە خواو هاوار مەکەنە کەسی تر: بزانە ئەو کەسە لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلامە دێرینەکەیە لەم بوارەدا، وەبە درۆو بوهتانی خەڵك بڕوا نەکەیت کە دەڵێن: ئەمە دینێکی تازەیە!!

نەخێر دینی تازە ئەم شیرك و بیدعەکاری و گۆڕپەرستی و زەرگ لەخۆدان و هاوار کردنە شەخس و واسیتە دانانەیە، کە نەفام و بێ عەقڵان لەسەری دەڕۆن. وە بەناوی خۆشویستنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان و ڕێزگرتن لێیان، بەرزیان کردوونەتەوە بۆ ئاستی پەروەردگارو کردوویانن بە شەریکی خواو، لەئاستی بەندەیتی بەرزیان کردوونەتەوە بۆ ئاستی پەرستراوێتی و، دەیان پەرستن و هاواریان دەکەنێ و سەربڕینیان بۆ دەکەن و، سوێندیان پێ دەخۆن و پەنایان پێ دەگرن و، نەزریان بۆ دەکەن و، داوای بە فریاکەوتنیان لێ دەکەن!!.

وە دینی (أبو جهل و أبو لهب) یان زیندو کردۆتەوە بەناوی لەخوا نزیك بوونەوەو خۆش ریستی پیاوچاکان.

موسڵمانی ژیر ئێستا تێگەیشتیت کە خۆشویستن و ڕێزگرتن لە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکان، بە شوێنکەوتنیان دەبێت لە شەریعەتدا، نەك بە پەرستنیان و بەرز کردنەوەیان بۆ ئاستی پەرستراو، عیبادەت بۆ کراو، کە (الله) یە.

وە تێگەیشتیت کە ئەوانەی بەناوی واسیتەو لەخوا نزیك بوونەوە هاوار دەکەنە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکان، هیچ بەڵگەیەکیان نیەو،کارەکەیان بێ شەرعیەو شیرکەو کوفرەو، بێ ئەدەبی و بێ عەقڵی و نەفامیەیە.

يقول الإمام العز بن عبد السلام في رسالة ((الواسطة )) ص ٥ :

(( ومَن أثبت الأنبياء وسواهم من مشايخ العلم والدين وسائط بين الله وبين خلقه كالحجّاب الذين بين الملك ورعيته ، بحيث يكونون هم يرفعون الى الله تعالى حوائج خلقه، وان الله تعالى انما يهدي عباده ويرزقهم وينصرهم بتوسطهم، بمعنى أنّ الخلق يسألونهم، وهم يسألون الله كما انّ الوسائط عند الملوك يسألون الملك حوائج الناس لقربهم منهم، والناس يسألونهم أدباً منهم أن يباشروا سؤال الملك، ولأن طلبهم من الوسائط أنفع لهم من طلبهم من الملك، لكونهم اقربُ الى الملك، فمن اثبتهم وسائط على هذا الوجه فهو كافر مشرك يجب ان يستتاب فان تاب والاّ قتل وهؤلاء مشبهون لله، شبهوا الخالق بالمخلوق وجعلوا لله انداداً ))

وهذا القول مخالف لقوله تعالى :

﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ .

وقوله تعالى : ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾.

فلم يجعل الله بينه وبين خلقه واسطة في الدعاء. وهم بعقولهم الخرفة جعلوها .

## شوبهەی دوانزەهەم

## ﴿ شەفاعەت ﴾[١]

دەڵێن: هەموو موسڵمانێك باوەڕی وایە كە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاكان شەفاعەت دەكەن بۆ موسڵمانان لە ڕۆژی قیامەتدا. كەوابوو ئێمە هەر لە دونیادا بەزوویی داوای ئەو شەفاعەتەیان لێ دەكەین كە خوا پێی بەخشیون. وە دەڵێین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەفاعەتمان بۆ بكە لای خوا. وە ئەی شێخ عبدالقادری گەیلانی شەفاعەتمان بۆ بكە لای خوا. چونكە هەروەكو لە قیامەتدا داوای شەفاعەت و بەفریاكەوتنیان لێ دەكەین، بە هەمان شێوەش دروستە لە دوای مردنیشیان هەر داوایان لێ بكەین !.

## وەڵامی ئەم شوبهەیەش:

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ شەفاعەت دەكات، وە هەروەها پیاوچاكانیش و، فریشتەكانیش و، شەهیدانیش شەفاعەت دەكەن، دوای ئەوەی خوا ڕێگایان پێ دەدات، لەو سنورەدا كە بۆیان دادەنێت، بۆ ئەو كەسە شەفاعەت بكەن كە تەنها خوا پەرست (مُوحِّد) بووەو، هاوبەشی بۆ خوا پەیدا نەكردووەو، هاواری نەكردۆتە غەیری خوا.

جا بۆ ئەوەی ئێمەش داوایان لێ بكەین شەفاعەتمان بۆ بكەن، خوا ڕێگای شەفاعەت كردنی پێ داون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەرامیشی كردووە كە ئێمە لە دونیا داوای شەفاعەت كردنیان لێ بكەین و هاواریان بكەینێ دوای مردنیان.

* چونكە هاواركردنە غەیری خوا شیركە، وە داوای شەفاعەت لە مردوو ناكرێت، وە شەفاعەت هەمووی موڵكی خوایەو، داوا لە خاوەن موڵك دەكرێت كە پەروەردگارە، وە تاوەكو خۆی ڕێگا نەدات، كەس ناتوانێت شەفاعەت بكات و، بۆ كەسیش ناكرێت. وە داواكردنی ئێمە لە شەفاعەت كاران هیچ سودێكی نیە، بەڵكو زیانیشی هەیە. چونكە بەفەرمانی خواو ویست و ئیرادەی خوا شەفاعەت كاران شەفاعەت دەكەن، نەك بەداواو هاواری ئێمە، وە لە خۆمانەوە بۆمان نیە پێغەمبەر ﷺ و چەند پیاو چاكێك دابنێین بە شەفاعەت كاری خۆمان و

---

(1) الشفاعة: لغةً الدعاء.قال في لسان العرب: ( الشفاعة كلام الشفيع للملك في حاجة يسألها لغيره، والشافع الطالب لغيره يُتشفع به الى المطلوب، يقال تشفعت بفلان الى فلان فشفعني فيه).

لەگەڵ خوا هاواریان بكەینێ و داوای شەفاعەتیان لێ بكەین، چونكە ئەوان خاوەنی شەفاعەت نین و، ئێمەش لە خۆمانەوە نازانین ئایا ڕێگایان پێ دەدرێت شەفاعەت بۆ ئێمە بكەن یان نا.
وە هەر كەسێك لەخۆیەوە شەفاعەتكار دابنێت بۆ خۆیی و داوای شەفاعەتیان لێ بكات، ئەوە وەك موشریكەكانی كردووەو شەریكی بۆ خوا داناوەو سزاكەیشی ئەوەیە بێبەش دەكرێت لەشەفاعەتی شەفاعەت كاران و كەس نابێت شەفاعەتی بۆ بكات.

* وە ڕاستە لە ڕۆژی كۆبونەوەی خەڵك لە مەحشەر، خەڵكی دەچن بۆلای پێغەمبەران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ بەگشتی پێغەمبەری خۆشمان ﷺ بە تایبەتی، وە داوایان لێ دەكەن شەفاعەت بكەن لای خوا بۆ ئەهلی مەحشەر، بەڵام ئەو تایبەتە بە ڕۆژی قیامەت كاتێك كە پێغەمبەران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ زیندوو وحازرو ئامادەن لای خۆیان. وە گشت ئەو حەدیسانەی كە باسی ئەو دای شەفاعەتەمان بۆ دەكەن، هەموویان تایبەتیان كردووە بە ڕۆژی دوایییەوە، وە لە هیچ حەدیسێكی زەعیفیشدا نەهاتووە كە بڵێت ئەوە لە دوای مردنی دەبێت كاتێك كە لەناو گۆڕە !.

* وە هەروەها لە كتێبەكانی عەقیدەی ئیسلامی بە درێژی باس لە هەموو جۆرەكانی شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ كراوە، وە لە هیچ كامێكیاندا باسی ئەوە نەكراوە كە جۆرێك لە شەفاعەتەكانی ﷺ دوای دوای مردنی بێت لە ناو گۆڕدا !.

* كەواتە داوای شەفاعەت كردن لە مردوانی ناو گۆڕ ـ جا پێغەمبەر ﷺ بێت، یان پیاوچاكان ـ ئەوە هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نییەو داهێنراوو بیدعەیەكی شیركییە.

* وە لەبەر ئەوە نابینین هیچ كام لە هاوەڵانی ﷺ دوای مردنی ڕۆیشتبنە سەر گۆڕەكەی و داوای شەفاعەت كردنیان لێكردبێت. بە ڵكو دەچون داوایان لە زیندووەكانیان دەكرد، وەك لەساڵی وشكانی و بێ ئاویەكە داوایان لە عباس ﷺ كرد دوعایان بۆ بكات.

وە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە شەفاعەت، ئەوە بە بەڵگەی قورئان و سونەت باسی لێوە دەكەین بۆئەوەی نەفام و تێنەگەیشتوان گومانی خراپ بەئەهلی سوننەت نەبەن و، پڕوپاگەندە نەكەن كە گوایە باوەڕیان بە شەفاعەت نیە!!؛ چونكە لە هەموو كەس زیاتر باوەڕمان بە شەفاعەت هەیەو دڵیشمان خۆشە كە بەر شەفاعەت دەكەوین إن شاء الله؛ چونكە تەنها داوا لە خوا دەكەین كە هەر ئەو خاوەنی شەفاعەتەو، هەمووی موڵكی خۆیەتی:

﴿قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ الزمر : ٤٤.

# جۆرەكانی شەفاعەت

ئەگەر وردبینەوە لە ئایەتە پیرۆزەكانی قورئان دەبینین دوو جۆر شەفاعەت باسكراوە لەقورئاندا.

## جۆری یەكەم: ﴿ الشفاعة الشركية ﴾

ئەو شەفاعەتەی كە داواكردنی شیركە: ئەم جۆرەیان ئەوەیە كە داوا بكرێت لە غەیری خواو هاوار بكرێتە پیاوچاكان و فریشتەو جنۆكەو قەبر، بۆ ئەوەی شەفاعەت بكەن لای خوا بۆ هاواركەر واتە: بەبێ ئیزن و فەرمانی خوا، واسیتەو شەفاعەتكار دابنرێت بۆ ئەوەی شەفاعەت بكەن لای خواو شەفاعەت دانەریش سەربڕین و ماڵ بەخشین و هاواركردن و بەگەورەدانان بكات بۆ ئەم واسیتەو شەفاعەتكارانە، وە دڵی ببەستێتەوە بە ئەوان و ئیعتیقادی پێیان بێت كە سوودی بۆ دابین بكەن و زەرەری لەسەر لابدەن بەهۆی شەفاعەت كردنیانەوە لای خوا، وە شەفیعەكانی خۆش بوێت لەگەڵ لێ ترسان و بە گەورەدانانیان و پشت پێ بەستنیان !!.

ئەم جۆرەش خوای گەورە بە شیركی داناوەو كوفرەو دینی موشریكەكانی كۆنەو لە جیاتی سوود گەیاندن زەرەر دەگەیەنێت و، لە جیاتی نزیك كردنەوە لە خوا، دوورت دەخاتەوە لێی.

وە پەروەردگار لەچەندان ئایەتدا ئەم شەفاعەتە شیركیەی باس كردووە بۆ نمونە:

بەڵگەی یەكەم: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (يونس : ١٨) .

واتە: هاوبەشی پەیداكەران جگە لە خوا شتی تر دەپەرستن و لێی دەترسن و دڵیان پێیان خۆشەو ئەمەلی خێریان پێیەتی و داوای سوودو قازانجی لێ دەكەن كە لەڕاستیدا هەر شتێك دەپەرستن جگە لەخوا نە دەتوانێت زەرەریان لێ بدات ـ تاوەكو لێی بترسن ـ وەنە سوودیان پێ دەگەیەنێت ـ تاوەكو ئیعتیقادیان پێ بێت و ڕەجاو داوای لێ بكەن ـ وە هاوبەشی پەیداكەران دەڵێن: ئێمە ئەم هاوار بۆ كراوانە ناپەرستین سەربەخۆ واتە باوەڕمان نیە كە دروستكەرو ڕزق دەری ئێمە بن یان بتوانن خۆیان سوودمان بۆ بهێنن و زیانمان لەسەر لابدەن؛ بەڵام ئێمە لەبەر ئەوە ئیعتیقادمان پێیانەو هاواریان دەكەینێ بۆ ئەوەی شەفاعەتمان بۆ بكەن لای خوا، چونكە ئەمانە شەفاعەتكارمانن لای پەروەردگاری تاك و تەنها !!.

پەروەردگاریش قەبوڵی نیە بەو شێوەیەو لەم ڕێگایەوە خەڵکی داوای شەفاعەت لەخوا بکەن و ڕێی ئەمەی پێ نەداون، بۆیە ئینکاری کرد لەو کارەیان و بە شیرکی دانـاو بەپێغەمبـەری فەرموو: پێیان بڵێ: ئەوە ڕێگایەکیان داناوە بۆ لەخوا نزیك بوونەوە کە خوا ئاگای لێ نیە ؟!

واتە ئێوە ڕێگا بۆ خوا دادەنێن و شتێکی فێر دەکەن کە خۆی نەیزانێت ؟!. چۆن دەبێت ئـەو ڕێگایەی ئێوە ڕاست بێت و خواش پێی نەوتوون ؟! نەخێر ئەم کارەیان کە شەفاعەتکار دانانـە لای خوا شیرکەو پەروەردگاریش پاك و بەرزە لەم شیرکە[1].

**بەڵگەی دووەم:** ﴿أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ شُفَعَاءَ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ، قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (الزمر : ٤٣ ــ ٤٤) .

واتە: ئایا ئەو موشریکانە، پەرستراوەکانی خۆیان داناوە بە شەفاعەتکاریان و، وادەزانن کـە هاواریان کردنێ و پشتیان پێ بەستن و ئیعتیقادیان پێیان بوو و داوایان لێ کردن، وادەزانن بەوە شەفاعەتیـان بۆ دەکەن. وە ئایا وا گومان دەبەن کە شـەفاعەت مـولکی مەعبودەکانیانـە؟ وە ئەگەر داوایان لێ کردن ئەوانیش شەفاعەتیـان بۆ دەکەن؟!.

ئەی محمد ﷺ بەو موشریکانە ـ بفـەرموو: ئایـا ئێـوە هـەر بـە شـەفاعەتکاری خۆتانیـان دادەنێن، هەرچەندە هیچیشیان بەدەست نەبێت و، خاوەنی شەفاعەتیش نـەبن و ئاگاشـیان لـە هاوارو داواکاری ئێوەش نەبێت ؟!.

ئەی محمد بفەرموو: شەفاعەت هەمووی موڵکی خوایەو ئەوانەی ئێوە داوای شەفاعەتیان لێ دەکەن خاوەنی شەفاعەت نین، کەواتە دەبێت داوای شـەفاعەت تـەنها لەوخوایـە بکرێت کـە خاوەنیەتی، نەك لەوانەی هیچیان بەدەست نیەو، خاوەنی هیچ سوودو زیان و موڵکێك نین. بەڵام

---

(1) ڕازی سەبارەت بەم جۆرە شەفاعەتە فەرموویەتی:

(( اختلفوا في أنهم كيف قالوا في الأصنام إنهم شفعاؤنا عند الله !...)) فذكر صوراً، منها قوله:

((ورابعها: أنهم وضعوا هذه الأصنام والأوثان على صور أنبيائهم وأكابرهم، وزعموا أنهم متى اشـتغلوا بعبادة هذه التماثيل فإن أولئك الأكابر تكون شفعاء لهم عند الله تعالى.

ونظيره في هذا الزمان: اشتغال كثير من الخلق بتعظيم قبور الأكابر، على اعتقـادهم أنهـم إذا عظّمـوا قبورهم فإنهم يكونون لهم شفعاء عند الله )). ((تفسير الفخر الرازي)):(١٧/٥٩-٦٠).

پەروەردگار خاوەنی شەفاعەتەو خاوەنی موڵكی هەموو ئاسمانەكان و زەویشە، وە لەپاشانیش تەنها هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە»[1].

**بەڵگەی سێیەم:** وە لە ئایەتێكی تردا پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ويوم تقوم الساعةُ يُبلسُ المجرمونَ، ولم يكنْ لهم من شركائهم شفعاءُ وكانوا بشركائهم كافرين﴾الروم(١٢،١٣).

واتە: لەو ڕۆژەدا كە كاتی زیندوو بونەوەیە تاوانبارەكان بێ ئومێد دەبن لە ڕزگار بوونیان لە سزا وە سەرسام دەمێنن و هیچ پەناو دەروازەیەكیان دەست ناكەوێت و بەڵگەیان نامێنێت.

وە لەو ڕۆژەدا ئەو مەعبودانەی كە لە دونیا دەیان پەرستن و هاواریان دەكردنێ و ئومێدی شەفاعەت كردنیان پێیان بوو - بۆیە جۆرەها پەرستنیان بۆ دەكردن و كردبوویانن بە شەریك بۆ خوا لەپەرستن و پشت پێ بەستندا - لەو ڕۆژەدا شەفاعەتیان بۆ ناكەن و نابن بە شەفاعەتكاریان بەڵكو بە پێچەوانەوە دەبن بە دوژمنیان و بەڕائەتی خۆیان دەردەبڕن لەو هاوبەشی پەیداكەرانەی كە لە دونیادا هاواریان دەكردنێ و كردبوویانن بە شەفاعەتكار وشەریكی خوا؛ چونكە شەفاعەت موڵكی خوایەو نابێت بكرێتە موڵكی غەیری ئەو.

وە كە هاوبەشی پەیداكەران بێ ئومێد بوون لە مەعبودەكانیان و بینیان بەڕائەتیان لێ دەكەن ئەو كاتە ئەوانیش بەڕائەت لە مەعبودەكانیان دەكەن و دەڵێن: ئێمە لە دونیا ئێوەمان

---

(1) وقال الفخر الرازي في ((تفسيره)):(٢٦/٢٨٥).: ((إعلم أن الكفار أوردوا على هذا الكلام سُؤالاً. فقالوا: نحن لانعبد هذه الأصنام لاعتقاد أنها آلهة تضر وتنفع. وإنما نعبدها لأجل أن يصير أولئك الأكابر شفعاء لنا عند الله.

فأجاب الله تعالى بأن قال: [ أم اتخذوا من دون الله شفعاء قل أو لو كانوا لا يملكون شيئاً ولا يعقلون].

وتقرير الجواب: أن هؤلاء الكفار إما أن يطمعوا بتلك الشفاعة من هذه الأصنام، أو من أُولئك العلماء والزهاد الذين جُعلَت هذه الأصنام تماثيل لها.

**والأول باطلٌ**؛ لأن هذه الجمادات وهي الأصنام لاتملك شيئا ولا تعقل شيئا، فكيف يُعقل صدور الشفاعة عنها؟!.

**والثاني باطلٌ**؛ لأن في يوم القيامة لا يملك أحد شيئا، ولا يقدر أحد على الشفاعة إلاّ بإذن الله. فيكون الشفيع في الحقيقة هو الله، الذي يأذن في تلك الشفاعة. فكان الاشتغال بعبادته أولى من الاشتغال بعبادة غيره)).

دەپەرست و پشتمان پێ دەبەستن بۆ ئەمڕۆ، بۆ ئەوەی شەفاعەتمان بۆ بکەن، نەك بەڕاستە تمان لێ بکەن !.

کەواتە بەم ئایەتە قورئانیانە ڕوون بۆوە کە شەفاعەت تەنها مـوڵکی پـەروەردگارەو، تـەنها دەبێت لەو داوا بکرێت، وە هەر کەسێك ئیعتیقادی وابێت یەکێکی تر غەیری خوا شـەفاعەتی بەدەستەو داوای شەفاعەت لەو بکات بۆ ئەوەی شەفاعەتی بۆ بکات لای خوا بـێ ئیزنـی خـوا ئەوا شەریکی بۆ خوا داناوە لەچەند لایەنێکەوە:

١ـ لەو ڕوانگەوە کە شەفاعەت تەنها موڵکی خوایەو بە حـەقی یـەکێکی تـری دەزانێـت جگە لە خوا. واتە وا دەزانێت کـە شـەفاعەتکارەکانی شـەفاعەت کردنیـان بـە دەسـتەو بـێ ڕووخسەتی خواش شەفاعەتی خۆیان هەر دەکەن لای خوا.

٢ـ لە ڕوانگەی داوا کردنی شەفاعەت لە غەیری خوا؛ چـونکە داواکـردن و هـاوار کردنـە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکانی غاییب، یان مـردوو شـیرکەو نابێـت هـاوار بکرێتـە غەیری خواو داوا لە غەیری ئەو بکرێت.

٣ـ لە ڕوانگەی تەشبیە کردنی پەروەردگار بە پادشاو کار بەدەستانی دروست کراو واتە چۆن شەفاعەتکاران شەفاعەتی خۆیان دەکەن لای کاربەدەستان بێ ئەوەی کـار بەدەسـتەکە پێـشی خۆش بێت، وە بێ ڕۆخسەتی ئەوانیش شەفاعەتی خۆیان هەر دەکەن و کار بەدەستانیش ناچارن وەڵامیـان بدەنەوەو تکایان بگرنەوە، جا لە خۆشی بێت یان لە ناخۆشی ! چونکە زۆربـەی کـات وایە کە شەفاعەتکاران مافێکیان هەیە بەسەر کاربەدەستەوە چونکە شەفاعەتکاران:

أ ـ یان ئەوانیش کار بەدەستن و خاوەن موڵکن لەلایەکی ترەوە.

ب ـ وەیان لەگەڵ خودی ئەم کاربەدەستە شەریکن لە موڵکایەتی.

ج ـ وەیان شەریکی نین لە موڵکدا بەڵام جێگرو یاریدەدەرینی.

بۆیە کاربەدەست ناتوانێت شەفاعەتیان نەگرێتەوە، چونکە جاری وا هەیە خۆی ئیـشی بـەو شەفاعەتکارانە دەبێت و ئەگەر ئیشیان نەکات ئەوانیش لێـی هەڵدەگەڕێنـەوەو لـەوانەیـە زەرەری پێ بگەیەنن،وە جاری وا هەیە مەترسی هەیە لێیان، بۆیە ناچـارە ڕەتیـان نەکاتـەوە، وە جاری واش هەیە چاکەو منەتی شەفاعەتکاری زۆر لەسەرە بۆیە بە پێویستی دەزانێت پاداشتی بداتەوەو تکایەکەی گیرا بکات.

وە لــە بنەڕەتــدا شــەفاعەت بۆیــە دەكرێــت كــە كــار بەدەســت و حــاكم واز لــە حوكمــە دادپەروەریەكە بهێنێت و، حوكمەكە بەسەر شەفاعەت بۆ كراو تەتبیق نـەكات لەبـەر خـاتری شەفاعەتكار.

كەواتە شەفاعەتكار دەتوانێت ڕاو حوكمی حاكم بگۆڕێت، چونكە مـافی بەسـەر حاكمـەوە هەیە.

بەڵام پەروەردگار زۆر لەوە بەرزترە كە تەشبیە بكرێت بە حاكمێكی دروست كـراو (مخلـوق). وە خوای گەورە كەس ناتوانێت حوكمی پێ بگۆڕێـت و كاریگـەری تـێ بكـات، وە لەكەسـیش ناترسێت و منەتی كەسیشی بەسەرەوە نیەو ئیشیشی بەكـەس نیـە وە هـیچ كەسـێكیش نیـە خاوەنی هیچ بێت لە بوونەوەرداو كێشی مێرولەیەكی بچوك مـوڵكی هـەبێت سـەربەخۆ، یـان شەریكی خوا بێت لە موڵكایەتیدا یـان یاریـدەدەری بێـت. وەلـەوەش زیـاتر كـەس ناتوانێـت شەفاعەتیشی لابكات بێ ئیزنی خوا.

بەڵگەی چوارەم:

[وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُمْ مَا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَى مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ لَقَدْ تَقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنْكُمْ مَا كُنْتُمْ تَزْعُمُونَ] (الأنعام: ٩٤).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگار بە هاوبەشی پەیداكەران دەفەرموێت : سـوێند بـەخوا، بێگومـان ئێوە بە تاك تاك گەڕانەوە لای ئێمە، هەروەكو یەكەمجار دروستمان كـردن، وە هەرچـی پێمان بەخشیبوون و لەبەردەستتان دابوو بەجێتان هێشت دوای خۆتان، وە ناشـبینین لەگـەڵتان شەفاعەتكارەكانتان؛ ئەو فریشتەو جنۆكەو پێغەمبەرو پیاوچاكانەی ئیعتیقادتان پێیان بوو، وە وا گومانتان دەبرد تكاتان بۆ بكەن و فریاتان بكەون كاتێ لەگـەڵ خـوا هاوارتـان دەكردنـێ و كردبوتانن بە شەریكی خوا لە ئیعتیماد خستنە سەرو هانا بۆ بردن و داواڵێكـردن !. سـوێند بە خوا هەرچی پەیوەندیەك هەبوو لە نێوانتاندا پچڕا، وە هەرچی ئومێـدێكتان پێیـان بـوو ون بوو و پێچەوانەش بۆوە.

دوای باس كردنی بەڵگەكانی قورئان، لەوانەیە كەسانێكی بێ بەش لە قورئان بڵـێن: ئێمـە لە قورئان ناگەین، لەبەر ئەوە ئیشی پێ ناكەین !، بەڵكو تەنها لەسەر قسەی زانایان دەڕۆین!.

**لەبەر ئەوە با بزانن كە زانایانی ئیسلام ئەم جۆرە شەفاعەتە شیركیەیان بۆ ڕوون كردووینەوە بە گوێرەی قورئان بەم شێوەیەی خوارەوە:**

(١) وقال ابن جرير الطبري المفسّر الشافعي ـ **ڕەحمەتی خوای لێ بێت** ـ:

(قد تبيّن مِمّا تقدّم من الآيات أنّ الشفاعة التي نفاها القرآن هي التي تُطْلَبُ من غير الله) (تفسير الطبري. سورة البقرة: ٢٥٥).

(٢) **زانای هەموو زانستە ئیسلامیەكان** (شيخ الإسلام) أحمد بن تيمية ـ **ڕەحمەتی خوای لێ بێت** ـ **لە كتابی** (مجموع الفتاوى) **كە** (٣٧) **بەرگە فەرموویەتی:**

(الشفاعة التي نفاها الله تعالى كالتي أثبتها المشركون، ومن ضاهاهم من جُهّالِ هذه الأمة، وضلالهم؛ وهي شركٌ).

[ والمشركون: يتّخذون شفعاء من جنس ما يعهدونه من الشفاعة ]

[ فالمشركون: كانوا يتّخذون من دون الله شفعاء من الملائكة والأنبياء والصالحين، ويصورون تماثيلهم فيستشفعون بها ويقولون: هولاءِ خواصُ الله، فنحن نتوسّلُ إلى الله بدعائهم وعبادتهم ليشفعوا لنا، كما يتوسّلُ إلى الُملوك بخواصهم لكونهم أقرب إلى الملوكِ من غيرهم، فيشفعون عند الملوك بغير إذن الملوك، وقد يشفع أحدهُم عند الملك فيما لا يختارهُ فيحتاجُ إلى إجابة شفاعتهِ رغبةً ورهبةً. فأنكر الله هذه الشفاعة:

١- فقال تعالى: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ .

٢- وقال: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ﴾ .

٣- وقال عن الملائكة: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ، لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ، يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾ (سورة الأنبياء) .

٤- وقال : ﴿قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ، وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ﴾ (سورة سبأ : ٢٢ ــ ٢٣) .

٥- وقال تعالى: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (سورة يونس : (١٨)) .

٦- وقال تعالى: ﴿وَأَنذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوا إِلَىٰ رَبِّهِمْ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ (سورة الأنعام : (٥١)) .

٧- وقال تعالى: ﴿ اللهُ الذي خلقَ السماوات والأرضَ وما بينهما في ستةِ أيامٍ ثمّ استوى على العرش ما لكم من دونه من وليٍ ولا شفيعٍ أفلا تتذكّرون ﴾.

٨-وقال تعالى:﴿ لا يملكُ الذين يدعون من دونه الشفاعة إلا مَنْ شهد بالحقّ وهم يعلمون ﴾.

٩- وقال تعالى: ﴿ ولقد جئتمونا فُرادى كما خلقناكم أوّل مرّة وتركتُم ما خوّلناكم وراءَ ظهوركم، وما نرى معكم شفعاءكم الذين زعمتم أنهم فيكم شركاء، لقد تقطع بينكم وضلّ عنكم ما كنتم تزعمون ﴾.

١٠- وقال تعالى: ﴿ أمِ اتخذوا من دون الله شفعاء قل أولوا كانوا لا يملكون شيئاً ولا يعقلون قل لله الشفاعة جميعاً لهُ ملكُ السماوات والأرض ثم إليه ترجعون... ﴾.

١١- وقال تعالى: ﴿ وخشعَتِ الأصواتُ للرحمنِ فلا تسمعُ إلاّ همساً، يومئذٍ لا تنفعُ الشفاعةُ إلاّ مَنْ أذنَ لهُ الرحمن ورضيَ لهُ قولاً ﴾.

١٢- وقال صاحب يس: ﴿ ومالي لا أعبدُ الذي فطرني واليه ترجعون ؟ أأتّخذُ من دونه آلهةً إن يردنِ الرحمن بضرٍ لا تغنِ عنّي شفاعتُهم شيئاً ولا ينقذون ؟ إنّي إذن لفي ضلالٍ مبين، إنّي آمنتُ بربّكم فاسمعون ﴾.

**فهذه الشفاعة التي أثبتها المشركون للملائكة والأنبياءِ والصالحين حتى صوّروا تماثيلهم وقالوا: استشفاعُنا بتماثيلهم استشفاعٌ بهم، وكذلك قصدوا قبورهم وقالوا: نحن نستشفعُ بهم بعد مماتهم لِيشفعوا لنا إلى الله، وصوروا تماثيلهم فعبدوهم كذلك، وهذه الشفاعة أبطلها اللهُ ورسولهُ، وذمّ المشركين عليها وكفّرهم بها)**[1]

((الشفاعة المنفيّة هي الشفاعة المعروفة عند الناسِ عند الإطلاق. وهي: أن يشفع الشفيعُ الى غيرِه ابتداء فيقبل شفاعته))[2]

**وە ڕوونى كردۆتەوە كە مەبەست لەم ئايەتانەى كە نەفى شەفاعەت دەكەن چىيە: فەرمووى:**

((أنّه يرادُ بذلك نفي الشفاعة التي يثبتها أهل الشرك، ومَنْ شابَهَهُم من أهل البدعِ: من أهل الكتاب والمسلمين الذين يظنّون أنّ لِلخلقِ عند الله من القدر أن يشفعوا عنده بغيرِ إذنهِ، كما يشفعُ

(1) (مجموع الفتاوى ١ / ١٥٠ ـ ١٥١).

(2) مجموع الفتاوى (١ / ١١٨).

الناسُ بعضهم عند بعض فيقبل المشفوعُ إليه شفاعة شافعٍ لحاجتِهِ إليه رغبةً ورهبةً،وكما يُعامِلُ المخلوقُ المخلوقَ بالمعاوضة))(1).

((والشفعاءُ الذين يشفعون عنده لا يشفعون إلاّ بإذنهِ كما قال: ﴿ قُلِ ادعوا الذين زعمتم من دون الله لا يملكون مثقال ذرةٍ في السماواتِ ولا في الأرضِ وما له فيهما من شركٍ وماله منهم من ظهير. ولا تنفعُ الشفاعةُ عندهُ إلاّ لِمَنْ أذنَ له ﴾.

فبيَّنَ أنَّ كل مَنْ دُعي من دونه: ليس له ملك ولا شرك في الملك ولا هو ظهير. وأنّ شفاعتهم لا تنفعُ إلاّ لِمَنْ أذن له.

وهذه بخلاف الملوك: فإنّ الشافع عندهم قد يكون له ملك، وقد يكون شريكاً لهم في الملك، وقد يكون مظاهراً لهم معاوناً على ملكهم، وهولاءِ يشفعون عند الملوكِ بغير إذنِ الملوكِ هم وغيرهم.

والمَلِكُ يقبلُ شفاعتهم: تارةً بحاجتِهِ إليهم، وتارةً لخوفه منهم، وتارةً لِجزاءِ إحسانهم إليه ومُكافئتهم ولإنعامهم عليه؛ حتى أنّه يقبل شفاعة ولدِهِ و زوجتهِ، لِذلك فإنّه محتاجٌ إلى الزوجة وإلى الولد؛ حتى لَوْ أعرضَ عنهُ ولدهُ وزوجتهُ لتضرر بذلك، ويقبل شفاعةَ مَملوكه؛ فإذا لم يقبل شفاعته؛ يخافُ أن لا يطيعهُ، أو أن يسعى في ضررهِ، وشفاعةُ العبادِ بعضهم عند بعضٍ: كلُّها من هذا الجنس. فلا يقبلُ أحد شفاعة أحد إلاّ لرغبةٍ أو رهبة. والله تعالى: لا يرجو أحداً، ولا يخافُه، ولا يحتاج إلى أحدٍ بل هو الغني).

(٣) وە زانای بەناوبانگ محمد رشيد رضا المفسِّر ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ، لەتەفسیرەکەیدا (تفسير المنار) فەرموویەتی:

((الشفاعة المعروفة عند الناس هي أن يحمل الشافعُ المشفوعَ عنده على فعلٍ أو تركٍ كان أراد غيره ـ حكمَ به أم لا ـ فلا تتحقق الشفاعة إلاّ بترك الإرادة و فسخها لِأجل الشفيع. فأمّا الحاكم العادل فإنّه لا يقبل الشفاعة إلاّ إذا تغيّر علمه. بما كان أراده أو حكمَ به، كأن كان أخطأ ثمّ عرفَ الصواب ورأى أنّ المصلحة أو العدالة في خلاف ما كان يريدهُ أو حكمَ به. وأمّا الحاكم المستبد الظالم فإنّه يقبلُ شفاعة المقربين عنده في الشيء، وهو عالمٌ بأنّه ظالمٌ وأنّ العدلَ في خلافه، ولكنّه

---

(1) (١ / ١٤٩ - ١٥٠).

يفضّلُ مصلحة ارتباطهِ بالشافع المقرب منه على العدالة. وكلٌ من النوعين محالٌ على الله تعالى، لِأنّ إرادتَهُ تعالى على حسب علمه وعلمه أزليٌ لا يتغيّر)).

((كان اليهود المخاطبون ببيان هذه الحقيقة كغيرهم من أمم الجاهلية وأهل الملل الوثنيّة كقدماء المصريّن واليونان يقيسون أمور الآخرة على أمور الدنيا فيتوهّمون أنّه يمكنُ تخلص المجـرمين مـن العقاب بفداءٍ يدفع بدلاً وجزاء عنه ـ كما يستبدل بعض حكامهم منفعة مالية بعقوبة بدنية ـ أو بشفاعة من بعض المقربين إلى الحاكم يُغيّر بها رأيهُ ويفسَخُ إرادته. ولقد اكتسح الإسلام هذه العقائد وآثارها العمليّة بالتوحيد الخالص، وأتى بُنيانها من القواعد، ولكن المسلمين لم يَسلموا منـها فقـد دخل في الإسلام أقوامٌ يحملون أوزاراً ممّا كانوا عليه من الوثنيّة، و لم يلقنوا الدين من القرآن ولا كما أرشد القرآن، ولكنّهم تقلّدوه ممّن لا يعرفهُ حقَّ المعرفة، ولقنوه كما ترشد إليه كُتب التقليد مـن مصطلحات مبتدعة، فكانوا على بقيّة ممّا كان عندهم وعلى جهل بالاسلام، وجاء قومٌ آخـرون تعمدوا الإفساد فجعلوا بالتأويل الباطلَ حقّاً والكذبَ صدقاً))[1].

(٤) **زانای بەناوبانگ** ابن كثير المفسّر الشافعي **ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەفەرموێت:**

﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ﴾...

فإذا كان هذا في حقِّ الملائكة المقربين، فكيف ترجون أيها الجاهلون شفاعة هذه الأنداد عنـد الله؛ وهو لم يشرع عبادتها ولا أذن فيها، بل قد نهىعنها على ألسنة جميع رُسُلِه؛ وأنزل بالنهي عن ذلك جميع كتبه).

(٥) **وە زانای پایە بەرز** إبن قيم الجوزية **ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ فەرمویەتی:**

**ومِنْ أنواعهِ – أي الشرك – طلب الحوائج من الموتى والإستغاثةُ بهم، وهذا أصـلُ شـرك العالم.** فإنَّ الميت انقطع عملهُ وهو لايملك لنفسه نفعاً ولا ضرّاً، فضلاً عمَّنْ استغاثَ به وسـأله أن يشفعَ له إلى الله. وهذا من جهله بالشافعِ والمشفوعِ عنده. فإنّه لايقدرُ أنْ يشفع له عند الله إلاّ بإذنه **والله لم يجعلْ استغاثته وسؤاله سبباً لإذنه؛ وإنّما السبب كمال التوحيد، فجاء هذا المشركِ بسبب يمنع الإذنَ، وهو بمنـزلة مَنْ استعان في حاجته بما يمنع حصولَها.** وهذه حالةُ كُلِّ مشركٍ، فجمعوا بين الشركِ بالمعبودِ وتغيير دينهِ، ومعاداة أهل التوحيد، ونسبة أهله إلى التنقص بالأموات، وهم قـد

---

(١) تفسير المنار (١ / ٣٠٦).

تنقصوا الخالق بالشرك، وأولياءهُ الموحدين بذمهم وعيبهم ومعاداهم، وتنقصوا مَنْ أشركوا به غاية التنقص؛ إذ ظَنُّوا أنّهم راضون منهم بهذا، وأنّهم أمروهم به، وأنّهم يوالوهم عليه، وهولاء هم أعداءُ الرُّسُل في كُلِّ زمانٍ ومكان، وما أكثر المستجيبين لهم؛ وما نجى من شَرَك هذا الشرك الأكبر إلاّ مَنْ جَرَّد توحيده لله وعادى المشركين في الله، وتقرَّبَ بمقتهم إلى الله، واتَّخذَ الله وحده وَليَّهُ وإلهَهُ ومعبُودَهُ، فجرَّدَ حُبَّهُ للهِ وخوفهُ للهِ، ورجاءه للهِ، وذُلّه للهِ، وتوكُّلهُ على اللهِ، واستعانتهُ باللهِ، والتجاءه إلى اللهِ، واستغاثتهُ باللهِ، وقصدهُ للهِ، متَّبعاً لأمرهِ متطلباً لمرضاته إذا سأل سأل اللهَ، وإذا استعان استعان باللهِ، وإذا عمل عمل للهِ، فهو للهِ وباللهِ ومعَ اللهِ)[١].

# جۆری دووەمی شەفاعەت: شەفاعەتی شەرعی

**شەفاعەتی شەرعی ئەو جۆرە شەفاعەتەیە کە قورئان و حەدیس ئاماژەیان کردووە بەبوونی لە ڕۆژی قیامەتدا وە مانای ئەم شەفاعەتەش ئەمەیە کە:**

(أنّ الله سبحانه هو الذي يتفضَّلُ على أهل الإخلاص فيغفرُ لهم بواسطة دعاء مَنْ أذِنَ لَه أن يشفع لِيُكرِمَهُ ويَنال المقامَ المحمودَ)[٢].

**واتە: پەروەردگار خۆی ڕێزو چاکەو فەزڵ دەنوێنێ لەسەر ئەهلی ئیخلاص و تەنها خوا پەرستدا، بەوەی کە لێیان دەبورێت بەهۆی درعاو تکای ئەو تکاکارەی کە خۆی ڕوخسەتی داوە تکا بکات بۆ ئەوەی ڕێز بنێت لە تکاکارو بیگەیەنێت بە پلەی سوپاس کراو بەهۆی تکاکردنەکەی.**

(أنَّ الشفاعة المثبتة التي تقع بإذنه إنَّما هي الشفاعة لأهلِ الإخلاص خاصَّة وأنّها كُلّها مِنه، (رحمةً مِنه وكرامةً للشافع)، و(رحمةً مِنه وعفواً عنْ المشفوع له)، وأنّه هو المحمود عليها في الحقيقة، وهو الذي أذِنَ لمحمد ﷺ فيها وأناله المقام المحمود)[٣].

**واتە: ئەو شەفاعەتەی کە هەیە ئەوەیە کە بەڕوخسەتی خوا دەبێت وە بریتییە لەو شەفاعەتەی کە تەنها بۆ ئەهلی ئیخلاص (تەنها خوا پەرستان) دەکرێت بەتایبەتی. وە ئەو شەفاعەت کردنەش هەمووی هەر لە خواوەیەو مەبەستیش لەو ڕوخسەت دانی تکاکردنە:**

---

(1) انتهى كلام ابن القيِّم من فتح المجيد ٢١٢ــ ٢١٣.

(2) وتەی شێخ الاسلام ابن تیمیة، بڕوانە (مجموع الفتاوى).

(3) وتەی زانای المفسّر (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) القول السديد ص ٦٣.

**ڕێزلێنان و ڕەحم کردنە بە تکاکار ﴿ نەك ترسان لە تکاکار یاخود ئیش پێ بوونی یاخود ناچاری بێت ﴾.**

**وەهەروەها ئەم ڕوخسەت دانی شەفاعەت کردنەش ڕەحمی خوایە بۆ شەفاعەت بۆکراوو عەفوو کردنیەتی. کەواتە پەروەردگار هەر تەنها خۆی سوپاس کراوە لەسەر ئەم ڕوخسەت دانی تکاکردنە، وەهەر خۆیشی ئیزنی پێغەمبەر ﷺ دەدات شەفاعەت بکات بۆ ئەوەی بگات بە پلەی بەرزی سوپاس کراو.**(١) (٢).

---

(1) وە (شيخ الاسلام) فەرموویەتی: (فأمّا إذا أذِنَ له في أن يشفعَ فشفع؛ لم يكن مستقلاً بالشفاعة، بل يكون مطيعاً له أي تابعاً له في الشفاعة، وتكون شفاعتُه مقبولةً ويكون الأمرُ كُلُّه لأمر المسولِ...

**فإنَّ الشفاعة إذا كانت بإذنه لم تكن من دونه، كما أن الولاية التي بإذنه ليست من دونه** كما قال تعالى: ﴿ إنّما وليُّكم الله ورسوله والذين أمنوا... ﴾.

وأيضاً فقد قال: ﴿ أم اتخذوا من دون الله شفعاء أولَوْ كانوا لايملكون شيئاً ولا يعقلون، قل لله الشفاعة جميعاً له ملك السماوات والأرض ﴾. فذمَّ الذين اتَّخذوا من دونه شفعاء وأخبر أنّ لله الشفاعة جميعاً، **فعُلِم أنَّ الشفاعة منتفيةٌ عن غيره، إذ لايشفع أحد إلا بإذنهِ وتلك فهي له)** (مجموع الفتاوى) ١ / ١١٨- ١١٩.

(وكلُّ داعٍ شافعٍ دعا الله ـ سبحانه وتعالى ـ وشفع: فلا يكون دعاءهُ وشفاعتهُ إلا بقضاءِ اللهِ وقدره ومشيئتهِ، وهو الذي يجيب الدعاء ويقبلُ الشفاعة، فهو الذي خلق السبب والمسبب، والدعاء من جملة الأسباب التي قدرها الله ـ سبحانه وتعالى ـ.

وإذا كان كذلك: فالالتفات إلى الأسباب شركٌ في التوحيد، ومحو الأسباب أن تكون أسباباً نَقْصٌ في العقل، والاعراضُ عن الأسباب بالكلَّية قدحٌ في الشرع، بل العبد يجب أن يكون توكلهُ ودعاءهُ وسواله ورغبتهُ إلى اللهِ ـ سبحانه وتعالى ـ والله يقدر له من الأسبابِ ـ من دعاء الخلقِ وغيرهم ـ ماشاء) (مجموع الفتاوى) ١/ ١٣١.

(2) وە شێخ محمد رشيد رضا **لە تفسير المنار** (٣٠٨ / ١) **فەرموویەتی:**

**(وليس في الشفاعة بهذا المعنى ـ أي على أنّها دعاءٌ يستجيبهُ الله تعالى ـ أنّ الله سبحانه يرجع عن إرادةٍ كان أرادها لِأجل الشافع وإنّما هي إظهار كرامة للشافع بتنفيذ الإرادة الأزليَّة عقيب دعائه، وليس فيها أيضاً ما يُقَوي غرور المغرورين الذين يتهاونون بأوامر الدين ونواهيه اعتماداً على شفاعة الشافعين،** بل فيه أنّ الأمر كُلّه للهِ، وأنّه لاينفع أحداً في الآخرة إلا طاعتهُ ورضاهُ [فما تنفعهم شفاعة الشافعين، فمالهم عن التذكرة معرضين؟] [ولا يشفعون إلا لِمَنْ ارتضى] ).

كەواتە لەڕۆژی قیامەتدا جۆرێك لە شەفاعەت هەیە كە دوو مەرجی تێدا بێت:

١ـ پەروەردگار شەفاعەت كار ئیزن بدات بۆ شەفاعەت كردن؛ چونكە هیچ كەسێك ناتوانێت بەبێ ئیزنی ئەو لە خۆیەوە شەفاعەت بكات وەك لای سەركردەو كاربەدەستان دەكرێت ! وە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَنْ ذا الذي يشفع عندهُ إلا بإذنه﴾ ٢٥٥ البقرة.

واتە كێیە ئەوەی شەفاعەت دەكات لای پەروەردگار ئیللا بە ئیزنی خۆی نەبێت؟!.

٢ـ مەرجی دووەمی شەفاعەتی شەرعی ئەوەیە: كە ئەو كەسەی شەفاعەت كار شەفاعەتی بۆ دەكات دوای ئیزنی خوا، كەسێك بێت خوا بیەوێت شەفاعەتی بۆ بكرێت و ڕازیش بێت لە قسەو كردەوەی.

وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ، لا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ، يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ ومَا خَلْفَهُمْ ولا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾ الأنبياء٢٦-٢٨.

واتە: فریشتەكانی خوا هەرچەندە لە خوا نزیكن، بەڵام ڕۆڵەو شەریكی خوا نین و خاوەنی هیچ نین لەگەڵ پەروەردگاردا، بەڵكو بەندەی ڕێز لێ گیراون. چونكە پێش پەروەردگاریان ناكەون بەهیچ قسەیەك، وە بەفەرمانی ئەو كاردەكەن و لە خۆیانەوە شت داناهێنن و چاوەڕێی فەرمانی ئەون. وە پەروەردگار ڕابردوو و داهاتوویان دەزانێت و، ناتوانن شەفاعەت بكەن تەنها بۆ ئەو كەسە نەبێت كە پەروەردگار خۆی لێی ڕازییە. وە فریشتەكانیش لە ترسی خوا لەترس و لەرز دان.

كەواتە هەرچەندە شەفاعەت دەكەن بەڵام ناتوانن بەبێ ئیزنی ئەو بیكەن؛ چونكە ﴿ لايسبقونه بالقول ﴾ پێش خوا ناكەون، وە شەفاعەت كردنەكەشیان هەر بە فەرمانی خوایە؛ چونكە ﴿ وهم بأمره يعملون ﴾ واتە بە فەرمانی خوا كاردەكەن.

وە شەفاعەتیش تەنها بۆ كەسێك دەكەن كە خوا بیەوێت بۆی بكەن و لێی ڕازی بێت. وە لەگەڵ ئەوەشدا لە خوا دەترسن و خۆیان بە خاوەنی هیچ دانانێن لە بەرامبەر خوا.

وە زانای المفسِّر (ابن كثير) لە پەفسیر ئەم ئایەتە دەفەرموێت:

(فإذا كان هذا في حقِّ الملائكة المقربين، فكيف ترجون أيها الجاهلون شفاعة هذه الأنداد عندالله؛ وهو لم يشرع عبادهما ولا أذِنَ فيها، بل قد نهى عنها على ألسنة جميع رُسُلِه؛ وأنزل بالنهي عن ذلك جميعَ كُتُبِه ؟.

**واتە: جا كە ئەوە حاڵی ئەو فریشتانە بێت كە لە خوا نزیكن و بەندەی خالیسی پەروەردگارن، وە لە عیبادەت و بە پاك ڕاگرتنی خوا هیچی تر ناكەن، ئەدی كە وابوو چۆن ئێوەی نەفام دڵی خۆتان خۆش دەكەن بە شەفاعەتی كەسانێك، كە وەكو فریشتە نەپارێزراون لە هەڵەو تاوان، وە سەرەڕای ئەوەش پەروەردگار مۆڵەتی ئێوەی نەداوە بە داواكردنی شەفاعەت لەو مردوو و پیاوچاكانەو هاواركردنە ئەوان و پەرستنیان. بەڵكو بەپێچەوانەوە نەهی كردووە لەم جۆرە شەفاعەت دانانە لە هەموو كتێبەكانی و لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەرەكانی.**

**وە لە ئایەتێكی تردا**(النجم:٢٦) **هەردوو مەرجەكەی كۆكردۆتەوە دەفەرموێت:**

﴿وكَمْ مِنْ مَلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً إِلَّا مِنْ بَعْدِ أَنْ يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾

قال الشوكاني (فتح القدير: ١٤٥/٥): والمعنى التوبيخ لهم بما يتمنون ويطمعون فيه من شفاعة الأصنام، مع كون الملائكة مع كثرة عبادهما وكرامتها على الله لا تشفع الا لمن أذن أن يشفع له، فكيف هذه الجمادات الفاقدة للعقل والفهم، وهو معنى قوله ﴿ إلا من بعد أن يأذن الله ﴾ لهم بالشفاعة ﴿ لمن يشاء ﴾ أن يشفع له (ويرضى) بالشفاعة له، لكونه من أهل التوحيد، وليس للمشركين في ذلك حظٌ، ولا يأذن الله بالشفاعة لهم ولا يرضاها، لكونهم ليسوا من المستحقين لها.

**واتە: چەندین فریشتە لە ئاسمانەكان شەفاعەتیان هیچ سودی نابێت، تەنها دوای ئەوە نەبێت كە: (١) پەروەردگار ئیزنیان بدات شەفاعەت بكەن(٢) بۆ ئەو كەسەی پەروەردگار خۆی بیەوێت بۆی بكرێت و(٣) ڕازیش بێت شەفاعەتی بۆ بكرێت.**

**وە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت:**

﴿ يَوْمَئِذٍ لا تَنْفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ ورَضِيَ لَهُ قَوْلاً ﴾ (طه:١٠٩)

**واتە: لەو ڕۆژی قیامەتەدا شەفاعەت سودی نابێت تەنها بۆ ئەو كەسە نەبێت پەروەردگار شەفاعەتكاری ئیزن دابێت بۆ شەفاعەتكردن بۆی وە لە وتەكەشی ـ واتە لە شەفاعەتەكەی ـ ڕازی بێت. وە ئەوانەش كە خوا لێیان ڕازیە پێغەمبەران و پیاوچاكانن.**

وە لە دوای ئەوەی کەزانیمان کەس شەفاعەتی بۆ ناکرێت تەنها ئەوە نەبێت کە پەروەردگار بیەوێت بۆی بکرێت و لێی ڕازی بێت، ئایا پەروەردگار بۆ کێ ڕازییە[1]؟.

لە وەڵامدا: پەروەردگار لەو کەسە ڕازییە کە دوو مەرجی بەیەکەوە بەستراوی تێدابێت:

١ـ تەنها خوا پەرست و (مخلص) بێت، واتە نیەتی پاك و تاك بێت بۆ خوا.

٢ـ وەهیچ یەکێك و هیچ کەسێك نەکاتە شەریك بۆ خوا لە هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستندا.

## بەڵگەی یەکەمی ئەم دوو مەرجەش:

پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ ولا يَمْلِكُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (الزخرف:٨٦).

## تەفسیرەکانی ئەم ئایەتە:

**تەفسیری یەکەم:** (ولا يملك عيسى وعزيرٌ والملائكةُ الشفاعة في أحدٍ (أو لأحد) إلا فيمن (أو لمن) شهد بالحق(أي بالتوحيد) وآمن على علمٍ وبصيرةٍ بما شَهِدَ به).

واتە عیساو عوزەیرو فریشتەکان، شەفاعەتیان پێ ناکرێت بۆ کەس، تەنها بۆ ئەوانە نەبێت کە شاهیدیان داوە بە تەوحیدو، ئیمانیان هێناوە لەسەر عیلم و زانیاری و تێگەیشتنەوە.

کەواتە شەفاعەت ناکەن بۆ دوو کۆمەڵ:

١ـ ئەوانەی شاهیدی نادەن بە(حەق) واتە بە (لا إله إلا الله) کە کافرو موشریکن.

٢ـ ئەوانەی شاهیدی دەدەن بەدەمیان بە (لا إله إلا الله)، بەڵام نازانن ماناکەی بریتییە لەوەی کە: (هیچ پەرستراوێکی حەق نیەو، تەنها (الله) پەرستراوی حەقەو، پێویستە پەرستن و خۆش ویستن و ترسان و ئیعتیقاد پێ بوون و هاوارکردن و داوا لێ کردن و پشت پێ بەستن و سەربڕین و ماڵ بەخشین، بۆ ئەو (الله)یە بکەن بەتەنها، بێ ئەوەی بۆ کەسی تری بکەن).

(1) زانای المفسّر (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) فەرموی: ((لابُدَّ من اجتماع الشرطين: إذنه تعالى في الشفاعة، ورضاه عن المشفوع له. ومن المعلوم المتقرر، أنه لايقبل من العمل إلاّ ماكان:(أ) خالصاً لوجه الله، (ب) موافقا فيها صاحبه الشريعة، فالمشركون إذاً لا نصيب لهم من شفاعة الشافعين، وقد سدُّوا على أنفسهم رحمة أرحم الراحمين)). تيسير الكريم الرحمن (النجم:٢٦).

**ئەم کۆمەڵی دروەمە، ئەگەر نوێژیش بکەن و ڕۆژوش بگرن و حەجیش بکەن، وە شاهیدیش بدەن بەدەم بە (لا إله إلا الله) سود لە شاهیدی و عیبادەتەکانیان نابینن، و شەفاعەتیشیان بۆ ناکرێت، چونکە شاهیدی دانەکەیان تەنها بە دەمەو، مانای شاهیدیەکە نازانن و، لە دڵدا ئیعتیقادیان بە ماناکەی دانەمەزراوە[1]؛ چونکە ئیعتیقادیان بە غەیری خواش هەیەو، بە ئیعتیقادو کردەوەیان شاهیدی دانەکەیان هەڵوەشاندۆتەوەو[2]، هاوار دەکەنە غەیری خوار، سەربڕین بۆ غەیری خوا دەکەن و، داوای بەفریاکەوتن لە غەیری خوا دەکەن و، داوا لە مردوو دەکەن شەفاعەتیان بۆ بکەن، وەك چۆن موشریکەکانی کۆن داوایان لێ دەکردن !!.**

**تەفسیری دووەم:** (لا يملكُ هولاءِ الذين اعتقدوا أن الملائكة أو الأصنام أو الجن أو الشياطين تشفعُ لهم ـ لا يملكُ هولاء العابدون من دون الله أن يشفع لهم أحد إلا من شهد بالحق أي لكن من شهد بالحق ـ يعني الموحدين ـ يملكون شفاعة الملائكة والأنبياء إذا أذن لهم اللهُ عز وجل. فإن من شهد بالحق يُشفَعُ لهُ ولا يُشَفع لمشرك).

**واتە: ئەوانەی کە ئیعتیقادیان هەیە بە فریشتەو پێغەمبەران** (عليهم الصلاة والسلام) **و بت و جنۆکە کەشەفاعەتیان بۆ بکەن، وە هاوار دەکەنە ئەوان و داوای شەفاعەت لەوان دەکەن، ئەوانە چونکە غەیری خوا دەپەرستن شەفاعەتیان بۆ ناکرێت، چونکە تەنها ئەوانە شەفاعەتیان بۆ دەکرێت کە شاهیدیان داوە بەتەنها پەرستراوێتی خوا بەدڵ و گیان و دەشزانن تەنها خوا شایستەی پەرستن و داوا لێ کردنە. بۆیە تەنها ئەو بڕوادارانە ــ دوای ئیزنی خوا ــ بەر**

---

(1) **ئیمام** القرطبي المفسِّر **فەرموویەتی:**
((أنَّ الشهادة بالحق، غير نافعة إلا مع العلم، وأنَّ التقليد لايغني مع عدم العلم بصِّحة المقالة)).

(2) **چونکە:(أ) شیرك عیبادەت هەڵدەوەشێنێتەوە:** [وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ] (الزمر:٦٥). [وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ](الأنعام: من الآية٨٨)
**(ب) وە لەگەڵ نەبونی عەقیدەی (خوا بەتەنها پەرستی) عیبادەت سوودی نابێت:**
[وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِنْدَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ] (النور:٣٩). [وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا] (الفرقان:٢٣).
[وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا] (النساء:١٢٤)

شەفاعەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و فریشتەکان دەکەون، کەواتە موشریك بەر شەفاعەت ناکەوێت هەرچەندە دڵی خۆی خۆش بکات لەدونیا بەو پێغەمبەرو پیاوچاکانەی کە داوای شەفاعەتیان لێ دەکات لەگۆڕەکانیاندا!!.

**تەفسیری سێهەم:** (لا يملك من يدعونه من دون الله من الأصنام والأنبياء والملائكة والأولياء والجن الشفاعة كما يزعمون أنهم يشفعون لهم، إلا من شهد بالحق (بالتوحيد) على علم وبصيرة بما شهدوا به؛ وهم المسيح وعُزير والملائكة، لأنهم شَهدوا بالحق والوحدانية لله على بصيرة، فإنهم يملكون الشفاعة لمن يستحقُّها).

واتە: هەموو ئەو پەرستراوانەی کە موشریکەکان دایان ناون بە شەفاعەتکار بۆ خۆیان و ئیعتیقادیان وایە شەفاعەتیان بۆ دەکەن ـ هیچ کام لەم پەرستراوانەیان شەفاعەتیان پێ ناکرێت و، ڕێگایان پێ نادرێت شەفاعەتیان بۆ بکەن، تەنها ئەوانەیان نەبن کە شاهیدیان داوە بە (لا إله إلا الله) بە تێگەیشتنەوە. کە ئەمانەش (عیساو عوزەیرو فریشتەکانن) تەنها ئەمانەو وێنەی ئەو خوا بە تەنها پەرستانە ڕێگایان پێ دەدرێت شەفاعەت بکەن، بۆ ئەو کەسانەی شایستەن کە بڕواداران تەنها خوا پەرستن (المُوحِّدون).

**کەواتە بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە هەرسێ جۆرە تەفسیرەکانیەوە بۆمان دەرکەوت کە:**

(أ) زۆربەی ئەوانەی خەڵکی ئیعتیقادیان پێیانە شەفاعەتیان بۆ بکەن، ناتوانن شەفاعەت بکەن؛ چونکە تەنها ئەو کەسە دەتوانێت شەفاعەت بکات کە (شهد بالحق وهم يعلمون) واتە تەنها خوا پەرست بێت و، لەسەر ڕۆشناییش بیپەرستێت. بەڵام ئەوانەی خوا بەتەنها نەپەرستن و بیروباوەڕو ئیعتیقادیان بەغەیری خوا هەبێت، وەك زۆر لە جادوگەرەکانی ئەمڕۆ کە ئیددیعای زانینی غەیب دەکەن و، خۆیان بەپیرۆز دەزانن و ڕێگا بەخەڵکی دەدەن هاواریان بکەنێ و، قاچیان ماچ بکەن و، کڕنوشیان بۆ ببەن و، پاشەو پاش بگەڕێنەوە دراوە لە خزمەتیاندار، سەربڕینیان بۆ بکەن. ئەوانە هەرچەندە نەفامەکانیان و زۆر لە خەڵکی ناتێگەیشتوی تریش بە شەفاعەتکاریان دەزانن و داوای شەفاعەتیان لێ دەکەن؛ بەڵام لە ڕاستیدا نەك هەر ناتوانن شەفاعەت بۆ کەس بکەن، بەڵکو خۆشیان شەفاعەتیشیان بۆ ناکرێت؛ چونکە شاهیدیان بە حەق بە (لا إله إلا الله) نەداوە بە تێگەیشتنەوە. وە هەروەها بە شیرك و کوفر شاهیدیەکەیان

هەڵوەشاندۆتەوە. وە کەسێکیش شیرکی هەبێت شەفاعەتی قەبوڵ نیە، چونکە مەرجی شەفاعەتکار ئەوەیە تەنها خوا پەرست (موحد) بێت و شەریك بۆ خوا دانەنێت لە پەرستندا. وەك ئایەتەکەی پێشوو بەڵگەیە لەسەر ئەمە بە گوێرەی لێك دانەوەی سێهەم. وە هەروەها وەك لەم حەدیسەی بەڵگەی دووەمەشدا دەردەکەوێت:

**بەڵگەی دووەمی دوو مەرجەکە:**

(ما من مسلم يموتُ، فيقوم على جنازته أربعون رجلاً، لا يُشركون بالله شيئاً؛ إلا شَفَّعَهُمُ اللهُ فيه)[1].

واتە: هیچ موسڵمانێك نیە بمرێت و چل پیاوی خوا بەتەنها پەرست کە هیچ شەریك بۆ خوا دانەنێن نوێژی (صلاة الجنازة)ی لەسەر بکەن ئیللا پەروەردگار دوعاو نوێژو تکایان قبوڵ دەکات بۆ ئەو موسڵمانە مردووە.

کەواتە ئەوەی نوێژی جەنازە دەکات و لە نوێژەکەیدا شەفاعەت و تکا دەکات لای خوا بۆ مردوو ئەگەر شیرکی هەبێت ئەوە تکای ناگیرێتەوە.

* وە هەروەها هەر کەسێك ڕازی بێت خەڵکی هاواری بکەن و دوای مردنیشی داوای شەفاعەتی لێ بکەن، ئەوە نەك هەر شەفاعەت ناکات، بەڵکو طاغوتەو دەخرێتە ناو دۆزەخەوە بە بەردەوامی لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە دەیان پەرستن و هاواریان دەکردن.

* وە هەروەها هەموو ئەو جنۆکە شەیتانانەش، کە پەرستنی غەیری خوا دەڕازێننەوە بۆ خەڵکی، لەژێر پەردەی شەفاعەتکاری و دۆستایەتی کردن و خۆش ویستنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان، وە ئەم جنۆکە شەیتانانەش بەقسەیان دەکرێت و گوێڕایەڵیان دەکرێت و هاواریان دەکرێن، ئەوانیش ناتوانن شەفاعەت بکەن و، بۆ ناو دۆزەخیش دەڕۆن.

* وە هەروەها هەموو ئەو بت و سەنەم و دار و بەردانەی کە خەڵکی بە پیرۆزیان دەزانن و ئیعتیقادیان پێیانەو ئومێدی شەفاعەت کردنیان پێیان هەیە؛ هەر هەموویان لەگەڵ شوێن کەوتەکانیان دەچنە ناو دۆزەخەوە ـ پەنا بە خواـ وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

---

(1) صحيح مسلم.

[ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ(٩٨) لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ(٩٩) لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ(١٠٠) إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ(١٠١) لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنْفُسُهُمْ خَالِدُونَ(١٠٢) لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ ] (١٠٣) الأنبياء.

**واتە: ئەی موشریكەكان، ئێوەش و ئەوانەش كە دەتان پەرستن و هاوارتان دەكردنێ و داوای شەفاعەتتان لێ دەكردن جگە لە خوا، وە ئەوانیش ڕازی بوون یان بێ دەنگ بوون لەسەر ئەم پەرستنەی ئێوە بۆ ئەوان ؟!. هەردوولاتان سوتەمەنی دۆزەخن و دەچنە ناویەوە. وە ئەگەر ئەو پەرستراوانەی ئێوە شایستەی پەرستن و هاوار لێ كردن بان، ئێستا نەدەچوونە ناو دۆزەخەوە بەڵام ئێستا هەردوولاتان بە بەردەوامی تێیدا دەمێننەوە.**

**كەواتە ـ بێ عەقڵی و نەفامی و زەرەرمەندییە ـ موسڵمان ئیعتیقادی بە پەڕۆ، یان بەردێك، یان دارێكی سەر قەبری پیاوچاكێك بێت و، بە پیرۆزی بزانێت و وابزانێت لەزەرەر دەیپارێزێت، وە سوودی پێ دەبەخشێت. وە یان باوەڕی بە كەسێكی خۆپەرست بێت شەفاعەتی بۆ بكات، بەداخەوە ئایا نازانن ئەمانە هەموویان بۆ ناو دۆزەخن و شەفاعەتیان پێ ناكرێت بۆخۆشیان !!**

**موسڵمانان بیربكەنەوەو هۆشیار بنەوە...**

**بەسیەتی لاسایی كردنەوەی كوێرانەو، بەندایەتی كردن بۆ بەندە.**

**(ب)ـ وە لە ئایەتەكەی سوڕەتی (الزخرف) بۆمان دەركەوت: كە تەنها ئەو كەسانە شەفاعەتیان بۆ دەكرێت، كە شاهیدیان داوە بەحەق واتە بە(لا إله إلا الله محمد رسول الله) بە تێگەیشتنەوە، نەك بەلاسایی كردنەوەی كوێرانە. وە بۆمان دەركەوت كە ئەوانەی پەروەردگار لێیان ڕازیەو دەیەوێت شەفاعەتیان بۆ بكرێت ئەوانەن كە (شهد بالحق وهم يعلمون) خوا بە تەنها دەپەرستن لەسەر ڕۆشنایییەوە. وەك شیخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي دەفەرموێت:**

(ولا يقبل منها [ أي النفس ]، شفاعةٌ لأحدٍ بدون إذن الله ورضاهُ عن المشفوع له ولا يرضى منه العمل إلاّ:(١) ما أريد به وجههُ و(٢) كان على السبيل والسنّة)[1].

---

(1) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان (١ / ٥٨)

واتە: شەفاعەت لە هیچ شەفاعەتکارێك وەرناگیرێت لە ڕۆژی قیامەتدا بەبێ ئیزنی خواو ڕازی بوونی لە شەفاعەت بۆ کراو. وە لە کردەوەی شەفاعەت بۆ کراویش ڕازی نابێت تەنها ئەوە نەبێت کە تەنها لە پێناوی خوا کرابێت و لەسەر ڕێبازو سونەتی پێغەمبەر ﷺ بێت.

کەواتە تەنها ئەوانە شەفاعەتیان بۆ دەکرێت کە تەنها (الله) پەرستراوو خۆشەویستیان بوو. وە تەنها عیبادەتی خوایان کردووە بە خالیسی، وە شەریکیان بۆ دانەناوەو، لەغەیری ئەو هاواریان نەکردۆتە کەس بۆ شەفاعەت کردن. وەك لە بەڵگەی سێهەمدا دەردەکەوێت:

**بەڵگەی سێهەمی دوو مەرجەکە:**

أبو هریرە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا: ((مَنْ أسعد الناس بشفاعتكَ؟)). واتە: کێ بەختەوەرترین کەس دەبێت بە شەفاعەتی تۆ ؟ قال: مَنْ قال: لا إله الا الله خالصاً من قلبه، واتە فەرمووی: ئەو کەسەی کە بڵێ: ـ لا إله إلا الله ـ واتە هیچ پەرستراوێکی حەق نیە تەنها الله نەبێت وە بە خالیسی لە دڵەوە ئەم شاهیدی دانە دەربچێت.

کەواتە ئەگەر وتنی (لا إله إلا الله) لە دڵێکی بە ئیخلاس و تەنها ڕوو لە خواو ئیعتیقاد بەخوا بوو دەرنەچێت، سوودی نیەو، بەختەوەر نابێت بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ.

وە هەر کەسێك شەریك بۆ خوا دابنێت و هاوار بکاتە غەیری خواو ئیعتیقادی بە غەیری خوا بێت، ئەوە بەهیچ شێوەیەك بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ ناکەوێت. وەك لە بەڵگەی چوارەمدا لەم حەدیسەدا دەردەکەوێت:

**بەڵگەی چوارەمی دوو مەرجەکە:**

قال رسول الله ﷺ : لِكلِّ نبيٍّ دعوةٌ مستجابةٌ فتعجّلَ كلُّ نبيٍّ دعوتَهُ؛ وإنّي اختبأتُ دعوتي شفاعةً لِأُمّتي فهي نائلةٌ ـ إن شاء الله ـ من مات لا يشرك بالله شيئاً)[1].

واتە: بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوعایەکی گیرا (وەڵام دراوە) هەبووە. وە هەموو پێغەمبەرانیش (عليهم الصلاة والسلام) دوعای خۆیان کردو وەڵامیان وەرگرتەوە. بەڵام من دوعا گیرا بووەکەی خۆم هەڵ گرتووە (شاردوومەتەوە) بۆ تکا کردنی ڕۆژی قیامەت بۆ گەلەکەم وە

(1) (صحيح مسلم) .

تکاکەم (شەفاعەتەکەم) دەگات ـ إن شاء الله ـ بەهەموو یەکێك کە مردبێت و هیچ شەریکی بۆ خوا پەیدا نەکردبێت واتە بە شیرکەوە نە مردبێت.

الشیخ ابن القیِّم لە شەرحی ئەم حەدیسەدا فەرموویەتی:

(تأمّل هذا الحديث كيف جعل أعظمَ الأسبابِ التي تُنالُ بها شفاعَتُهُ تجريدَ التوحيد، عكس ما عند المشركين أنّ الشفاعة تُنالُ باتخاذهم شفعاء وعبادتهم وموالاتهم، فقَلَبَ النبيﷺ ما في زعمهم الكاذب، وأخبر أنّ سبب الشفاعة تجريد التوحيد، فحينئذٍ يأذن الله للشافع أن يشفع. ومن جهل المشرك اعتقاده أنّ مَن اتخذهُ وليّاً أو شفيعاً أنّه يشفع له وينفعهُ عندالله، كما يكون خواص الولاة والملوك تنفع مَن والاهم و لم يعلم أنّه لا يشفع عنده احدٌ إلاّ بإذنه في الشفاعة، ولا يأذن في الشفاعة إلاّ لمن رضيَ قولهُ وعملهُ، كما قال في الفصل الأول ﴿ ٢: ٢٥٥ من ذا الذي يشفع عنده إلاّ بإذنه ﴾ وفي الفصل الثاني ﴿ ٢١: ٢٨ولا يشفعون إلا لمن ارتضى ﴾ وبقي فصل ثالث، وهو أنّه لا يرضى من القول والعمل إلاّ توحيده واتباع رسوله ﷺ فهذه ثلاثة فصولٍ تقطعُ شجرةَ الشركِ من قلبِ مَنْ عَقَلَها و وعاها.

*+-|•|-+*+-|•|-+*+-|•|-+*+-|•|-+*+-|•|-+*

پرسیار: ئایا موسڵمانی بیدعەچی(المبتدِع)[1] بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت؟!.

---

(1) (المبتدع): مرۆڤی بیدعەچی، ئەو موسڵمانەیە کە بەتەنها مەبەستی خوا پەرستییە، بەڵام خوا پەرستنەکەی بەو شێوەیە نیە کە خوا دایناوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ واتە بۆ زیاتر لە خوا نزیك بوونەوە چەندان شتی داهێناوە لە خوا پەرستنیدا، کە ئیزنی پێغەمبەری ﷺ لەسەر نیە. وە هەر شتێکیش بۆ خوا بکرێت، بەڵام خوا دای نەنابێت لە ڕێگای پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ ؛ ئەوە بیدعەیەو داهێنراوە (مُحدَثْ)، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییەو ڕەت کراوەیەو قەبوڵ نابێت. چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن عملَ عملاً ليس عليه أمرنا فهو رَدّ) صحيح مسلم: واتە هەر کەسێك عیبادەتێك بکات ئەمری ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە ڕەت کراوەیە. وە فەرموویەتی ﷺ : (إيّاكم و محدثات الامور فإن كل محدثة بدعة). واتە: خۆتان بپارێزن لەو عیبادەتە داهێنراوانە چونکە هەموو عیبادەتێکی داهێنراو (بیدعەیە) و (كل بدعةٍ ضلالة، وكل ضلالةٍ في النار) وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییەو هەموو گومڕاییەکیش بۆ ناو ئاگرە.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ـ بەیارمەتی خوا ـ دەڵێم:

بیدعەچی لە گومڕایی دایەو، تاوانی بیدعەکەی زۆر گەورەیە، هەرچەندە خۆیشی هەستی پێ نەکات، بەڵام ئەگەر نیەتی خالص بێت بۆ خواو، تەنها خوا پەرست بێت واتە (مُوحِّد) بێت؛ ئەوە ـ إن شاء الله ـ بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت، ئەگەرچی شایستەی چوونە ناو ئاگریش بێت و بشچێتە ناویەوە. دوایی پەروەردگار هەر دەیهێنێتەوە دەر بۆ ناو بەهەشت بەهۆی تەوحیدەکەی و شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ و فریشتە و بڕواداران. چونکە هەر کەسێك شەریکی بۆ خوا پەیدا نەکردبێت، واتە تەنها خوا پەرست بووبێت ئەوە ـ إن شاء الله ـ بەر شەفاعەت دەکەوێت، وە ئەگەر بشخرێتە ناو دۆزەخ هەر دێتە دەرەوەو شەفاعەتی بۆ دەکرێت. بە بەڵگەی چەندەها حەدیسی ڕاستی(صەحیحی) پێغەمبەر ﷺ. بەڵام بیدعەچی لە شوێنێکدا ڕێگا نادرێت شەفاعەتی بۆ بکرێت، ئەویش کاتی ڕۆیشتنی موسڵمانانە بۆ سەر حەوزی (الكوثر). لەو شوێنەدا بیدعەچیەکان ڕێگەیان لێ دەگیرێت و دەگێردرێنەوە دواوەو قەدەغە دەکرێن لە چوونە سەر ئەم حەوزەی پێغەمبەر ﷺ ، وە ناهێڵرێت شادبن بەخواردنەوەی ئاوەکەی، وەکە پێغەمبەر ﷺ دەبینێت دەگەڕێنرێنەوە، نازانێت ئەمانە بیدعەچی بوون؛ بۆیە دەیەوێت شەفاعەتیان بۆبکات بۆ هاتنەسەر حەوزەکەی، بەڵام ڕێگای پێنادرێت تکایان بۆ بکات و پێی دەوترێت: تۆ نازانیت ئەمانە دوای تۆ چیان داهێناوە لەم دینەدا بەناوی دینەوە، ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: دوورکەوتنەوە بۆ ئەو کەسانە بێت کە دوای من دینەکەیان گۆڕیوەو شتیان لێ زیادکردووەو داهێناوە، با دووربخرێنەوەو هەر دووربن !!.

پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێکدا فەرمووی: (هل تدرون ما الكوثر ؟ هو نهرٌ أعطانيه ربي في الجنَّة، عليه خيرٌ كثيرٌ، تَرِدُ عليه أمتي يوم القيامة، آنيته عدد الكواكب، يُختلجُ العبدُ فأقول: يارب إنَّه من أُمّتي. فيقال إنّك لا تدري[1] ما أحدثوا بعدك) (فأقول سُحقاً). فأقول كما قال العبد الصالح:

(1) ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر بەدرۆ هێنانەوەی ئەو نەفامانەی کە عاشقی شیرك و بیدعەن و دژی تەوحیدو سوننەتن: کە دەڵێن: ((ئەی لاوی موسڵمان: ئەوەش بزانە، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ژیانێکی بەرزەخی تەواوتری هەیە، بە جۆرێکی وەها: بەردەوام ئاگاداری کردارو، گوفتاری ئوممەتی خۆیەتی!!)) بڕوانە((چەند گوڵێك لە گوڵزاری ئیسلام))(ل:٧٤).

﴿ وكنتُ عليهم شهيدا مادمتُ فيهم فلما توفيتَني كنتَ أنتَ الرقيبَ عليهم وانت على كل شـيء شهيد. إن تعذهم فإنهم عبادك وإن تغفر لهم فإنك أنت العزيز الحكيم ﴾، فيُقال لي لم يزالوا مرتدين على أعقاهم مذ فارقـتَهم ))[1] .

**کەواتە: موسڵمانی ژیر، ووردبەوەو بزانەکە هەر کەسێك لە دونیا لە خوا پەرستینیدا شوێن سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ نەکەوێت ئەوا لە قیامەت لە زەرور ترین کاتدا کە پێویستی بەئاو هەیە تینوێتی پێ بشکێنێ، بەتایبەتیبە ئاوی (کوثر) کە شیرین تره لە هەنگوین و سپی تره لە شیر، ـ لەو کاتەدا مەحرۆم دەبێت لە خواردنەوەی ئاوی ئەو ڕوبارەی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ.**

**وە پێغەمبەریش لە جیاتی شەفاعەت بۆ کردن، دوعای لێ دەکات و دەفەرموێت: (سُـحقاً) واتە: هەر بادوور کەوێتەوە. چونکە لە دونیا دوور بوو لە سوننەتی من!!.**

---

(1) (صحيح مسلم و صحيح الجامع الصغير وزيادتُهُ)٠ (ارتد كثير ممن أسلم ورأى النبي ﷺ لمرة واحدة من اهل عام الوفود .. والنبي ﷺ يعرفهم بهذا الوصف . ثم حصلت الردة ومات كثير منهم مرتدا . فيجيئون على الحوض وتردهم الملائكة الى النار .. وهذا ردٌّ على الذين يسبّون أبا بكر وعمر وخيار الصحابة ويقولون بأن كثيرا منهم سيدخل النار، بَيْد أنهم لايعترفون الا ببضعة من الصحابة فقط والباقي يعتبروهم منافقين مرتدين. والحاصل أن قول رسول الله ﷺ في الحديث (أصحابي) إشارة إلى المرتدين الذين حارهم أبو بكر الصديق رضي الله عنه ، وكانوا حديثي عهد بالاسلام على التفصيل الذي ذكرناه آنفا، وليس معناه الصحابة الأجلاء امثال أبي بكر وعمر وعثمان وعلي وحمزة وخالد والقعقاع وغيرهم).

وفي هذا الحديث تصريح بأن النبي ﷺ لا يعلم ما صار إليه حال أصحابه الذين أسلموا على يديه بنص الحديث (( إنك لاتدري ما أحدثوا بعدك)). فحين رآهم عرفهم بأنهم اصحابه عام الوفود فحين اخذهم الملائكة أخذ ينادي (ياربي أصحابي)، بالله عليكم لو كان يعلم وهو ميت حال أصحابه ألم يعلم أن هؤلاء ارتدوا بعده؟... ثم انظر إلى استشهاده ﷺ بالآية ومعنى ذلك انه ﷺ يُقِرُّ أن شأنه في ذلك كشأن أخيه عيسى عليه السلام؛ كان شهيدا عليهم مدة حياته ولكن بعد وفاته انقطعت مشاهدته وعلمه بهم وأن الله تعالى وحده كان هو الرقيب عليهم . فهلا آب عباد القبور الى رشدهم !!!.

## زیادە زانیارییەك لەبارەی شەفاعەتەوە

بۆ ئەوەی زیاتر بابەتی شەفاعەت تێ بگەین و هیچ نەفامێك و گومڕا کەرێك بوهتان بەناوی ئێمە نەکات و نەڵێت: نوسەری ئەم کتابەو هاو بیروڕاکانی لە ئەهلی سونەت باوەڕیان بە دوعاو شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ نیە. بۆ ئەوەی بە هەڵە موسڵمانان حاڵی نەکرێن لەو بیروڕایەی کە هەمانە، بەگوێرەی قورئان و سوننەت و تێگەیشتنی زانایان ـ لەبەر ئەوە دەڵێم: ئێمەی ئەهلی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ، و هاوەڵانی ـ ڕەزای خوایان لێ بێت ـ باوەڕی ڕاست و دروست و تەواومان هەیە بە دوعاو شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ، وە هەروەها دوعاو شەفاعەتی فریشتەو براوادارانیش، بەو شێوەیەی کە لە حەدیسی (صحیح) دا هاتووە:

پێغەمبەر ﷺ باسی ڕۆژی قیامەتمان بۆ دەکات، کە شەفاعەتکاران شەفاعەت دەکەن بۆ ئەو موسڵمانانەی دەچنە ناو دۆزەخەوە، بۆ هێنانە دەرەوەیان. وە پەروەردگاریش شەفاعەتیان قەبوڵ دەکات. وە دوایی بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی ئەوانە دەردەهێنێت کە بەر شەفاعەت نەکەوتوون لە ئەهلی تەوحید. وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

﴿ فيقول الله تعالى: شفعتِ الملائكةُ وشَفَعَ النبيّون، وشفع المومنون، ولم يبق إلا أرحم الراحمين، فيقبض قبضةً من النار فَيُخرِجُ منها قوماً لم يَعْمَلوا خيراً قَطّ ﴾[1].

وە هەروەکو چۆن باوەڕمان بەوە هەیە کە لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی دەچن داوا لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەکەن شەفاعەتیان بۆ بکەن و، شەفاعەت هەیە لەو ڕۆژەدا. بەهەمان شێوەش باوەڕی تەواویشمان هەیە بە شەرعیەتی داواکردنی دوعای خێر لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان تا لە ژیانی دونیادا مابن و نەمردبن، بۆ تێکڕای موسڵمانان. وە چەندان بەڵگە هەیە[2] لەسەر شەرعیەتی ئەم داوای دوعا کردنە ـ لەچاکەکارانی زیندوو، کە بچیتە لایان و داوایان لێ بکەیت دوعا بۆ موسڵمانان بکەن. نەك داوا لە پیاوچاکان بکەیت لە دوورو بێ ئاگاییانەوە.

---

(1) صحيح البخاري.

(2) بڕوانە بەشی التوسُّل کە لەوێ ئەثەری عومەری کوڕی خەتتاب و موعاویەمان ﷺ باس کردووە.

# دوو وەسیلەی شەرعی بۆ بەختەوەر بوون بە شەفاعەت

دوای ئەوەی كە تێگەیشتین: داوای شەفاعەت بۆكردن لە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاكان دوای مردنیان، دەبێتە ڕێگری شەفاعەت بۆ كردن.

وە زانیمان تەنها موسڵمانی تەنها خوا پەرست (الْمُوحِّد) شەفاعەتی بۆ دەكرێت.

بابزانین ئایا هیچ وەسیلەیەكی زیاتر هەیە كە بیگرینە دەست و ببێتە مایەی بەختەوەر بوون بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ ؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: بەڵێ، ئەگەر بڕواداری تەنها خوا پەرست ئەم دوو وەسیلەیەی داهاتوو بگرێتە دەست ئەوە ـ إن شاء الله ـ بە دڵنیاتر بەختەوەر دەبێت بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ :

١. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(من قال حين يسمع النداء: اللهمّ رَبّ هذه الدعوةِ التامّة والصلاةِ القائمة آتِ محمداً الوسيلة والفضيلة، وابْعَثْهُ مقاماً محموداً الذي وعَدْتَهُ حَلّت له شفاعتي يوم القيامة)[1].

واتە: هەركەسێك دوای بانگ بیستن[٢] بڵێت: (اللهمّ رَبّ هذه الدعوةِ التامّة والصلاةِ القائمة آتِ محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثهُ مقاماً محموداً الذي وعدْتهُ) ئەوە بەر شەفاعەتی من دەكەوێت و، خوا دەمكاتە شەفاعەتكاری.

٢. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

---

(1) صحيح البخاري ـ ١٦٤ .

(2) تێبینی (١): ئەم دوعایە دوای بانگە، وەك لە حەدیسەكەدا دەفەرموێت (من قال حين يسمع النداء) وە دروست نیە قیاسی قامەت بكرێتە سەر بانگ ودوای قامەتیش بگوترێت!.

تێبینی (٢): لەم دوعایەدا سێ بڕگە زیاد كراون كە بەڕاستی لە حەدیسەكەدا نەهاتوون:

١ـ بڕگەی: (والدرجة الرفيعة العالية) دوای (الوسيلة والفضيلة) .

٢ـ بڕگەی: (وارزقنا شفاعته وزيارته) لە دوای (وعدتَهُ) .

٣ـ بڕگەی: (إنّك لا تخلف الميعاد) لە كۆتاییدا .

ئەم سێ بڕگەیە لە حەدیسەكەدا نیە بە (صحيحی) . وە پابەند بوون بە خودی حەدیسەكە پێویستەو باشترە، لە زیاد كردن لەسەری. چونكە دوعایە؛ دوعاش عیبادەتە؛ عیبادەتیش بەگوێرەی بەڵگەیە ، نەك هەوای نەفس و عەقڵ و تەقلیدی كوێرانە .

(من صلّى عليَّ حين يُصبِحُ عشراً، وحين يُمسي عشراً، أدركَتْهُ شفاعتي يوم القيامة)[1].

**واتە: هەر كەسێك كە بەیانی كردەوە (١٠) جار، سەڵاوەت بدات لەسەر من، وە كە ئێوارەشی كردەوە (١٠) جار، ئەوە شەفاعەتی منی گەیشتۆتێ ڕۆژی قیامەت[2].**

**كەواتە: موسڵمانی تەنها خواپەرست، سەرەڕای تەوحیدەكەت، كە بناغەی ئیسلامەتیتە، ئەم دوو سەبەبەش بگرە دەست، بۆ ئەوەی بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ بكەویت. بەڵام وریابە، نەكەیت ڕێگەیەكی داهێنراو بگریتەبەر، بە نیازی بەختەوەر بوون بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ.**

*** *** *** *** ***

## نێستا دەڵێین:

## كێ دینێكی تازەی داهێناوەو، دینی دێرینی ئیسلامی وەلاناوە ؟!.

**موسڵمانی شوێن كەوتەی قورئان و سوننەت، دوای ئەوەی جیاوازی نێوان (شەفاعەتی شیركی و شەفاعەتی شەرعی)ت بۆ ڕوون بۆوە. وەزانیت كێیە داوای شەفاعەتی شیركی دەكات، وە كێشە داوای شەفاعەتی شەرعی دەكات. وە بۆت دەركەوت كێ بێ بەش دەبێت لە شەفاعەت لە ڕۆژی دوایی و، كێش بەختەوەر دەبێت بە شەفاعەت و، شەفاعەتی بۆ دەكرێت. وە زانیت جیاوازی چییە لە نێوان (التوسل الشرعي) وە (التوسل البدعي)وە (التوسل الشركي). وە زانیت كامەیە ڕێگای لە خوا نزیك بوونەوە.**

**كەواتە ئێستا زۆر ئاسانە لات ئەهلی باتڵ و، ئەهلی حەق لێك جیا بكەیتەوە لە دەوروبەرت وە بزانیت كێیە بەڕاستی شوێن كەوتەی پێغەمبەر ﷺ و، دەستی گرتووە بەحەق و،**

---

(1) صحيح الجامع الصغير وزيادته .

(2) لەم حەدیسەدا دەردەكەوێت كە سوننەت وەهایە، هەركەسەی خۆی بەتەنها سەڵاوەت لێ بدات بەیانیان و ئێواران، نەك بە كۆرس و كۆمەڵ، بە دەنگی بەرز لە مزگەوتەكاندا !.

لەسەر دینە دێرینەکەی ئیسلام ماوەو، لە ڕێگەی ئەو باب و باپیرانەی لای نەداوە کـە ئـەهلی عیلم بوون و دەستگرتوو بوون بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ .

وە دەشزانیت کێ لای داوە لـە ڕێگـای ڕاسـتی بـاب و بـاپیران و زانـاو پێـشەوایان و چـوار ئیمامەکان و، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ﷺ!!. وە ئەوکاتە دەزانی کێ دینی تـازەی داهێنـاوەو، سەری لەخەڵك شێواندووەو، گومڕای کردون و، پارچە پارچەی کردوون !!:

ئایا ئەو کۆمەڵە گەنج و لاوە بڕواداران، کە وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ إنهم فتية آمنوا بربهم وزدناهم هدىً، وربطنا على قلوبهم إذ قاموا فقالوا: ربنا ربُّ السماوات والأرض لن ندعوا من دونه إلها؛ لقد قلنا إذا شططا﴾ الكهف: ١٢.

واتە: ئەوانە کۆمەڵە لاوێکن، باوەڕیان هێناوە بەخوا کە تەنها ئەو شایستەی پەرستن و، دڵ پێ بەستن و، ئومێد پێ بوون و، ئیعتیقاد پێ بوون و، پشت پێ بەسـتن و، لێ ترسـان و، هـاوار بۆکردن و، بەگەورە دانان و، خۆش ویستن و، زەلیلی بۆ نواندن و، داوای یارمەتی لێ کردن و، لە پێناودا تێ کۆشان و، سەربڕین بۆ کردن و، ماڵ لە پێناو بەخشینە، کۆمەڵە لاوێکـن ئـاوا بـە تەوحیدی باوەڕیان هێنا بوو بە پەروەردگاریان. وە ئێمەش ـ واتە پەروەردگار ـ هیدایـەت و ڕێ نمونیمان بۆ زیـاد کـردن. وە دڵـەکانیانمان پتـەوکرد لەسـەر حـەق و تەوحیـدو ئازایـەتی. وە نەترسانمان پێ بەخشین بە شێوەیەکی وا کە ڕاست بوونەوە ڕوو بەڕوی سەرکردە موشریکەکەیان و، عەقیدەی تەوحیدی خۆیان بە شانازیەوە خستەڕوو و وتیان: پەروەردگاری ئێمە پـەروەردگاری هەموو ئاسمانەکان و زەویە. کەواتە تەنها ئەو پەرستراو (إله)ی حەقـەو شایستەی پەرسـتن بـۆ کردن و هاوار بۆ کردنە؛ بۆیە ئێمەی ئەهلی تەوحید ﴿ لَنْ ندعو من دونه إلهاً ﴾. واتە: غەیری ئەو پەروەردگارە هاوار ناکەینە هیچ پەرستراوێکی ترو، پەرستنی بـۆ ناکـەین؛ چـونکە ئەگـەر هاوار بکەینە غەیری ئەو پەروەردگارە، ئەوە: ﴿ لقد قُلْنا إذاً شططاً ﴾ واتـە: قـسەیەکی زوڵـم و پێچەوانەی ڕاست و لە حەق دەرچوومان کردووە.

ئا بەم شیوەیە پەروەردگار بیروباوەڕی ئەو گەنجانەی باس کردووەو، خۆیشی لـەوە لێیـان ڕازی بووە. جا ئایا ئەو کۆمەڵە گەنجەی کە ئەمە عەقیدەکەیان بوو، وە پەروەردگار پەسندی کردبون، ئایا ئەمانە لەسەر حەق و دینی ئیسلامن، یان ئەو خەڵکە نەفامانـەی کـە شـەریك بـۆ خـوا دادەنین لە پەرستنداو، هاوار دەکەنە غـەیری خـوا؛ وەك پـەروەردگار وەسـفی ئەوانیـشمان بـۆ

ده‌كات: ﴿هَؤُلاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً لَوْلا يَأْتُونَ عَلَيْهِمْ بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً؟!﴾ الكهف:١٥.

واته‌: ئه‌و قه‌ومه‌ی ئێمه‌ له‌غه‌یری خوا چه‌ند په‌رستراو(ئالیهه‌)ێكی تریان بۆ خۆیان داناوه‌، هاواریان ده‌كه‌نێ و، داوای یارمه‌تی و په‌نادان و پاراستن و به‌ فریاكه‌وتنیان لێ ده‌كه‌ن و، ماڵ و سامانیان له‌ پێناودا ده‌به‌خشن و، ئیعتیقادیان پێیانه‌و، لێیان ده‌ترسێن و، به‌ گه‌وره‌یان داده‌نێن و، زه‌لیلییان بۆ ده‌نوێنن !!.

به‌ڵام بۆچی به‌ڵگه‌یه‌كی ڕوون و ڕاست ناهێننه‌وه‌ له‌سه‌ر شه‌رعیه‌تی دانانی ئه‌م په‌رستراوانه‌و داوای به‌فریاكه‌وتنیان لێیان ؟![1]

وه‌ بێگومان هاوبه‌شی په‌یداكه‌رانی كۆن و تازه‌ش هیچ به‌ڵگه‌یه‌كیان پێ نیه‌ له‌ شوبهه‌ زیاتر. كه‌واته‌ ئه‌و دینه‌ داهێنراوو تازه‌یه‌ كه‌ ئه‌وانی له‌سه‌رن و، به‌ناوی ئیسلامه‌تی‌یه‌وه‌ ده‌یكه‌ن و، ده‌ڵێن: واسیته‌ دانان و، شه‌فاعه‌ت دانان له‌نێوان خۆمان و خوادا به‌ئه‌مری خوایه‌ ـــ به‌بێ به‌ڵگه‌ش وا ده‌ڵێن ـ . كه‌واته‌ ئه‌مانه‌ درۆ به‌ناوی خواوه‌ ده‌كه‌ن و، بوهتانی بۆ ده‌كه‌ن و، دینێكی تازه‌یان داهێناوه‌. وه‌ كه‌سیش له‌وه‌ زاڵم تر نیه‌ كه‌ درۆ به‌ناوی خواوه‌ ده‌كات و، شتێك به‌ دینی خوا داده‌نێت كه‌ خوا به‌ دینی دانه‌ناوه‌و فه‌رمانی پێ نه‌كردووه‌.

جا ئه‌مه‌یه‌ عه‌قیده‌و دینی ئه‌م خه‌ڵكه‌ نه‌فامانه‌ی كه‌ دژایه‌تی خوا به‌ ته‌نها په‌رسته‌كان ده‌كه‌ن. خۆیان شه‌ریكیان بۆ خوا داناوه‌ به‌بێ به‌ڵگه‌و، درۆیان به‌ناوی خواوه‌ كردووه‌و، دینێكی

---

(1) تێبینی: به‌ڵگه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ دوو سیفه‌تی تێدا بێت:

یه‌كه‌م: ڕاست بێت واته‌ یان ئایه‌تێكی قورئان بێت كه‌ هه‌مووی ڕاسته‌. وه‌ یان حه‌دیسێكی(صحیح) بێت؛ به‌ڵام حه‌دیسی هه‌ڵبه‌ستراو به‌ناوی پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ ﷺ یان حه‌دیسی لاواز(ضعیف) به‌ڵگه‌ نیه‌و قه‌بوڵ نیه‌.

دووه‌م: پێویسته‌ ئه‌و قه‌وڵه‌ ڕاسته‌ كه‌ ئایه‌تێكی قورئان یان حه‌دیسێكی (صحیح)ـه‌، ڕوون و ئاشكراو (صریح)یش بێت له‌سه‌ر ئه‌و بابه‌ته‌ی به‌ڵگه‌كه‌ی بۆ هێنراوه‌ته‌وه‌. چونكه‌ با قه‌وڵه‌كه‌ ڕاستیش بێت، به‌ڵام كه‌ به‌ ڕوون و ئاشكرا باسی ئه‌م بابه‌ته‌ نه‌كات؛ ئه‌وه‌ به‌ شوبهه‌ داده‌نرێت نه‌ك به‌ به‌ڵگه‌.

وه‌ كه‌ سه‌یری قسه‌كانی گۆڕپه‌رست ونه‌فامه‌كان بكه‌ین، ده‌بینین هیچ به‌ڵگه‌یه‌كیان پێ نیه‌. چونكه‌ قسه‌كانیان یان ڕاست (صحیح) نین، به‌ڵكو حه‌دیسی (ضعیف وموضوع)ن، وه‌یان ڕاستن به‌ڵام ئاشكراو ڕوون(صریح)نین! و، ڕاسته‌وخۆ په‌یوه‌ندیان نیه‌ به‌م بابه‌ته‌ی كه‌بۆی هێنراوه‌ته‌وه‌، به‌ڵگه‌ نیه‌ له‌سه‌ری به‌ڕوونی، به‌ڵكو:(كلمةُ حق أريد بها الباطل): واته‌ قسه‌یه‌كی حه‌قه‌و بۆ مه‌به‌ستێكی ناحه‌ق به‌كار هێنراوه‌. كه‌واته‌ خاوه‌نی شوبهه‌ن ، نه‌ك به‌ڵگه‌ !.

تازەیان هێناوەو، كەس لە ئەوان زاڵم تر نیە، وەك پەروەردگار فـەرمووی:﴿ فمن أظلــم ممَّــنِ افترى على الله كذباً ﴾. واتە: كێ زاڵم ترە لەو كەسەی درۆ بـەناوی خـواوە دەكـات و، شـتێك بەناوی خواوە دەڵێت كە خۆی نەیفەرمووە؟!.

وە سەرەڕای ئەم هەموو ڕوون كردنەوەیەش گۆڕپەرستان هەر وازناهێنن لە دینـە داهێنـراوە تازەكەی خۆیان، وە لە پێناوی دینەكەشیاندا چەندان شوبهەی تـر بـڵاو دەكەنـەوە، بـۆ ئـەوەی خەڵكی سادەو ناتێگەیشتوی پێ ڕاو بكەن، بەڵام بە پشتیوانی خوا بە بەڵگەی حەق لە قورئان و سوننەت، یەك لە دوای یەك هەموو شوبهەو درۆكانیان هەڵدەوەشێنینەوە ـ إن شاء الله ـ.

ئێستاش بەرەو شوبهەیەكی تریان:

# شوبهەی سیانزەهەم تا شانزەهەم

## ١٣- قیاسی مردوو بۆ سەر زیندو !.

شەخس پەرستان دەڵێن بە بەڵگەی قورئـان شـەهید دوای شـەهید بوونیـشی هـەر بەزینـدوو دادەنرێت، وە پێغەمبەرانیش لە شەهیدەكان پلەیان بـەرزترە كـەوابوو ئـەوانیش زینـدوون، وە كـە زیندووش بن ئەو هیچ مانعێك نییە لە داوا لێكردنیان و كردنیان بە واسیتە بۆ لای خوا !.

### وەڵامی ئەم شوبهەیەش:

تەنها ئێمەی ئەهلی سـوننەت و جەماعـەت بـە ڕاسـتی شـوێن كەوتـەی بەڵگـەین: چـونكە هەرشتێك بوونی هەبێت بـە گـوێرەی بەڵگـە؛ ئـەوە ئێمـەش ئیعتیقادمـان بـە بـونی هەیـە. وە هەرشتێكیش بە بەڵگەی شەرعی دروست نەبێت؛ ئەوە ئێمەش بە دروستی نازانین:

كەواتە ئەگەر سەیری ئەم شوبهەیەی شەخس پەرستان بكەین بە گـوێرەی بەڵگـەی شـەرعی؛ ئـەوە دەبینین بەشی یەكەمی قسەكەیان كە كردویانە بە پێشەكی بۆ نەتیجەكەی بەشی دووەمی قسەكەیان ـ تەنها ئـەو پێـشەكییە ڕاسـتەو بەڵگـەی لەسـەرە، كـە پێغەمبـەران و شـەهیدان زینـدوون لـە نـاو گۆڕەكانیاندا، بەڵام زیندووی ناو گۆڕ (الحیاة البرزخیة) نەك زیندووی دونیا وەك پێش مردنیان.

چونكە گومان نییە لەوەی كە ئەوان مردوون لە سەر دونیا، وە مردوو و زیندوو لێك جیاوازن:

جا ئەگەر زیندوێتییان وەكو دونیـا بوایەو بە مردوی دونیـا حیساب نەكرابان؛ ئەوە خوای گەورە حەڵاڵی نەدەكرد ئافەتانی شەهیدان شوو بكەنەوە. وە نەدەبوو میراتیان دابەش بكرێ، وە نـە دەبـوو بنێژرێن، وە نەدەبوو لە جومعەو جەماعەت دابڕێن وە...وە...هتد.

بەڵام كە سەیری قورئان بكەین، ئەوە بەئاشكرا دەبینین جیاوازی كردووە لە نێوان زیندوو و مردوودا:

[وما يستوي الأحياء ولا الأموات. إن الله يُسمعُ من يشاء وما أنت بمُسْمِعٍ من في القبور] الفاطر: ٢٢.

وە قورئان پێغەمبەرﷺ شەهیدان وگشت مردوانی بە مردوو داناون:

[إنك ميّت وإنهم ميتون] الزمر ٣٠.

كەواتە هەركەسێ گومانی لەوە هەبێت، ئەوە توشی كوفر بووە.

وە هەركەسێ وابزانێت ژیانی ناو گۆڕ بریتییە لە هەمان ژیانی دونیا، ئەوە نەفامەو پشت هەڵكردووە لە قورئان و سونەت.

جا كە زانیمان جیاوازی هەیە لە نێوان مردوان و زیندوانی دونیا؛ ئەو كاتە دەردەكەوێت كە نابێت قیاسی مردوو بكرێتە سەر زیندوو، وە نابێت ئەو حوكمانەی زیندوو هەیەتی، بۆ مردوش دابنرێن.

كەواتە لە دونیا تاوەكو پێغەمبەرﷺ لە ژیاندا بوو، دروست بوو موسڵمانان چوبانە لای، وە داوای دوعاو شەفاعەتیان لێ كردبا، بەڵام دوای مردنی ئەوە دروست نییەو بە شیرك دادەنرێت، وە لەبەر ئەوە هاوەڵە بەڕێزەكانی كاری وایان نەدەكرد.

بەڵام شەخس پەرستان كە بەڵگەی شەرعیان بە دەستەوە نەبوو، ئەوە پەنا دەبەنە بەر شوبهەو شتی لاوازو هەڵبەستراو. وە بۆ بە شەرعی دانانی داواكردن لە مردوان قسەیەكی هەڵبەستراوو درۆیان بەدەستەوەیە كە لای خەڵی نەزان بەحەدیسی دادەنێن، كە گوایە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((إذا أعيتكم الأمور فعليكم بأصحاب القبور)).

واتە: كە شتتان لێ قورس بوو، ئەوە پەنا بەرنە بەر مردوانی ناو گۆڕستان !.

ئەمەش هەڵبەستراوو هیچ زانایەك گومانی لەوەدا نییە كە دانراوی زندیقە كافرەكانە.

بەڵام بەداخەوە دەبینین خەڵكی نەفام واز دەهێنن لە بەڵگەی شەرعی و دەكەونە شوێن شوبهەو درۆو دەلەسە؛ لەبەر ئەوە ئیعتیقادیان وایە كە مردوەكان گوێ بیستی پاڕانەوەو داواكاریەكانیان دەبن، وە ئاگایان لە حاڵی خەڵكی دونیایە، وە دەشتوانن وەڵامیان بدەنەوە؛ جا سەربەخۆو ڕاستەوخۆ خۆیان داواكاریەكانیان بۆ جێ بەجێ بكەن، یان وەكو واسیتەیەك دەور ببینن و ئەو كارەیان لای خوا بۆ بكەن!!.

وە ئەم ئیعتیقادەش كوفرو گومڕاییە چونكە:

١. قورئان ڕوونی كردۆتەوە كە مرۆڤ دوای مردنی گوێ بیستی داوای خەڵكی دونیا نابێت:

[إِنَّكَ لا تُسْمِعُ الْمَوْتَى وَلا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ](النمل:٨٠).

[وَمَا يَسْتَوِي الأَحْيَاءُ وَلا الأَمْوَاتُ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَنْ يَشَاءُ وَمَا أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُورِ] (فاطر:٢٢).

٢. وە هەروەها پێغەمبەران و پیاوچاكان لە ژیانی دونیاشیان گوێبیستی داواكاری كەسانی غایب و دوور نەدەبوون چجای دوای مردنیان. بۆ نمونە كە یەكێك داوای دوعای لە پێغەمبەر ﷺ

**کردبایە ئەوە دەهاتە لای خۆی ئەوکاتە داوای دوعا بۆکردنی لێ دەکرد، نەك لە دوورەوە. کەواتە ئەی چۆن دوای مردنیان خەلکی هەریەکە لە شوێن و وڵاتی خۆیەوە داوایان لێ دەکەن هەر کەسە بە زمانی خۆی ؟! . خۆ ئەوان غەیب زان نین.**

**وە الإمام الآلوسي المفسِّر لە تەفسیرەکەیدا** ((روح البيان)) (٦/١١٥) **فەرموویەتی:**

(( ولا أرى أحداً ممن يقول ذلك إلاّ وهو يعتقد أن المدعوَّ الحيَّ الغائب، أو الميِّت المغيب: (١) **يعلم الغيب**، (٢) **ويسمع النداء**، (٣) **ويقدر بالذات أو بالغير على جلب الخير أو دفع الأذى**، وإلاّ لَما دعاه، و لما فتح فاه. **وفي ذلكم بلاء من ربكم عظيمٌ** )).

**تێبینی: داواکردن لە غەیری خوا لە پێغەمبەران و پیاو چاکانی مردوو یان غایب، لە بەر دوو ڕوانگە دروست نیيە چونکە:**

**٣. داوای یارمەتی و هاوار لێ کردن پەرستنەو پەرستنیش تەنها بۆ خوا دەکریت، ئەگینا تووشی شیرك دەبیت.**

**٤. وە هەروەها غایب و مردووش هاوارو داوای خەلکی نابیستن و ئاگایان لێ نیيە. وە ئەگەر واشی دابنێین ـ گریمان ـ کە دەبیستن خۆ توانای وەڵام دانەوەیان نیيە!.**

**وە ئەگەر بەهۆی بە هەڵە حاڵی بوون لە هەندێ بەڵگەی حەدیس کەسانێك وا بزانن کە مردووەکان دەبیستن، ئەوە هەر نابێتە بەلگە لەسەر ئەوەی کە هاوار بکەینە مردوان، چونکە وەك لە خاڵی یەکەمی پێشەوە باسمان کرد ئەو کارە شیرکەو دروست نیيە.** [1]

---

(1) وە بۆ زیاتر دڵنیا بوون لە خاڵی دووەم زۆر سوودمەند دەبیت کە بڕوانیتە کتابی:

((الآيات البينات في عدم سماع الأموات)) العلامة نعمان ابن المفسِّر الشهير محمود الآلوسي.وە لە پێشەکی ئەو کتابەدا شێخ ئەلبانی فەرموویەتی: [وخلاصة البحث والتحقيق: أن الأدلة من الكتاب والسنة وأقوال أئمة الحنفية وغيرهم ـــ كما ستراه في الكتاب مبسوطاً ـــ على أن الموتى لايسمعون، وأن هذا هو الأصل ، فإذا ثبت أنهم يسمعون في بعض الأحوال كما في حديث خفق النعال، أو أن بعضهم سمع في وقت ما كما في حديث القليب ، فلا ينبغي أن يُجعل ذلك أصلاً ، فيقال إن الموتى يسمعون كما فعل بعضهم، كلا، فإنها قضايا جزئية، لا تشكل قاعدة كلية يُعارض بها الأصل المذكور، بل الحق أنه يجب أن تستثنى منه، على قاعدة الاستثناء الأقل من الأكثر، أو الخاص من العام، كما هو المقرر في علم أصول الفقه، ولذلك قال العلاّمة الآلوسي في((روح المعاني )) بعد بحث مستفيض في هذه المسألة (٦/٤٥٥) : (( والحق أن الموتى يسمعون في الجملة، فيُقتصر على القول بسماع ما ورد السمع بسماعه)) ].

**وە شێخ الاسلام ابن تيميە دەفەرموێت:**

((وكذلك الأنبياء والصالحون. وإن كانوا أحياء في قبورهم، وإن قُدِّر أنهم يدعون للأحياء، فليس لأحد أن يطلب منهم ذلك، و لم يفعل ذلك أحد من السلف، لأن ذلك ذريعة إلى الشرك بهم وعبادتهم من دون الله تعالى)) مجموع الفتاوى: ١/٣٣٠.

وقال ابن حجر آل بوطامي الشافعي:

– قولهم (( لا فرق بين الاحياء والاموات في جواز التوسل والاستغاثة وما يثبت لأحدهما يثبت للاخر وقد ثبتت حياة الانبياء في قبورهم لأنهم أعلى مقاما من الشهداء ، والشهداء بنص القرآن أحياء عند ربهم يرزقون فجاز التوسل بهم وبالشهداء والأولياء )) .

الرد عليهم : هذا القول مصادم لنص القرآن الكريم (( وما يستوي الاحياء ولا الأموات ان الله يسمع من يشاء وما أنت بمسمع من في القبور )) فاطر ٢٢ .

ويقول الله تعالى (( فإنك لاتسمع الموتى ولاتسمع الصم الدعاء اذا ولوا مدبرين )) الروم ٥٢.

فما أجهله من استدلال للمتوسلين بالأموات ... فإذا كانوا هم أحياء فلماذا تعتد نساؤهم ولماذا توزع مواريثهم ولماذا لا نصلي خلف قبر النبي ﷺ اقتداءا به اذا كان حيا الحياة التي يفهمها المتوسلون بالذوات.

**واذا جاز لنا ان نستغيث بهم بعد موتهم لانهم أحياء لماذا لانستغيث اذاً بالملائكة والحور العين والولدان ومالك خازن النار ورضوان خازن الجنة وغيرهم من الملأ الاعلى أليسوا هم أحياء أيضا؟.**

وهل حياة الشهداء هي مثل حياتنا على الارض والتي نحكم بها بان الذي على الارض حي .... وهل ان الذي يقول بان الشهيد ميت يعتبر مخالفا لنص القرآن ويكفر، لان القرآن يقول انهم احياء عند ربهم يرزقون. وهل الذي يقول ان النبي ﷺ ميت يعتبر مخالفا للصواب ، لأن الأنبياء أحياء في قبورهم ، ولماذا اذا قال تعالى (( انك ميت وانهم ميتون ))

**ولماذا قال رسول الله ﷺ ما من أحد يُسَلم علي الا رد الله عليّ روحي حتى أرد عليه السلام ) رواه ابو داوود باسناد صحيح ،..أليس رد الروح يكون بعد الموت ؟**

والصواب ، أن جميع الأموات أحياء حياة برزخية ولكن الله خص بعض الأموات كالشهداء بالذكر بصفة الحياة تمييزا وفضلا لهم في حياتهم البرزخية عن غيرهم من الاموات، وليس معناه انهم احياء يعلمون مثل ما يعلم الذي على ظهر الارض من امور الدنيا واحوالها وحياتهم البرزخية هذه لا تنقلهم من صفة الاموات الى صفة الاحياء. إ. هـ.

## ١٤-شوبهەیەکی تریان لەسەر بۆچونە شیرکیەکەیان بریتیە لە:

غەڵەت حاڵی بونیان لە ئایەتی:

(( ولو أنهم إذ ظلموا أنفسهم جاؤك فاستغفروا الله واستغفر لهم الرسول لوجدوا الله توابا رحيما )) النساء ٦٤

لە وەڵامی ئەو شوبهەیەدا دەڵێین: ئایەتەکە لێخۆشبوونی خوایی بەستۆتەوە بە سێ مەرجەوە:

١- هاتنیان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ تا زیندوو بوو لە دونیادا (مجيئهم اليه ﷺ)

٢- داواکردنی خۆیان لە خوا بۆ لێخۆشبوونی گوناهیان ( استغفارهم الله تعالى) .

٣- داواکردنی پێغەمبەر ﷺ لە خوا بۆ لێخۆشبوونی گوناهیان (استغفار الرسول لهم) .

وە مەرجی یەکەم و سێهەمیش مەوجود نیە لەوانەدا کە دەچنە لای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بە نیازی ئەوەی ئایەتەکە شمولیان بکات و ڕەحمەتی خوایی بیانگرێتەوە، چونکە ئەوەی کە دەچێتە سەر گۆڕەکەی پێی ناگوترێت چۆتە لای شەخسی پێغەمبەر ﷺ . وە هەروەها هیچ بەلگەیەکیش نیە کە بڵێت : هەرچی بچێتە سەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ ئەوە پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکات لە خوا. وە هیچ کام لە صەحابەکان وەك گۆڕ پەرستان بە هەڵە لە ئایەتەکە حاڵی نە بوون کە گوایە چوونە لای گۆڕ یەعنی چونە لای پێغەمبەر ﷺ، یا بەهۆی ئەوەوە پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو شەخسە بکات !.

وە هیچ کام لەوان نەچۆتە سەر گۆڕەکەی و داوای دوعا بۆکردنی لێ بکات. بە لکو داوای دوعا بۆکردنیان لە زیندووەکانیان دەکرد وەك لە حەدیسی استسقائدا دەرکەوت.

(( إذاً هناك ثلاثة شروط في الآية لتحقيق الاستغفار؛

أولها المجيء وهذا يكون للحي فقط فمن قال جئت الميت مستغفرا فهذا عين الجهل فمن جاء القبر لايقال إنه جاء إلى صاحب القبر حقيقة كما لو جاءه حيا لذلك بطل الشرط الأول.

ثم ان الشرط الثاني في الاية (استغفروا الله) يتم باتفاق الأمة في أي زمان واي مكان دونما تحديد وخصوصية .

ثم الشرط الثالث (واستغفر لهم الرسول)، فنحن نطالبهم:

أ- بأن يأتوا بدليل واحد صحيح على أن رسول الله ﷺ يستغفر لمن يأتي قبره ويطلب منه أن يستغفر له.

ب- وكذلك نطالبهم بدليل واحد صحيح من أن الصحابة فهموا هذا المعنى وهم أدرى بمراد الآحاديث والآيات منا.

ت- أو أن أحدا منهم وقف على القبر وقال يا رسو ل الله استغفر لي ....

وبذلك يبطل احتجاجهم بالآية على جواز التوسل بالذوات )) .

**وە یەكێك لە موحامیەكانی شەخس پەرستان بۆ سەرخستنی ئەم شوبهەیە لە كتابەكەیدا دەڵێت:**

**(هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** (( حياتي خير لكم ...ومماتي خير لكم : تُعرض علي أعمالكم فما رأيت من خير حمدت الله وما رأيت من شر استغفرت الله لكم)).

**واتە: ژیانی من بۆ ئێوە باشە، چونكە ئێوە گفتو گۆ لە گەڵ مندا دەكەن و گفتو گۆشتان لەگەڵدا دەكرێ، مردنیشم بۆ ئێوە باشە چونكە كردەوەكانی ئێوە دەهێنرێتە بەر چاوم: هەر كردەوەیەكتان ببینم لە باشەكانە من سوپاسی خوا دەكەم و هەر كردەوەیەكیشتان ببینم لە خراپەكانە، لە خوا دەپاڕێمەوە لێتان خۆش ببێ.**

**كەواتە : ئەم حەدیسە ڕاستە بەڵگەیە كە پێغەمبەر ﷺ كردەوەمان دەزانێ و بۆمان لە خوا دەپاڕێتەوە تا لە خراپەكانمان خۆش ببێ. كەوابوو: (توسل) پاڕانەوە لە خوا بەخاتری پێغەمبەر ﷺ دروستەو، ئاگاداریشەو لە خوای گەورەش دەپاڕێتەوە: كارەكانمان بۆ بكا.**

**كەواتە ئەم حەدیسە بەڵگەیە كە ناوەڕۆكی ئەم ئایەتە پیرۆزە تایبەت نییە بە كاتی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بەڵكو دوای وەفاتیشی دەگرێتەوە)[1] !!.**

**لە وەڵامی ئەم شوبهەیەشدا دەڵێین:**

**١. ئەم حەدیسە لە چەند صەحابەیەكەوە گێڕدراوەتەوە بەم شێوەیە:**

أ- حديث بكر بن عبدالله المزني. (حديث مرسل).[والمرسل من أقسام الحديث الضعيف عند المحدثين]

ب- حديث ابن مسعود (حديث شاذ). ت- حديث أنس موضوع.

**كەواتە حەدیسەكە لاوازەو صەحیح نییە بە هیچ شێوەیەك.** بڕوانە: سلسلة الأحاديث الضعيفة (رقم: ٩٧٥).

---

(1) (چەند گوڵێك لە گوڵزاری ئیسلام) (٧٤ ). وە بۆ زانین و شاهیدی دەڵێم كە ئەم كتابە پڕە لە بوهتان و درۆو شوبهەو ڕیوایەتی لاوازو زمان درێژی بۆ سەر زانایانی ئیسلام ـ وە خوا خێری نوسەرانی كتابی (لادانی چل پەردەی شەیتانی لە سەر ...) بداتەوە كە پەردەیان لاداوە لەسەر درۆو بوهتان و شوبهەكانی. هەرچەندە زۆر دەغەڵ و دڕك و چقڵی تریش ماوە لە گوڵزارەكەدا كە بە پەردەی تەلبیس داپۆشراون و پێویستیان بە لادان هەیە.

**٢. وە ئەگەر حەدیسەکەش ڕاست بوایە ئەوە هەر بەڵگە نەدەبوو لە سەر ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەی گۆڕ پەرستان، چونکە لە حەدیسەکەدا نەهاتووە بڵێت خەڵکی داوا لە پێغەمبەرﷺ دەکەن، ئەوکاتە ئەویش داوای لێخۆش بوونیان بۆ دەکات، بەڵکو هەر بە ویستی خوای گەورە بێ داوای خەڵکی، داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات.**

**وە نە لە حەدیسەکەداو نە لە ئایەتەکەشدا نەهاتووە ئەو حوکمەی کە موحامی شەخس پەرستان باسی کردووە کە بریتییە لە : (ئاگاداریشەو لە خوای گەورەش دەپارێتەوە: کارەکانمان بۆ بکا).**

## ١٥- شوبهەیەکی تریان لەسەر بۆچونە شیرکیەکەیان بریتیە لە:

## قیاس کردنی داواکردن لە مردوی ناو گۆڕ لە سەر داواکردن لە زیندوی حازر

- یستدلون على الاستغاثة بالذوات بقوله تعالى :

(( فاستغاثه الذي من شيعته على الذي من عدوه )) القصص ١٥.

الرد عليه : ما اسمج هذا من استدلال. لأنها استغاثة حيٍّ بحيٍّ فيما يقدر عليه وليس في جوازه خلاف كالغريق الذي ينادي من على الشاطيء أغِثْني من الغرق وساعِدني .

## ١٦- شوبهەیەکی تریان لەسەر بۆچونە شیرکیەکەیان بریتیە لە:

## چەند حەدیسێك

**شەخس پەرستان دەڵێن: ئێمە لەسەر هاوارکردنمان بۆ پیاوچاکان، چەند حەدیسێکمان وەك بەڵگە بە دەستە کە ئەمانەن:**

١. ((إذا انفلتت دابة أحدكم بأرض فلاة فلْيُناد: يا عبادالله احبُسُوا عليَّ، يا عباد الله احبسوا عليَّ، فإن لله في الأرض حاضراً سيحبِسه عليكم)).

**واتە: ئەگەر وڵاخی یەکێکتان لە دەشتێکی بیابانی چۆڵەوانیدا بەرەڵا بوو. ئەوە با بانگ کات، بڵێت: ئەی بەندەکانی خوا بۆم بگرنەوەو نەهێڵن لە دەستم دەرچێت، ئەی بەندەکانی خوا بۆم بگرنەوەو نەهێڵن لە دەستم دەرچێت؛ با بانگ بکاتە ئەوان ؛ چونکە خوای گەورە بەندەگەلێکی ئامادەی هەنە کە وڵاخەکەتان بۆ دەگرنەوە.**

٢. (( إذا أضل أحدكم شيئاً، أو أراد أحدكم غوثاً، وهو بأرضٍ ليس بها أنيسٌ، فليقل: يا عباد الله أغيثوني، يا عباد الله أغيثوني؛ فإنّ لله عباداً لا نراهم)).

**واتە: ئەگەر یەکێکتان شتێکی ون کرد[یا خۆی ڕێگای وڕێل کرد: إذا ضلّ أحدكم]، یان پێویستی بە فریاگوزارو یاریدەدەرێك کرد، کاتێك کە لە زەویەکی چۆڵ و بێ خەمڕەوێندا بوو؛ ئەوە با بڵێت: ئەی بەندەکانی خوا بە فریام بکەون، ئەی بەندەکانی خوا بە فریام بکەون؛ چونکە پەروەردگار بەندەگەلێکی هەیە کە ئێمە نایانبینین !.**

٣. ((إن لله خلقاً خلقهم لحوائج الناس يفزع الناس إليهم في حوائجهم، أولئك الآمنون من عذاب الله)) .

**واتە: پەروەردگار دروستکراوانێکی هەنە، دروستی کردون بۆ پێداویستی خەلکی، وە خەلکی بۆ پێداویستیەکانیان ڕوویان تێدەکەن. ئەانن ئەمین لە سزای خوا.**

## وەڵامی ئەم شوبهەیەش

**بە یارمەتی خوا لە وەڵامدا دەڵێین:**

**شەخس پەرستان وا دەزانن کە حەدیسە لاوازو هەڵبەستراوانەی کە بۆ خەلکی سادەو نەفام و نەخوێندەوار دەیانخوێننەوەو ئەوانی پێ دەخەڵەتێنن، وە وا گومان دەبەن کە ئەهلی سوننەتیش، میرات گرانی حەدیسە پیرۆزەکانی پێغەمبەریش ﷺ بە شوبهەکانیان دەخەڵەتێن!. دیارە بێ ئاگان لەوەی کە ئەهلی سوننەت بەراستی ئاگادارو شارەزان بە حەدیس وە ئەو حەدیسانەی کە شەخس پەرستان تەنها لەفزەکەیان لێ بیستووە، لای ئەهلی سوننەت سەنەدەکەشی زانراوەو حاڵی گشت ڕاویەکانیشی ئاشکرایە لایان و دەشزانن ئایا حەدیسە چ پلەو دەرەجەیەکی هەیە؛ وە ئایا ڕاستە(صحیح)، یان لاوازە (ضعیف)، وە دەرەجەی لاوازیەکەشی تا چ ڕادەیەکە!. وە ئایا ئەسڵێکی هەیە، یان هەڵبەستراوە. وە ئایا چەند سەنەدیشی هەیەو لە چەند سەرچاوەشدا گێردراوەتەوە! .**

**وەهەر حەدیسێك سەحیح بێت ئەوان پێش هەموو کەسێك شوێنی دەکەون، وەهەرچیەکیش هەڵبەستراوو لاوازبێت، ئەوان عیبادەتی لەسەر دانامەزرێنن و خەلکیشی لێ ئاگادار دەکەنەوە. بەلام شەخس پەرستان، چاك دەزانن کە حەدیسی سەحیح نابێتە پاڵپشتی شەخس پەرستیتی، بۆیە ناچار پەنا دەبەنە بەر شتی لاوازو هەڵبەستراوو شوبهە.**

وە لێرەشدا لە شوبهە زیاتریان پێ نیە چونکە ئەوەی کە دڵیان پێی خۆش بوو حەدیسێکی ڕاست(صحیح) نیە، کەواتە بە بەڵگە دانانرێت . وە هەروەها سەرەڕای نا ڕاستێتی حەدیسەکەشیان، تێگەیشتنەکەشیان لێی هەر ناڕاستەو بەڵگە نیە لە سەر بیروباوەڕەکەیان وەك بەم شێوەیەی خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

- **ڕوونکردنەوەی یەکەم پەیوەندی بە حاڵی حەدیسەکەوە هەیە:**

حەدیسی یەکەم: رواه الطبراني (٣/٨١/١) وأبو يعلى في مسنده(١/٢٥٤).كلاهما من طريق معروف بن حسّان السمرقندي عن سعيد بن أبي عروبة عن قتادة عن عبدالله بن بريدة عن عبد الله بن مسعود ﷺ مرفوعاً.

ئەو حەدیسە لاوازو زەعیفە؛ چونکە دوو نەخۆشی و خەڵەلی تێدایە:

١. معروف کە یەکێکە لە ڕاویەکانی حەدیسەکە بە چاك نەناسراوە، بەڵکو زانایان بە لاوازیان داناوە بەم شێوەیە:

قال ابن أبي حاتم عن أبيه إنه((مجهول)). وقال ابن عدي:(منكر الحديث). وقال الهيثمي: (ضعيف).

٢. (الانقطاع): پچڕان لە سەنەدەکەیدا هەیە لە نێوان ابن بريده و ابن مسعود. وە ئیمام ابن حجر ئاماژەی بۆ ئەم خەڵەلە کردووە.

کەواتە حەدیسەکە زەعیفەو، بە بەڵگە ناشێت و کاری پێ ناکرێت !. بەڵام بەداخەوە هەندێك کەس دەڵێن ئێمە تەجروبەمان هەیە لە سەر ڕاستێتی مانای ئەم حەدیسە!!.

ئایا نازانن کە دین لە قورئان و حەدیسی ڕاست وەردەگیرێت نەك لە عادەت و تەجروبە!!.

وە ئایا نازانن کە ڕێگای حوکم دان بەسەر حەدیسێکدا، بریتیە لە سەیر کردنی بوون و نەبوونی مەرجەکانی گیابونی حەدیس، نەك سەیر کردنی تەجروبەی خەڵکی لە سەری!.

ئەگەر مەرجەکانی بە ڕاست دەرچونی حەدیس مەوجود نەبوون، ئەوە ئەگەر زۆربەی خەڵکیش بە تەجروبە بە ڕاستی تێ گەیشتبن هەر بە ڕاست دانانرێت!.

وە زانای پێشەواو حەدیس ناس محمد ناصرالدين الألباني ـ رحمه الله ـ سەبارەت بەم حەدیسە فەرموویەتی: (( وقال الحافظ السخاوي في [الابتهاج بأذكار المسافر والحاج](ص٣٩): وسنده ضعيف. لكن قال النووي: إنه جربه هو وأكابر شيوخه!!.

قلت: العبادات لا تُؤخذ من التجارب، سيّما ما كان منها في أمر غيبي كهذا الحديث، فلا يجوز الميل إلى تصحيحه بالتجربة! كيف وقد تمسّك به بعضهم في جواز الاستغاثة بالموتى عند الشدائد، وهو شرك خالص. والله المستعان.

وما أحسن ما روى الهروي في (ذم الكلام) ص:٤/٦٨/١: "أن عبدالله بن المبارك ضلَّ في بعض أسفاره في طريقٍ، وكان قد بلغه، أن من ضلّ في مفازة فنادى: عباد الله أعينوني، أعين. قال فجعلت أطلب الجزء أنظر إسناده. قال الهروي: فلم يستجز أن يدعو بدعاء لا يرى إسناده !".

قلت: فهكذا فليكن الاتباع

ومثله في الحُسْنِ ما قاله العلاّمة الشوكاني في(تحفة الذاكرين)ص٤٠ بمثل هذه المناسبة:

" وأقول السنة لا تثبت بمجرد التجربة، ولا يخرج الفاعل للشيء معتقداً أنه سنة عن كونه مبتدعاً. وقبول الدعاء لا يدلُّ على أن سبب القبول ثابت عن رسول الله ﷺ، فقد يُجيب الله الدعاء من غير توسل بِسُنة وهو أرحم الراحمين، وقد تكون الاستجابة استدراجاً! "))[1].

حەدیسی دووەم: رواه الطبراني في ((المعجم الكبير)) (١/٥٥/٦) حدثنا الحسين بن إسحاق: ثنا أحمد بن يحيى الصوفي: ثنا عبدالرحمن بن شريك قال: حدثني أبي عن عبدالله بن عيسى، عن ابن علي عن عُتبة بن غزوان، عن نبيِّ الله ﷺ قال: فذكره. وزاد في آخره : ((وقد جرّب ذلك)).

ئەو حەدیسە لاوازو زەعیفە؛ چونكە زیاتر لە دوو نەخۆشی و خەڵەلی تێدایە:

١. عبدالرحمن بن شريك، كە یەكێكە لە ڕاویەكانی حەدیسەكە زەعیفە، بەم شێوەیە:

قال الحافظ ابن حجر: صدوق يُخطئُ. وقال صاحِبا(تحرير تقريب التهذيب): (بل ضعيف، قال أبو حاتم: واهي الحديث).

٢. وە هەروەها باوكیشی كە ناوی (شريك بن عبدالله القاضي)یە، لە خۆی زەعیف ترە، وەك ابن حجر فەرموویەتی: صدوق يُخطِئ كثيراً. تغير حفظه منذ ولي القضاء بالكوفة. وكان عادلاً فاضلاً عابداً شديداً على أهل البدع.

٣. الانقطاع : پچڕان لە سەنەدەكەیدا هەیە لە نێوان عُتْبة وابن علي. وە ئیمام ابن حجر ئاماژەی بۆ ئەم خەڵەلە كردووە.

(1) سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة الحديث رقم: ٦٥٥.

كەواتە دەركەوت كە حەدیسەكە لاوازەو بە بەڵگە قەبوڵ نیيە، وە قسەكەی طەبەرانی لـە دوای حەدیسەكە كە دەڵێت : ((وقد جرّب ذلك)). واتە : ئەوە تەجروبە كـراوە! ئـەوە یەكـەم شـت لـە حەدیسەكەدا نیيە، وە دووەم شتیش، تەجروبە نابێتە بەڵگەی بەڕاست دانانی حەدیس لای زانایانی حەدیس. وەك لە حەدیسی یەكەم باسمان كرد.

حەدیسی سێهەم: رواه الطبراني في ((المعجم الكبير))رقم :(١٣٣٣٤) من طريق أحمد بن طـارق الراوي. وابن عدي في ((الكامل في ضعفاء الرجال))(١٥٧/٤) من طريق عبدالله بن إبـراهيم بـن أبي عمرو. وكلاهما عن عبد الرحمن بن زيد بن أسلم عن أبيه، عن ابن عمر عـن الـنبيّ ﷺ قـال: فذكره.

ئەو حەدیسە زۆر لە دوو حەدیسەكەی پێشوو لاوازو زەعیف ترە؛ چونكە :

١. عبدالله بن إبراهيم بن أبي عمرو الغِفاري:

قال ابن عدي((الكامل في ضعفاء الرجال))(٣١٩/٥):(عامـة مـا يرويـه لا يُتابعـه الثقـات عليه). وقال البيهقي(شعب الإيمان:٤٣٢/٧): (يأتي بما لا يُتابَع عليه).

وقال الهيثمي(مجمع الزوائد:٦٥/١): (منكر الحديث).

وقال ابن الجوزي (الموضوعات:٣١٨/١): (الغفاري يضع).

قال الحافظ ابن حجر(تقريب التهذيب:ت/٣١٩٩): (متروك)، ونسبه ابن حبَّان إلى (الوضع).

٢. عبد الرحمن بن زيد بن أسلم:

قال الحافظ ابن حجر(تقريب التهذيب:ت/٣٨٦٥):(ضعيف).

كەواتە گومانی تێدانیيە كە حەدیسەكە زۆر زەعیفەو لە هەڵبەستراوی نزیكەو، بە كەڵك ئەوە نایەت كە شەخس پەرستان دڵی خۆیانی پێ خۆش بكەن.

• ڕوونكردنەوەی دووەمیش پەیوەندی بە ماناو دەلالەتی حەدیسەكەوە هەیە:

هەرچەندە كە هەردوو حەدیسەكەش زەعیفن ، وە بەڵگە نین، بەڵام ئەگەر لە حاڵەتێكدا ڕاستیش بونایە، ئەوە هەر بە بەڵگە نەدەشیان لە سەر هاواركردنە پێغەمبـەران و پیاوچاكانی مـردوو یـا زیندووی غایب؛ چونكە مەبەست لەو بەندانەی خوا كە داوای یارمەتیان لێدەكرێ، ئـەو بەندانـەن كە بەردەوام زیندوو و ئامادەن تا مرۆڤ ببینێت، كە ئـەوانیش بـریتین لـە مەلائیكـە. وە بەڵگـەش لەسەر ئەم دیاری كردنە دوو شتە:

یەکەمیان: هەر کام لە دوو حەدیسەکەی پێشوو لەفزێکیان تێدایە کە بەڵگەیە لەسەر ئەو دیاریکردن و تایبەت کردنە. دوو لەفزەکەش بریتین لە:

في الحديث الأول: ((فإن لله في الأرض حاضراً سيحبسه عليهم)).

وقوله في هذا الحديث: ((فإن لله عباداً لا نراهم))

وە زانای پێشەواو حەدیس ناس محمد ناصرالدين الألباني ـ رحمه الله ـ سەبارەت بەم وەسفەی کە لەم دوو لەفزەدا هاتووە فەرموویەتی: (( وهذا الوصف إنما ينطبق على الملائكة أو الجن ، لأنهم الذين لا نراهم عادة ، وقد جاء في حديث آخر تعيين أنهم طائفة من الملائكة . أخرجه البزاز عن ابن عباس بلفظ:

(( إن لله تعالى ملائكة في الأرض سوى الحفظة يكتبون ما يسقط من ورق الشجر، فإذا أصابت أحدكم عرجا بأرض فلاة، فليناد : يا عباد الله أعينوني)).

قال الحافظ كما في ((شرح ابن علاّن )) (١٥١/٥):

((هذا حديث حسن الإسناد غريب جداً، أخريه البزاز وقال : لا نعلم يروى عن النبي ﷺ بهذا اللفظ إلا من هذا الوجه بهذا الإسناد )).

وحسنه السخاوي أيضاً في ((الابتهاج )). وقال الهيثمي :((رجاله ثقاة)).

فهذا الحديث ــ إذا صح ــ يُعَيِّن أن المراد بقوله في الحديث الأول((يا عباد لله)) إنما هم الملائكة، فلا يجوز أن يلحق بهم المسلمون من الجن أو الإنس ممن يسمونهم برجال الغيب من الأولياء والصالحين، سواء كانوا أحياءً أو أمواتاً؛ فإن الاستغاثة بهم وطلب العون منهم شرك بين لأنهم لا يسمعون الدعاء، ولو سمعوا لما استطاعوا الاستجابة وتحقيق الرغبة ، وهذا صريح في آيات كثيرة، منها قوله تبارك وتعالى:

﴿والذين تدعون من دونه ما يملكون من قطمير، إن تدعوهم لا يسمعوا دعاءكم. ولو سمعوا ما استجابوا لكم، ويوم القيامة يكفرون بشرككم، ولا ينبئك مثل خبير﴾ (فاطر-١٣-١٤).

وبعد كتابة ما سبق وقفت على إسناد البزار في((زوائده))ص٣٠٣: حدثنا موسى بن إسحاق: ثنا منجاب بن الحارث: ثنا حاتم بن اسماعيل عن أسامة بن زيد{عن أبان}ابن صالح عن مجاهد عن ابن عباس أن النبي ﷺ قال: فذكره .

قلت : وهذا إسناد حسن كما قالوا، فإن رجاله كلهم ثقات.

ولكن الحديث عندي معلول بالمخالفة [ رواه البيهقي في((الشعب))(٢/٤٥٥/١) موقوفاً]، والأرجح أنه موقوف، وليس هو من الأحاديث التي يمكن القطع بأنها في حكم المرفوع ، لاحتمال أن يكون ابن عباس تلقاها من مسلمة أهل الكتاب . والله أعلم.[1]

وە حەدیسی سێهەمیش بە شێوەیەکی تر ڕیوایەت کراوە هەر لە ابن عمر ﷺ بە لەفزی:

((إن لله أقواماً اختصّهم بالنعم لِمنافع العباد، يُقِرُّهم فيها ما بذلوها، فإن منعوها نزعها منهم فحوَّلها إلى غيرهم)).

أخرجه ابن أبي الدنيا في(قضاء حوائج الناس)(٥). وأبو نُعَيم في (الحِلية) (١١٥/٦، ٢١٥/١٠).

واتە پەروەردگار کۆمەڵ گەلێکی هەیە تایبەتی کردون بە نیعمەتەکانی خۆی زیاتر لە خەلکی، وە هەر دەیانهێڵێتەوە لەسەر ئەم نیعمەتانە تاوەکو ئەوانیش لە ڕێی خوا ییبەخشن بە پێداویستان. وە ئەگەر نەیان بەخشی، ئەو کاتە پەروەردگار لە چنگیان دەردەهێنێت و دەیداتە دەست کەسانێکی تر.

کەواتە حەدیسەکە باس لەوە دەکات کە دەوڵەمەندو خاوەن دەرامەتەکان ـ جا لە هەر ڕوانگەیەکەوە دەوڵەمەند بن ـ پێویستە هاوکاری خەلکی بکەن کاتێ کە موحتاجیان بن، جا بە داواکردن بێت لێیان، یان بێ داواکردن. وە باس لەوە ناکات کە خەلکی هاوار بکەنە پیاوچاکانی غایب یان مردوو، وە داوای یارمەتی لەوان بکەن!.

---

(1) سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة (٢/١١٠-١١٢).

## شوبهەی حەڤدەهەم

دەڵێن: ئیمە دەڵێین: (لا اله الا الله،محمد رسول الله)، وە دەڵێین تەنها خوا پەرستراوو (ئیلاهە). وە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكان و فریشتەكان هیچیان پەرستراو (ئیلاه) نین، وە هەموویان بەندەی خوان. بەڵام موشریكەكان ڕازی نەبوون بڵێن: (لا اله الا الله، محمد رسول الله) وە باوەڕیان وابوو لەگەڵ خوا پەرستراو ئیلاهی تریش هەن و، دەیان پەرستن. وە عیساو عوزەیرو پیاوچاكان و فریشتەكانیان بە پەرستراو (آله) دادەنان.

كەواتە چۆن دەبێت ئێمە وەكو ئەوان بەموشریك حیساب بكرێین، تەنها لەبەرئەوەی هاوار دەكەینە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكان و بەوەسیلەیان دادەنێین كە ببنە واسیتەمان و لای خوا شەفاعەتمان بۆ بكەن ؟!

## وەڵامی ئەم شوبهەیەش

بە پشتیوانی خوا دەڵێم:

ئیعتیقادو كردەوە حیسابە، نەك دەعواو قسەی ڕووتی بێ بەڵگە. وە پەروەردگار سەیری ئیعتیقادی ناو دڵ و، عەمەل دەكات، نەك دەعوای بێ بەڵگەو شاهید.

بۆ نمونە مونافیقەكان بە دەم دەیان وت: أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمداً رسول الله، بەڵام لە دڵدا ئیعتیقادیان بەوە نەبو كە تەنها (الله) بپەرسترێت و محمدیش ﷺ نێرراوی خوا بێت؛ بۆیە پەروەردگار حیسابی ئیعتیقادی ناو دڵی بۆ كردن، نەك دەعوای زمان جا لەبەر ئەوە پەروەردگار فەرمووی مونافقەكان درۆ دەكەن لە شاهیدی دانەكەیان، واتە هەرچەندە قسەكەیان ڕاستە كە دەڵێن (محمد رسول الله)، بەڵام لە دڵدا درۆ دەكەن و باوەڕیان بەم قسەیە نیەو ناو دڵیش حیسابە بۆیە فەرمووی:

﴿ إذا جاءك المنافقون قالوا: نشهد انك لرسول الله، والله يعلم انك لرسوله، والله يشهد إنّ المنافقين لكاذبون﴾ المنافقون (١) .

واتە ئەگەر مونافیقەكان هاتنە لات و وتیان شاهیدی دەدەین كە محمد ڕەسولی خوایە، ـ وە خوا دەزانێت كە تۆ ڕەسولی ئەویت ـ بەڵام خواش شاهیدی دەدات كەمونافیقەكان درۆدەكەن !!.

كەواتە پەروەردگار حیسابی ئیعتیقادی درۆی ناو دڵەكانی كرد، نەك قسە ڕاستەكەی دەمیان.

بۆیە بە بڕواداری دانەنان هەرچەندە شاهیدیەکەشیان نیشانەی موسڵمان بوونە !!

وە خوای گەورە دەفەرمویت:

﴿ وقالوا لن يدخُل الجنّةَ إلا مَن كان هُوداً أو نصارى، تلك أمانيُّهم. قُل هاتوا بُرهانكم إن كنتم صادقين، بلى مَنْ أسلمَ وجهَهُ لله وهو مُحسنٌ فلهُ أجرهُ عند ربه ولا خوفٌ عليهم ولا هم يحزنون ﴾ البقرة (١١١، ١١٢).

واتە جولەکەو گاورەکان دەیان وت کەس ناچێتە بەهەشتەوە تەنها ئەو کەسە نەبێت کە جولەکە بێت یان گاور!!

بەڵام ئەوە تەنها گومان و ئاواتی خۆیان بوو بێ بەڵگە بۆیە پەروەردگار فەرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ : بفەرموو: بەڵگەتان بهێنن لەسەر ئەم دەعوایەتان ئەگەر ڕاست دەکەن چونکە دەعوای بێ بەڵگەو، قسەی بێ ئیعتیقادو عەمەل وەرناگیرێت !!

ئنجا پەروەردگار روونی کردەوە کە کێ دەچێتە بەهەشت، بەبێ ترس و خەفەت: ﴿ من أسلم وجههُ لله وهو محسن ﴾ واتە ئەو کەسەی کە دوو مەرجی تێدا بێت:

یەکەم: تەواو خۆی تەسلیمی خوا کردووە بەدڵ و زمان و لاشە بە ئیعتیقادو قسەو کردەوە تەنها خوا دەپەرستێت و، بەس تەسلیمی ئەو بووەو، ئیعتیقادی بە کەسی تر نیە لە دڵداو، هاواریش ناکاتە غەیری خوا بە زمان و، زەلیلیش بۆ کەس نانوێنێت بە لاشە.

دووەم: وەهەروەها ﴿ وهو محسن ﴾ واتە: لەگەڵ ئەم تەسلیم بوونە تەواوەی بۆ خوا، عیبادەتەکانیشی بە چاکی دەکات وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ ڕێی بۆ داناوەو نیشانی داوە.

کەواتە ئەو کەسە دەچێتە بەهەشت بێ غەم و بێ ترس کە:

(١) تەنها خوا بپەرستێت و تەسلیمی ئەو بێت.

(٢) وە تەنها شوێن کەوتەی پێغەمبەریش ﷺ بێت لە خوا پەرستیداو، بە چاکی عیبادەتەکەی بکات .

وە هەرکەسێك دەعوای چوونە بەهەشت بکات و، بەم شێوەیە نەبێت کە خوا دەیەوێت (واتە دوو مەرجەکەی تێدا نەبێت) ئەو دەعوایەکەی بێ کەڵکەو قەبوڵ نیە.

وە ئێمەش ڕوو دەکەینە نەفام و گۆڕپەرستان و دەڵێین: ڕاستە بەدەم دەڵێن: لا إله الا الله محمد رسول الله) بەڵام ئەم دوو ئایەتەتان بەسەردا تەتبیق دەبێت:

١. ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ۗ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾ (آل عمران: من الآية١٦٧)

**واتە قسەیەك بەدەم دەڵێن كە لە دڵەكانیاندا ئیعتیقادیان پێی نیە !!.**

**ڕە تەتبیق بوونی ئایەتەكە لەسەرتان لەوەدا دەردەكەوێت كە: واتای لا إله إلا الله كە بریتییە لە: هیچ پەرستراوێكی حەق نیە تەنها الله نەبێت. واتاكەی ئەوە دەگەیەنێت كە نابێت مرۆڤ هیچ جۆرە پەرستنێكی دڵ و زمان و لاشەو ماڵ، بۆغەیری خوا بكات.**

بەڵام ئێوە پڕ بەزمانتان هاواریان دەكەنۆ و، بەلاشەش زەلیلیان بۆ دەنوێنن و سەریان بۆ شۆڕدەكەن و، بە ماڵیش سەربڕین و قوربانی و نەزریان بۆ دەكەن.

ڕە لە دڵەكانیشتاندا ئیعتیقادتان وایە كە ـ جەناب و حەزرەتی[1] شێخ لە دووریشەوە بێت، یان لە ژێر گڵیش ـ ئاگادارەو، دەسەڵات و توانای هەیەو، سودو زیانی بەدەستەو، لێی دەترسن و، لە سنوری خۆی زیاتر بە گەورەی دادەنێن و، دڵتان پێوە بەستووەو، ڕەجای خێرو سودو شەفاعەت كردن و، واسیتە بۆكردنی لێ دەكەن و، پشتی پێ دەبەستن و، خۆشتان دەوێت وەك خۆشویستنی خوا.

ڕە هەركەسێك غەیری خوا ئەم ئیعتیقادەت پێی بێت و، دڵت ئاوا پێوەی پەیوەست بێت، ئەوە بە ئیلاهت داناوە لە هەقیقەت و واقیعدا. ئەگەر بەزمانیش نەڵێیت ئیلاهە؛ چونكە **ئیلاه ئەوەیە كە: دڵەكان پێوەی بەندن و خۆشیان دەوێت و بەگەورەی دادەنێن و لێی دەترسن و ڕەجاو هیوایان پێیەتی و پشتی پێ دەبەستن.**

ئەمەیە مانای ئیلاه لەزمانی عەرەبیدا، جا كە ئەم مانایە هەبوو لەهەر شتێكدا، ئەوە بە ئیلاه دانراوە؛ ناو بنرێت ئیلاه یان نا؛ چونكە ناو ناوەڕۆك ناگۆڕێت و، حیسابیش بۆ ناوەڕۆكەكەیە نەك بۆ ناو. بۆ نمونە كەسێك عەرەق بخواتەوەو ناوی بنێت خواردنەوەی ڕۆحی، پێی دەڵێین: تۆ عەرەقی حەرامت خواردۆتەوە؛ با ناوەكەشی عەرەق نەبێت !!.

بەهەمان شێوەش هەر یەكێك كە خەڵكی ئیعتیقادیان پێی بێت، وە دڵیان پێوەی بەند بێت بەترس و خۆش ویستن و بەگەورە دانان و، پشت پێبەستن و، ڕەجا لێ كردن؛ ئەوە بەئیلاهیان

---

(1) زاراوەی(حەزرەت)، زاراوەیەكی هەڵەیەو، بۆ هیچ كەسێكی مردوو یا(غائب) بەكار ناهێنرێت؛ چونكە غەیری(الله) هیچ یەكێك بەردەوام حازر نیە لەگەڵمان، بەڵكو هەردەم خوا حازرو زیندووە.

داناوەو، کراوە بە(مەعبود) و پەرستراوەو، کراوەتە شەریکی خوا، با ناوی ئیلاهیشی لێ نەنێن. یا هەر ناوێکی تریشی لێ بنێن، وە با پێغەمبەریش بێت و پێشی بڵێن: (عَبْدُاللهِ و رَسُوله) واتە: عەبدی خواو نێرراوی خوا؛ چونکە ئیعتیقادو بیروباوەڕی ناو دڵیان حەقی ئیلاهیەتی داوەتێ، ئەگەر خۆیشی وا نەزانێت و، بە دەمیش بە ئیلاه ناوی نەنێت.

کەواتە دەرکەوت کە شەخس پەرستەکانی ئەمڕۆ پیاوچاکان و مردووی مەرقەدەکانیان کردووە بە (آلهة)، واتە چەند پەرستراوێك لەگەڵ خوا. ئەگەر واش بزانن تەنها الله ئیلاهو پەرستراوەو ناویشیان نەنێن ئیلاه؛ چونکە بیروباوەڕی ناو دڵیان جیاوازە لە قسەی سەردەمیان.

دەبینین حەقی ئیلاهیان داوەتە شێخەکان و پیاوچاکەکان:

* خۆشیان دەوێن بە زەلیلیەوە، وە بە گەورە دەسەڵاتیان دادەنێن و پشتیان پێ دەبەستن.وە لێیان دەترسن و ناوێرن درەختێ وشك بووی شکاوی سەر قەبری شێخ دەستکاری بکەن لە ترسی شێخ، دەڵێن توشی زەرەر دەبین !!.

* وە ئیعتیقادیان نەك هەر بە خودی شێخ بێت بە تەنها، بەڵکو بە بەردو دارو پەڕۆی سەر قەبرەکەشی هەیەو، بە پیرۆزی دەزانن و، بە گەورەی دەزانن و، بڕوایان وایە لە نەخۆشی چاکیان دەکاتەوەو، لە بەڵا دەیان پارێزێت و، خێرو بەرەکەتیان تووش دەکات !!.

* وە سوێند بەخوا دەخۆن بە درۆ، بەبێ ترس و شەرم، بەڵام ناوێرن ئاوا سوێند بە سەری شێخ بخۆن!!. شەرم لە شێخ زیاتر دەکەن وەك لەخوا.

* فەرمانی شێخ لە پێشترە لایان لە فەرمانی خوا !!.

کەواتە لە ڕاستیدا بیرباوەڕی دڵتان بە پەرستراوو ئیلاهیان دەزانێ، ئەگەر خۆشتان وا نەزانن و بە دەمیش وانەڵێن. وە زانینشمان کە بیروباوە حیسابە.

**وە ئایەتی دووەم کە بەسەرتاندا تەتبیق دەبێت:**

٢ــ ﴿ لِمَ تقولون مالا تفعلون كَبُرَ مَقْتًا عند الله أنْ تقولوا مالا تفعلون ﴾ (الصف: من الآية٣).

واتە: بۆچی قسەیەك دەکەن کە بەکردەوە نایکەن و، عەمەلی پێ ناکەن.

ئێمەش بە شەخس پەرستان دەڵێین: بۆچی بە دەم دەڵێن (لا إله الا الله، محمد رسول الله) وە دەڵێن تەنها خوا پەرستراوو ئیلاهەو، هیچ پەرستراوی تر نیە، وە دەڵێن ئێمە بەس خوا دەپەرستین. بەڵام کردەوە بە قسەکەتان ناکەن، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە پەرستن بۆ غەیری خوا

دەکەن، وە بە ئیعتیقادی دڵ و، کردەوەی لاشەو ماڵ و زمانیشتان جۆرەها پەرستن دەکەن بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان و قەبرەکانیان و بۆ شێخەکانتان، بۆ نمونە:

* هاواریان دەکەنێ: وە هاوارکردن و دوا لێکردن عیبادەتە، وەك لە حەدیسی (صحیح)دا دەفەرموێت: ((الدعاءُ هو العبادة)).

* سەربڕینیان بۆ دەکەن، کە سەر بڕین عیبادەتەو تەنها دەبێت بۆ خوا بکرێت. وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وانْحَرْ ﴾.

* نەزریان بۆ دەکەن، کەنەزریشی عیبادەتە.

* داوای یارمەتیان لێ دەکەن، کە تەنها دەبێت لەخوا بکرێت:

﴿ إيّاك نَعْبُدُ وإيّاك نَسْتعين﴾.

* تەواف بە دەوری قەبرەکانیاندا دەکەن، کە تەواف وەك نوێژەو تەنها دەبێت بۆ خوا بکرێت لە دەوری (کەعبە) ﴿ ولْيَطَّوَفُوا بالبيتِ العتيق ﴾.

* کرنوشیان بۆ دەبەن. وە دەست لەسەر دەست بە پێوە لە سەر سەریان ڕادەوەستن و، پاشەوپاش دەگەڕێنەوە دواوە، زەلیلیان بۆ دەنوێنن. کە ئەمانەش هەموویان پەرستنن و تەنها دەبێ بۆ خوا بکرێن.

کەواتە: بەکردەوە غەیری خوا دەپەرستن و، کردوتانن بە شەریکی خوا، هەرچەندە بەدەم دەڵێن تەنها خوا دەپەرستین و شەریکی بۆ دانانێین. وە لە وەیە واش نەزانن کە ئەمە شەریك دانانە بۆ خوا، چونکە زۆر نەفام و بێ ئاگان لە قورئان و حەدیس و زمانی عەرەبی!!، بۆیە ئەوەی بەدەم دەیڵێن و دەعوای دەکەن، بە کردەوە هەڵی دەوەشێننەوە !!.

کەواتە چ جیاوازیەکتان هەیە لەگەڵ موشریکەکان لەم ڕوانگەیەوە کە هەردوولاتان غەیری خوا دەپەرستن و شەریك بۆ خوا دادەنێن ؟!.

کە بڵێن ئێمە دەڵێین (لا إله الا الله) و ئەوان دەڵێن ﴿ أجعلَ الآلهة إلهاً واحداً ﴾.

ئێمەش دەڵێین: وەڵامان دانەوە کە ناوگۆڕین ناوەڕۆك ناگۆڕێت و، ئیعتیقادو کردەوە حیسابە نەك دەعوای بێ بەڵگەو شاهید.

بەڵێ جیاوازی هەیە لەنێوانتان لەقسەو دەعوا، بەڵام یەکسان وهاوشێوەن لەکردەوەو بیروباوەڕ. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَلِكَ قَالَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ مِثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ قَدْ بَيَّنَّا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (البقرة: من الآية١١٨)

وە هۆی جیاوازی دەعواو قسەتان لەوەدایە کە موشریکەکان عەرەبی ئەسڵ بوون، دەیان زانی ئیلاه یەعنی چی؛ بۆیە بە دەمیان قسەیەکیان نەدەکرد کە پێچەوانەی ئیعتیقادو بیروباوەڕو کردەوەیان بێت. بەڵام ئێوەی نەزانی نەفامی نەشارەزا بە زمانی عەرەبی بە دەم دەڵێن: (لا إله الا الله)، بەڵام نازانن ماناکەی چییەو، ئەم قسەیە چی دەگرێتەوەو، ئەم قسەیە چ جۆرە ئیعتیقادو بیروباوەڕو کردەوەیەکی پێویستە، بۆیە زۆر بە سادەیی و بە ئاسانی بە کردەوەو بیروباوەڕ قسەکەتان هەڵدەوەشێننەوەو، خۆتان بە درۆ دەهێننەوە !!.

کەواتە: موشریکەکان دەیان زانی کە بڵێن(لا إله الا الله)، ئەوا دەبێ ئیعتیقادیان تەنها بەخوا بێت و، پشت بەو ببەسترێت و، ڕەجا لەو بکرێت و، تەنها هاوار بکرێتە ئەوو، داوای یارمەتی و فریاکەوتن و پەناگرتن تەنها لەو بکرێت و، قوربانی و نەزر تەنها بۆ ئەو بێت و، سوێند تەنها بەو بوخرێت و، تەنها ئەو بەگەورە دانرێت. وە غەیری ئەو نابێت ئەمانەی بۆ بکرێت و، نابێت ئەم باوەڕەت پێی بێت؛ جا ئا بەم شێوەیە تێ گەیشتبوون لە مەبەستی پێغەمبەر بە (لا إله الا الله)، بۆیە ڕازی نەدەبوون دانی پێدا بنێن و، دوور بکەونەوە لەهەموو ئەو شتانەی تر، کە ئیعتیقادیان پێیان بوو.

بەڵام ئێوەی نەفام، نازانن کە وشەی (لا إله الا الله) ئەمانەی پێشوو دەگرێتەوە، بۆیە بەدەم دەیلێن و بەکردەوەش هەڵی دەوەشێننەوەو، لە دڵیشتاندا بیروباوەڕتان پێی نیە لە ڕاستیدا؛ بەڵام نەفامن، وە ناشزانن کە نازانن ، وە ناشتانەوێ بزانن!!.

**کەواتە دوای وەڵام دانەوەی ئەو شوبهەیەش تێگەیشتین چ کاتێك مرۆڤ بە تەواوی دەبێتە موسڵمانێکی ڕاست .**

**وە زانیمان کە ئەگەر بەتەواوی وازی نەهێنابێت لە شیرك و بەڕاستیش باوەڕی بە مانای(لا إلە إلاّ الله) نەبێت، ئەوە تەنها بە وتنی (لا إلە إلاّ الله) نابێت بە موسڵمان بە ڕاستی، وە بەمە وازی لێ ناهێنرێت .**

## شوبهەی هەژدەهەم

## بە چ شتێك مرۆڤ لە دين دەردەچێت ؟!

دەڵێن: ئايا مرۆڤ بە وتنی ﴿ لا إله إلاّ الله محمد رسول الله ﴾ نايەتە ناو ئيسلام ؟!. وە بەم شاهيديەش خوێن و ماڵی پارێزراو نابێت ؟! وە كە ئەم وشەيە كۆتا ووشەی بێت لە ژيانيدا ناچێتە بەهەشت ؟!.

كەوابوو چۆن ئێوەی ئەهلی سونەت، تۆمەتی شيرك و گۆڕپەرستی ونەفامی دەدەنە پاڵ ئەو كەسانەی كە ئيعتيقاديان بە شەخس و بە قەبری پياوچاكان هەيەو، هاواريان دەكەن، لەكاتێكدا كە ئەوان شايەتيش دەهێنن بە (لا إله إلاّ الله، محمد رسول الله) وە هەروەها نوێژيش دەكەن و زيكريش دەكەن ؟!.

**لە وەڵام ئەم شوبهەيەشدا دەڵێين:**

كاتێك وتنی (لا إله إلاّ الله) مرۆڤی پێ دەبێت بە موسڵمان لە حەقيقەتداو خوێن و ماڵی پێ دەپارێزرێت و بەهەشتی پێ دابين دەكرێت، كە خاوەنەكەی ـ واتە ئەوەی كە دەڵێت:(لا إله إلاّ الله ) ـ چەند مەرجێكی تێدا بێت؛ لەو مەرجانەش:

**مەرجی يەكەم: العلم بمعناها:** واتە مەرجە كە زانياری ببێت بە واتای (لا إله إلاّ الله).

**مەرجی دووەم: العمل بمقتضاها:** واتە كردەوە كردن بەگوێرەی پێداويستيەكانی ئەم وشە پيرۆزە. يەعنی ئەم وشەيە چ جۆرە ئيعتيقادو قسەو عەمەلێك پێويست دەكات، بيكەيت و جێ بەجێی بكەيت.

وە بۆ بەجێ‌گەياندنی ئەم دوو مەرجەش، پێش هەموو شتێك پێويستە بزانين كە وشەی (لا إلــه إلاّ الله)، لە دوو بەش پێك دێت، وە هەر بەشەش ماناو داخوازی تايبەتی خۆی هەيە بەم شێوەيە:

**بەشی يەكەمی: (لا إله):**

**واتاكەی:** يەعنی: واتە هيچ مەعبودێك حەق نيە؛ چونكە تەقديرەكەی بەم شێوەيە:(لا معبود حقّ). هيچ پەرستراوێكی حەق نيە؛ بپەرسترێت و هاواری بكرێت و پەنای پێ بگيرێت و، داوای بە فرياكەوتن و يارمەتی لێ بكرێت و، بە گەورە دابنرێت و زەليلی بۆ بنوێنرێت و، پشتی پێ ببەسترێت و، ماڵی بۆ ببەخشرێت.

**داخوازیەكەی:** كەواتە ئەم بەشە وا پێویست دەكات پەرستن بۆ هیچ شتێك و هیچ كەسێك نەكرێت؛ چونكە (لا إله حقٌ) هیچ مەعبودی حەق نیە. كەواتە نابێت ئیعتقادت بە هیچ یەكێك بێت، وە نابێت پشت بەهیچ یەكێك ببەستیت، وە نابێت خۆشەویستی و بە گەورە دانانت بۆ هیچ یەكێك بێت، وە نابێت زەلیلی بۆ هیچ یەكێك بنوێنیت، وە نابێت ڕەجای چاكەو خێر دەستكەوتن لە هیچ یەكێك بكەیت. وە نابێت دڵت ببەسترێتەوەو هەڵواسرێت بەهیچ مەعبودێك. وە نابێت هاوار بكەیتە هیچ یەكێك، وە نابێت داوای یارمەتی و فریاكەوتن و پەناگرتن بكەیت لەهیچ یەكێك. وە نابێت كرنووش و پشت چەمانەوەو سەر نەویكردن بكەیت بۆ هیچ یەكێك، وە نابێت دەست لەسەر دەست دابنێیت و قژ بتاشیت بۆ هیچ یەكێك، وە نابێت ماڵ ببەخشیت و سەربڕین و نەزر بكەیت بۆ هیچ یەكێك وە نابێت هیچ یەكێك بە سەرچاوەی بەرنامەو یاسا دانان و فەرمان لێ وەرگرتن و شایستەی گوێڕایەڵی كردنی سەربەخۆ بزانیت.

٢. (**إلاّ الله**):

**واتاكەی:** تەنها (الله) مەعبودو پەرستراوی حەقەو، شایستەی ئەوەیە ئیعتیقادمان پێی بێت و، پشتی پێ ببەستین و، هاواری بكەینێ و، بەگەورەی دابنێین و، سەربڕین و نەزری بۆ بكەین، وە گوێڕایەڵی سەربەخۆی بكەین (نُطيعُه لِذاتِه).

**داخوازیەكەی:** كەوابوو ئەم بەشە وا پێویست دەكات، پەرستن تەنها بۆ (الله) بكەیت؛ بە دڵ و زمان و لاشە و ماڵ. وە لەهیچ جۆرە پەرستنێكدا هیچ یەكێك نەكەیتە شەریكی (الله). نە فریشتە لەخوا نزیكەكان، وەنە پێغەمبەرە نێرراوەكان، وەنە پیاوچاكەكان، وەنە دارو بەردەكان، وەنە قەبرو مەزرگاكان، وەنە شێخ و مامۆستاكان.

وە هەركەسێك ئەم دوو مەرجەی پێشووی تێدا نەبێت واتە :

(١) زانیاری بەمانای (لا إله إلاّ الله) و

(٢) كردەوە بە پێداویستی ماناكەی. ئەوە سود نابینێت لە تەنها وتنەكەی.

كەواتە هەركەسێك مانای (لا إله إلاّ الله) نەزانێت و ئیعتیقادی بەو مانا ڕاستەی ئەم وشە پیرۆزە نەبێت، ئەوە تەنها بە وتنی نابێت بە موسڵمان و، خوێن و ماڵی ناپارێزرێت و ناشچێتە بەهەشت. چونكە پەروەردگار فەرمورویەتی:

﴿ إلاّ مَنْ شَهِدَ بالحقّ وهم يعلمون ﴾ الزخرف (٨٦).

واتە: تەنها كەسێك شەفاعەتى بۆ دەكرێت كە بەدەمى شاهيدى بدات بە حەق، واتە بە(لا إله إلاّ الله). وە دڵيشى بزانێت ماناى شاهيديەكەى چيەو ئيعتيقاديشى پێى بێت.

ئيمامى القرطبي المفَسِّر فەرموويەتى لە تەفسيرى ئەم ئايەتەدا:

(أنّ الشهادة بالحق غيرُ نافِعة إلاّ مع العلم، وأنّ التقليد لا يُغْني مع عدم العلمِ بصِحَّة المقالة).

واتە شاهيدى دان بە حەق بێ سودە، تەنها لەگەڵ عيلم نەبێت بەماناكەى. وە تەقليدو لاسايى كردنەوە لە شاهيديداندا سود ناگەيەنێت، كە زانيارى بوون بە ڕاستى قسەكەى لەگەڵ نەبێت.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: (مَنْ ماتَ وهو يَعلمُ أن لا إله إلاّ الله دخل الجنة)[1].

واتە: هەركەسێك مرد، بەو حاڵەتە مردبێت كە زانيبێتى هيچ مەعبودێكى حەق نيە تەنها(الله) نەبێت، وە باوەڕى پێ بووبێت، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

كەواتە زانينى ماناى (لا إله إلاّ الله) مەرجە بۆ چوونە بەهەشت بەم وشە پيرۆزە.

وە هەركەسێكيش ماناكەى بزانێت، بەڵام ئيعتيقادى پێ نەبێت و عەمەلى پێ نەكات، ئەوە حاڵى وەكو ئەوكافرو موشريكانە كۆنە، كە چاك ماناكەيان دەزانى، بەڵام باوەڕيان پێنەدەكردو بە درۆيان دادەناو ئينكايان دەكرد، وەك لەم ئايەتەدا دەبينرێت:

﴿وجَحَدُوا بها واسْتَيقنَتها أنفسهم ظُلْماً وعُلُوّاً﴾.

كەواتە هەركەسێ ماناى ڕاستەقينەى نەزانێت، ئەوە بێگومان داخوازيەكەيشى جێ بەجێ نەكردووەو كاركردنيشى ڕاست و پەسەند و پاك و خاڵس نابێت بۆ خوا، ئەو كاتە ئيسلامەتيەكەى بەڕاستى دانامەزرێت؛ چونكە يەكەم ڕوكنى ئيسلام بريتيە لە: (لا إلـه إلاّ الله) كە ماناو پێداويستيەكەى بريتيە لە (دووركەوتنەوە لە پەرستنى غەيرى خوا بەهەموو شێوەيەك و، پەرستنى خوا بە تەنها بەبێ شەريك بۆ دانان). هەروەك لەم حەديسە صەحيحانەدا بۆمان دەردەكەوێت:

ئيمامى (مسلم) لە (صحيح مسلم) دا فەرموويەتى:

١. (عن عمر بن الخطاب ﷺ قال رسول الله ﷺ :

(الإسلامُ: أن تشهدَ أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً رسولُ الله، وتُقيمَ الصلاةَ، وتوتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتَحُجَّ البيتَ إنِ استطعتَ إليه سبيلاً)[2].

---

(1) صحيح مسلم .
(2) صحيح مسلم : (ح / ٨ / ١) .

٢. عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ : (الإسلامُ: أن تعبُدَ اللهَ، ولا تُشْرِكَ بـه شـيئاً وتقيمَ الصلاةَ المكتوبة، وتودِّي الزكاةَ المفروضة، وتصوم رمضانَ)[1].

٣. عن أبي أيوب ﷺ قال: جاء رجلٌ إلى النبيِّ ﷺ فقال: دُلّني على عملٍ أعملُهُ يُدنيني من الجنة، ويُباعِدني من النار.

قال: (تَعبُدُ اللهَ لا تُشرك به شيئاً، وتقيمُ الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصِلُ ذا رَحِمِكَ) فلمّا أدبَـرَ، قال رسولُ الله ﷺ : (إن تمسّكَ بما أُمِرَ به دخلَ الجنة)[2]

٤. عن أبي هريرة ﷺ أنّ اعرابيّاً جاء إلى رسول الله ﷺ فقال:

يا رسول الله ﷺ، دُلّني على عملٍ إذا عَمِلْتُهُ دخلتُ الجنةَ.

قال: (تعبُدُ اللهَ لا تشرك به شيئاً، وتقيمُ الصلاة المكتوبة، وتُودِّي الزكاة المفروضـة، وتـصومُ رمضانَ).

قال: والذي نفسي بيدِهِ لا أزيدُ على هذا شيئاً أبداً، ولا أنقُصُ منهُ). فلمّا ولّى، قال النبيُّ ﷺ: (مَنْ سرّهُ أن ينظُرَ إلى رجلٍ من أهلِ الجنةِ، فلْيَنْظُرْ إلى هذا)[3].

٥. عن ابن عباس ﷺ قال: إنّ وفدَ عبدالقيس أتوا رسـول اللـه ﷺ قالوا: يا رسول الله، مُرنا بأمرٍ نُخبرُ به مَنْ وراءنا ندخُلُ به الجنة، قال: فأمرهم بأربعٍ، ونهاهم عن أربعٍ،

قال: أمرهم بالإيمانِ باللهِ وحدهُ. وقال: (هل تدرون ما الإيمان بالله ؟).

قالوا: اللهُ ورسولهُ أعلم، قال: (شهادةُ أن لا إله إلاّ الله، وأنّ محمداً رسولُ الله، وإقامُ الـصلاة، وإيتاء الزكاةِ، وصومُ رمضان، وأن تؤدُّوا خُمُساً من المغنم) وفي رواية:

(اعبدوا اللهَ ولا تشركوا به شيئاً، وأقيموا الصلاة، وآتوا الزكاة، وصـوموا رمـضان وأعطـوا الخُمُسَ من الغنائمِ)[4].

٦. عن ابن عباسٍ عن معاذ بن جبل ﷺ قال : بعثني رسولُ الله ﷺ إلى اليمنِ. قال: (إنّك تـأتي قوماً من أهل الكتابِ، فادعُهُم إلى شهادةِ أن لا إله إلاّ الله وإنّي رسولُ الله، (وفي رواية ـ إلى عبادة

(1) صحيح مسلم :ح (٩). والبخاري (٥٠).
(2) صحيح مسلم : ح / ١٣ . والبخاري (١٣٩٦).
(3) صحيح مسلم : (ح / (١٤) والبخاري (١٣٩٧).
(4) صحيح مسلم : (ح / (١٧) والبخاري (١٣٩٨).

الله ـ وفي رواية: ـ إلى أن يُوحّدوا الله ـ) [فإذا عرفوا ذلك] فإن هم أطاعوا لِذلك، فاعلِمْهُم أنّ الله افترضَ عليهم خمسَ صلوات في كلِ يومٍ وليلةٍ، فإن هُم أطاعوا لِذلك، فـأعلِمْهُم أنّ الله افترض عليهم صدقةً تُوخَذُ من أغنيائهم فتردُّ في فُقَرائهم، فإن هم أطاعوا لِذلك، فإيّاك وكرائم أمـوالهم، واتّقِ دعوة المظلوم، فإنهُ ليس بينها وبين الله حجابٌ)[1].

٧. عن أبي مالكٍ (سعد بن طارق) عن أبيه، قال: سمعتُ رسول الله ﷺ يقول:

(من قال: لا إله إلاّ الله ـ وفي روايةٍ: من وحّدَ الله ـ وكفرَ بما يُعبدُ من دون الله حَرُمَ مالهُ ودمهُ، وحسابهُ على الله)[2].

## **کەواتە: لەم حەدیسە صەحیحانەدا ئەم ڕاستیانەمان بۆ دەردەکەوێت:**

**١. ڕوکنی یەکەمی ئیسلام کە بریتییە لە:**

(أن تشهد أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً رسول الله) **ماناکەی و پێداویستییەکەی بەوە دێتەجێ کە:** (أن تعبد الله ولا تشرك به شيئاً).

**واتە بە تەنها (الله) بپەرستیت و هیچ شتێك نەکەیت بە شەریك بۆی و هیچ جۆرە پەرستنێکی دڵ و زمان و لاشە و ماڵ بۆ هیچ یەکێك نەکەیت تەنها بۆ (الله) نەبێت.**

**وە ڕوکنی یەکەم بەوە نەبێت نایەتەجێ، چونکە تەفسیری ڕوکنی یەکەم بەو شێوەیە کراوە لە حەدیسدا واتە لە شوێنی:** (أن تشهد أن لا إله إلاّ الله محمد رسول الله) **ڕستەی** (تعبدالله، ولا تشرك به شيئاً) **دانراوە لە حەدیسی دووەمەوە تاوەکو حەوتەم.**

**کەواتە: ڕوکنی یەکەمی ئیسلام نایەتە دی کە تەنها بە زمان بڵێیت:** (أشهد أن لا إلـه إلاّ الله، وأشهد أن محمداً رسول الله) **تاوەکو بە تەنهایی خوا نەپەرستیت و واز نەهێنیت لە شیرك. واتە ئەو کەسەی کە بەدەم شایەدی دەدات بەڵام بە تەنها خوا ناپەرستێت و لەگەڵ خوا هاوارو پەرستن بۆ پێغەمبەران** (عليهم الصلاة والسلام) **و پیاوچاکان یان شتی دی دەکات ئەوە شایەتمانەکەی دانەمەزراوەو سودی نیە. (وە ئەگەر لە سەرەتادا داشمەزرا بوو ئەوە هەڵوەشاوەتەوە).**

---

(1) صحيح مسلم : (ح / (١٩) والبخاري (٧٣٧٢).
(2) صحيح مسلم : (ح / ٢٣) .

٢. وە بۆمان دەرکەوت لە حەدیسی (٣، ٤، ٥) کە کاتێك دەبێتە شایستەی چوونە بەهەشتەوە کە پێش هەموو شتێك (تعبد الله لا تشرك به شيئاً) واتە (الله) بەتەنها بپەرستیت و هیچ شتێك نەکەیت بە شەریك بۆی.

٣. وە لە حەدیسی حەوتەم دەردەکەوێت کە کاتێك مرۆڤ خوێن و ماڵی پارێزراو دەبێت کە: بڵێ (لا إله إلاّ الله) وە (وحَّدَالله) واتە بە تەنها خوا بپەرستێت و هەروەها (وكفرَ بما يُعبد من دون الله). واتە بێ باوەڕیش بێت بەهەر شتێك کە دەپەرسترێت جگە لە خوا. واتە: بێ ئیعتیقاد بێت بە پەرستراوێتی ئەو پێغەمبەرو پیاوچاکانەی خەڵکی پەرستنیان بۆ دەکەن و هاواریان دەکەنێ.

کەواتە تەنها بەوە خوێن وماڵی ناپارێزرێت کە بڵێت: (لا إله الاالله) تاوەکو ئەم دوو مەرجەی تێدا نەبێت:

**مەرجی یەکەم:** (وحّد الله) خوا بە تەنها بپەرستێت و شەریکی بۆ دانەنێت لەپەرستندا.

**مەرجی دووەم:** (وكفرَ بما يُعبدُ من دون الله) واتە بێ باوەڕیش بێت و کافر بێت بە هەموو ئەوانەی خەڵکی پەرستنیان بۆ دەکەن و هاواریان دەکەنێ و دارای فریاکەوتنیان لێ دەکەن.

٤. وە لە حەدیسی (٦)دا دەرکەوت کە یەکەم شت بانگەوازیکار خەڵکی بۆلا بانگ بکات بریتییە لە تەنها پەرستنی خوا (فليكن أول ما تدعوهم إليه شهادة أن لا إله إلاّ الله وفي رواية ــ إلى عبادة الله ـ وفي روايةٍ [ إلى أن يُوحّدوا الله ]).

وە کە خەڵکی ئەمەیان زانی و تێگەیشتن و جێ بەجێیان کرد (فإن هم عرفوا ذلــك ــ وفي رواية ـ فإن هم أطاعوا لذلك). ئەوکاتە بانگیان دەکەیت بۆ ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکان.

کەواتە: هەرکەسێك لە ڕوکنی یەکەمی ئیسلام، کە بە تەنها خوا پەرستنە ـ لەوە نەگات و تەسلیمی نەبێت، سود لە نوێژ کردن وەرناگرێت؛ چونکە ڕوکنی یەکەم کە تەوحیدە بناغەی ڕوکنەکانی ترە، وە هەرکاتێك ئەم بناغەیە نەبوو ـ واتە خوا بە تەنها نەپەرسترا ـ ئەوا ڕوکنەکانی تر قەبوڵ نابن؛ چونکە بناغەکەیان زبڵەو شیرکە !! پەنا بەخوا.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە تەنها وتنی (لا إله إلاّ الله) کافی نیە نە لە دونیا بۆ پاراستنی خوێن و ماڵ هەتاسەر، وە نە لە قیامەت بۆ ڕزگار بوون لە دۆزەخ و بەختەوەر بوون بە بەهەشت.

بەڵکو لەگەڵ ئەم وتنەدا پێویستە بزانێت مانایەکەی چییەو بەدڵ ئیعتیقادی پێ بێت و بە کردەوەش بیسەلمێنێت بەشێوەیەکی وا کە تەنها خوا بپەرستێت و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکات و بێ باوەڕیش بێت بە هەموو ئەوانەی دەپەرستڕێن غەیری خوا واتە:

١. (العلم بمعناها): نفياً وإثباتاً.

٢. (العمل بمقتضاها): من عبادة الله وحدهُ ظاهراً وباطنا وعدم الإشراك به في شيء.

٣. (الكفر بما يُعبد من دون الله): ﴿ فمن يكفر بالطاغوت ويومن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى ﴾ أي بلا إله إلاّ الله.

وە کە مرۆڤ ماناکەی نەزانێت -ئەگەر بەکورتیش بێت- ئەوە هەر نەبووە بە موسڵمان، وە کە ماناکەیشی زانی بەڵام ئیعتیقادی بە ماناکەی نەبوو، ئەوە بە هەمان شێوە نەبووە بە موسڵمان. وە هەروەها بە زمانیش بڵێت و بە دڵیش ماناکەی بزانێت بەڵام عیبادەت بۆ غەیری خوا بکات، ئەوە موشریکە، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(من مات وهو يدعو من دون الله نِدّاً دخل النار)[1].

واتە: هەر کەسێك لەسەر ئەو حاڵەتە بمرێت کە پەرستن و هاواری بۆ غەیری خوا کردبێت ئەوە دەچێتە ناو ئاگرەوە.

* کەواتە بۆمان دەرکەوت کە تەنها وتنی (لا إلـه إلاّ الله) کافی نیە؛ چونکە مونافیقەکانیش دەیان وت (لا إله إلاّ الله) لەگەڵ ئەوەشدا لەپلەی ژێرەوەی دۆزەخدا دەبن ﴿ إنّ المنافقين في الدرك الأسفل من النار ﴾.

* وە هەروەها جولەکەکانیش دەیان وت (لا إله إلاّ الله) وە لەگەڵ ئەوشدا بە کافر حیساب کراون و ئەهلی دۆزەخن، وە پێغەمبەر ﷺ کوشتاریشی کردن.

* وە هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ جەنگان دژی هەڵگەڕاوەکان؛ ئەوانەی کە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ موسڵمان ببوون بەڵام دوای مردنی وتیان (مُسَیْلَمة)ش پێغەمبەرە.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەکافر و هەڵگەڕاوەیان دانان، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیان وت (لا إله إلاّ الله، محمد رسول الله) وە بانگیشیان دەداو نوێژیشیان دەکرد !

(١) صحيح البخاري .

کەواتە ئەگەر یەکێك بەلای هاوەڵانەوە بە کافرو هەڵگەڕاوە دابنرێت کە (موسەیلەمە) بهێنێتە ڕیزو پلەی پێغەمبەر ﷺ ، ئەدی چۆن ئەو کەسانە بە کافر دانانرێن کە پیاوچاکان و شێخەکان دەبەنە ڕیزو پلەی دروستکاری ئەرزو ئاسمان و پەروەردگاری جیهانیان!!. وە لەگەڵ ئەودا هاواریان دەکەنێ و سوێندیان پێ دەخۆن و لێیان دەترسن و داوای بە فریاکەوتنیان لێ دەکەن و بەگەورەیان دادەنێن و کڕنوشیان بۆ دەبەن ؟!

* وە هەروەها گومانی تێدا نیە کە هەر کەسێك نوێژ نەکات ئەوە داوای تۆبە کردن و نوێژ کردنی لێ دەکرێت. وە کە بەردەوام بوو لەسەر نوێژ نەکردن ـ دوای ئەوە ـ خوێنی حەڵاڵ دەبێت و دەکوژرێت و بە هەڵگەڕاوەش لە قەڵەم دەدرێت (مرتد). وە لە قەبرەستانی موسڵمانان نانێژرێت بەڵکو فڕێ دەدرێتە چاڵێکەوەو دادەپۆشرێت.

کەواتە ئەگەر ئەوە حاڵی کەسێك بێت کە وازی هێنابێت لە ڕوکنی دووەمی ئیسلام. ئەدی دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە وازی هێناوە لە ڕوکنی یەکەم و بناغەی ئیسلام، کە تەوحیدو تەنها خوا پەرستیەو دوورکەوتنەوەیە لە شیرك ؟!.

بێگومان هەر کەسێك ڕوکنی یەکەمی تەواو نەبێت واتە خوا بە تەنها نەپەرستێت و شەریکی بۆ دابنێت لە عیبادەتدا، ئەوا ئەو کەسە موشریکەو کافرەو زیاتر شایستەی ئەوەیە دوای ئاگادار کردنەوە ـ لەناو ببرێت.

چونکە شیرك بۆ خوا دانان گەورەترین تاوانە وەك پێغەمبەر ﷺ کە پرسیاری لێ کرا کامە گەورەترین تاوانە (أيُّ الذنب أعظم ؟!) فەرمووی:

(أن تجعل لله نِدّاً وهو خلقك)(١).

واتە: هاوبەش دابنێیت بۆ خوا کە تەنها ئەویش تۆی دروست کردووە !.

* وە هەروەها دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردو زۆر لە عەرەبەکان هەڵگەڕانەوە لە دین. وە کۆمەڵێکیشیان مەنعی زەکات دانیان کردو نەیان دەبەخشیە(بَيْتُ المال). بەڵام نوێژیان دەکردو دەیان وت (لا إله إلاّ الله، محمد رسول الله) وە شەریکیان بۆ خوا دانەدەنا و کەسی تریشیان بە پێغەمبەر دانەدەنا. بەڵام (أبوبكر الصديق) ـ ڕەزای خوای لێ بێت

---

(١) صحيح مسلم (ح / ٨٦) .

ـ دەستی کرد بە جەنگ کردن بەرامبەریان، وە عومەر ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ وتی: چۆن تۆ کوشتاری کەسێك دەکەیت کە شایەدی دەهێنێت و نوێژ دەکات لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

فەرمانم پێ کراوە کوشتاری خەڵکی بکەم تاوەکو دەڵێن: (لاإله إلاّ الله) وە ئەگەر وتیان لا إله إلاّ الله ئەوە خوێن و ماڵیان پارێزراوە تەنها بە حەقی ئیسلام نەبێت ؟!.

وە أبو بکر ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ ڕاست تر لەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ گەیشتبوو بۆیە وتی زەکات حەقی ئیسلامەو هەر کەسێك نوێژ بکات و زەکات نەدات ئەوە کوشتاری دەکەم.

لە دواییدا عمر ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ تێ گەیشت کە أبوبکر لەسەر حەقەو قەناعەتی کرد بە قسەکەی.

کەواتە: کەسێك زەکات نەدات خوێن و ماڵی ناپارێزرێت بە وتنی لا إله إلاّ الله و نوێژ کردنیش، ئەدی دەبێت حاڵی چۆن بێت کە کردەوەیەك بکات هەڵوەشێنەرەوەی (لا إله إلاّ الله) بێت و شەریك بۆ خوا بڕیار بدات لە پەرستندا ؟!.

* وەهەروەها بەڵگەی ئاشکرا تریش هەیە لەسەر ڕاستیتی ڕای أبوبکر بەڵگەکەش بریتیە لەو حەدیسەی کە (ابنُ عُمَر و أبو هريرة و أنس) ڕیوایەتیان کردووە .

١. عن أبي هريرة ﷺ عن رسول الله ﷺ قال :[ أُمِرتُ أن أقاتل الناسَ حتى يشهدوا أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً رسول الله، ويُقيموا الصلاة، ويؤتوا الزكاة، فإذا فعلوا ذلك عصموا منّي دمائهم وأموالهم إلاّ بِحَقِّ الاسلام، وحسابهم على الله تعالى ][1].

٢. وفي رواية عنه ـ عن رسول الله ﷺ قال: [ أُمرتُ أن أُقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلاّ الله، ويومنوا بي وبما جئتُ به، فإذا فعلوا ذلك عصموا منّي دِمائهُم وأموالهُم إلاّ بِحقّها، وحسابهم على الله تعالى ][2].

٣. عن عبدالله بن عمر ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ :

---

(١) صحيح مسلم (١ / ٥٣٥) .

(٢) صحيح مسلم (ح / ٢١) .

(أمرت أن، أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً رسول الله، ويقيموا الصلاة، ويوتوا الزكاة)[١].

٤. عن أنس ﷺ عن رسول الله ﷺ :

((أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً عبده ورسولُهُ، وأن يستقبلوا قِبْلَتنا، وأن يأكلوا ذبيحَتَنا، وأن يصلوا صلاتنا، فإذا فَعَلوا ذلك حُرِّمَتْ علينا دِماوهُم وأموالُهُم إلاّ بِحَقِّها، لهم ما للمسلمين وعليهم ما على المسلمين))[٢].

*** کەواتە لەم حەدیسانەدا دەرکەوت کە وتنی (لا إله إلاّ الله) پارێزەرێکی سەرەتایی و کاتییە بۆ خوێن و ماڵی ئەو کەسەی کە موشریك بووەو بە وتنی (لا إله إلاّ الله) دێتە ناو ئیسلام، وە بەو وشەیە دەست لە کوشتاری هەڵدەگیرێت، بەڵام دوای ئەوە سەیر دەکرێت ئەگەر تەوبەی کرد لە شیرك و خوای بە تەنها پەرست و نوێژی کردو زەکاتی دا، ئەوکاتە بە تەواوی و بە یەکجاری خوێن و ماڵی دەپارێزرێت و دەبێتە برامان. وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەم سێ مەرجەی داناوە بۆ خوێن پاراستن:**

﴿ فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فخلّوا سبيلهم ﴾ التوبة (٥).

**واتە: کوشتاری موشریکەکان بکەن...بەڵام ئەگەر تەوبەیان کرد لە شیرك و هاتنە سەر(تەنها خوا پەرستی) وە نوێژیان کردو زەکاتیان دا، ئەوکاتە ڕێگەیان بەردەن و دەست لەکوشتاریان هەڵگرن. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:**

﴿ فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فإخوانكم في الدين ﴾ التوبة (١١).

**واتە: ئەگەر دەستیان هەڵگرت لە شیرك و تەوبەیان لێ کردو خوایان بە تەنها پەرست و نوێژیان کردو زەکاتیان دا، ئەوکاتە برای دینیتانن.**

*** کەواتە تاوەکو ئەم سێ ڕوکنە ﴿١ـ تەوحید ٢ـ نوێژ ٣ـ زەکات ﴾ مەوجود نەبن لە کەسێکدا نابێت بە برای دینی و دەست هەڵناگیرێت لە کوشتنی.**

---

(1) مثل حديث أبي هريرة: صحيح مسلم (ح / ٢٢) .

(2) سنن الترمذي وقال: حديث حسن صحيح .

* وە هەروەها هەر کەسێك ئیمانی نەبێت بە پێغەمبەر ﷺ ، وە بە هەموو ئەم شەریعەتەش کە پێی هاتووە ﴿ویؤمنوا بي وبما جئت به﴾ ئەوە دەست هەڵناگیرێت لە کوشتنی. وەك لە حەدیسی دووەمی أبو هريرە دا دەرکەوت.

کەواتە بێگومان کە کەسێك ئیمانی بە ڕوکنی یەکەمی ئیسلام نەبێت؛ بە دڵ، یان بە زمان، یان بە کردەوە، بۆ نموونە: ئیعتیقادی بە غەیری خوا هەبێت، یان هاوار بکاتە غەیری خوا، یان زەلیلی بۆ غەیری خوا بنوێنێت و کڕنوشی بۆ بەرێت و سەر بڕینی بۆ بکات و بە گەورەی دابنێت و سوێندی پێ بخوات، ئەوە بێگومان حاڵی خراپ ترە لەحاڵی نوێژ نەکەرو زەکات نەدەر.

* وە کە مرۆڤ بەکافردابنرێت ئەگەر هاتوو ئیمانی بە بەشێك لە دینی پیغەمبەر ـ ﷺ ـ نەبێت ئەدی چۆن کافر نابێت کە ئیمانی بە بنچینەو بناغەی دینی ئیسلام نەبێت کە محمدیﷺ بۆ نێرراوە، کە بریتییە لە: خوا بە تەنها پەرستن و دوور کەوتنەوە لە عیبادەتی (طاغوت).

وە لە شەرحی ئەم حەدیسانەی پێشوودا زانایان فەرموویانە:

(وقد قال علماءُنا ـ رحمهم الله ـ: إذا قال الكافرُ لا إله إلاّ الله، فقد شرع في العاصم لدمه فيجب الكف عنه؛ فإن تَمَّمَ ذلك، تحققت العصمة، وإلا بطلتْ، ويكون النبي ﷺ قد قال كلّ حديثٍ في وقت. فقال: [ أُمرتُ أن أقاتل الناس حتى يقولوا: لا إله إلاّ الله ] ليعلم المسلمون أنّ الكافر المحارب إذا قالها كُفَّ عنه وصار دمهُ ومالهُ مُعَصمًا. ثم بيَّنَ ﷺ في الحديث الآخر أنّ القتال ممدودٌ إلى الشهادتين والعبادتين فقال: [ أُمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً رسول الله. ويقيموا الصلاة. ويوتوا الزكاة]. فبيَّنَ أنّ تمام العصمةِ وكمالها إنّما يحصل بذلك. ولِئلاّ تقع الشبهة بأنّ مجرد الإقرار بِعصم على الدوام، كما وقعت لبعض الصحابة حتى جلاّها أبوبكر الصديق ثم وافقوه ﷺ].

((أما مَنْ قال لا إله إلاّ الله محمد رسول الله وهو مقيمٌ على شركهِ؛ يدعو الموتى ويسألهم قضاء الحاجات وتفريج الكربات، فهذا كافرٌ مشركٌ حلال المالِ والدّم، وإن قال: لا إله إلاّ الله محمد رسول الله وصلّى وصام وزعم أنّه مسلم)) [١].

---

(١) [ الفواكه العِذاب في الرد على من لم يُحَكِّم السنة والكتاب ]للشيخ محمد بن الناصر آل معمر .

**ئیمامی (الخَطابي الشافعي) لە شەرحی حەدیسی (أبو هريرة) دا فەرموویەتی:**

((معلوم أنّ المراد بهذا أهل الأوثان دون أهل الكتاب، لِأنّهم يقولون: لا إله إلاّ الله ثم يُقاتلون ولا يُرْفَعُ عنهم السيفُ))[١].

**وە ئیمامی (النووي) فەرمووی:**

((وذكر القاضي عياض معنى هذا وزاد عليه وأوضحه، فقال: (اختصاص عصمة المال والنفس بمن قال: (لا إله إلاّ الله) تعبيرٌ عن الإجابة إلى الإيمان، وأنّ المراد بهذا مشركوا العرب وأهل الأوثان ومَنْ لا يُوحّدُ، وهم كانوا أوّل مَنْ دُعيَ إلى الإسلام وقُتلَ عليه، فأمّا غيرهم ممّن يُقرُّ بالتّوحيد، فلا يكتفي في عصمته بقوله: لا إله إلاّ الله، إذ كان يقولها في كفره، وهي من اعتقاده، فلذلك جاء في الحديث الآخر: [ وأنّي رسول اللهِ، ويقيموا الصلاة، ويوتوا الزكاة ] هذا كلام القاضي.

قلتُ ـ القائل هو النووي ـ: ولا بُدّ مع هذا من الإيمان بجميع ما جاء به رسول الله ﷺ كما جاء في الرواية الأخرى لِأبي هريرة، وهي مذكورةٌ في الكتاب:

((حتى يشهدوا أن لا إله إلاّ الله و يؤمنُوا بي وبما جئت به)) والله أعلم.

وفيه ـ أي في هذا الحديث دليلٌ على ـ أنّ الإيمان شرطُهُ الإقرارُ بالشهادتين مع اعتقادهما، واعتقاد جميع ما أتى به رسول الله ﷺ،... وفيه وجوب قتال مانعي الزكاة أو الصلاة أو غيرهما من واجبات الإسلام قليلاً كان أو كثيراً؛ لِقوله ـ رضي الله عنه ـ لو منعوني عقالاً أو عناقاً)[٢].

**وە ئیمامی الصنعانی فەرموویەتی:**

((قد قال ﷺ [ إلاّ بحقّها ] وحقُّها إفراد الإلهيّة والعبودية لله تعالى.

والقبوريون لم يفردوا الإلهية والعبادة فلم تنفعْهُم كلمة الشهادةِ فإنّها لا تنفعُ إلاّ مع التزام معناها. كما لم ينفع اليهود قولها لإنكارهم بعض الأنبياء وقد وقع إجماع الأمّة على مَنْ أنكر البعث كفر وقتل ولو قال لا إله إلاّ الله، فكيف بمن يجعل لله نِدّاً ؟.

وقال: فثبت أنّ مجرّد كلمةِ التوحيدِ غير مانع من ثبوت شرك مَنْ قالها لارتكابه ما يخالفها من عبادة غير الله.)) إ. هـ باختصار[٢].

---

(1) معالم السنن (٢ / ١١).

(٢) شرح صحيح مسلم للنووي (١ / ٥٣٦ ـ ٥٤٢).

(٢) تطهير الإعتقاد ص (١٠٩ ــ ١١١).

**وە زانا** محمد بن ناصر آل معمر ـ رحمه الله ـ **فەرموویەتی:**

قولكم: إنّ من قال لا إله إلاّ الله فقد عصم ماله ودمه وإن ترك الفرائض وارتكب المحرمات، مَنْ تأمّل سيرة النبي ﷺ وسيرة الخلفاء الراشدين المهتدين من بعده، عرف أنّ قولكم هذا مضادٌ لما فعله النبي ﷺ وما فعله الخلفاء الراشدون ومن بعدهم. فيا سبحان الله:

أما علمتم أنّ رسول الله ﷺ قاتل اليهود وهم يقولون: لا إله إلاّ الله، وسبى نساءهم واستحلّ دمائهم.

أما علمتم أنّ رسول الله ﷺ أراد أن يغزو بني المصطلق لما قيل له إنهم منعوا الزكاة، وكان الذي قاله كاذباً، والقصة مشهورة في كتب الحديث والتفسير، ذكرها المفسّرون عند قوله تعالى: ﴿ يا أيها الذين آمنوا إن جاءكم فاسقٌ بنبأ فتبيّنوا﴾ الحجرات (٦).

أما علمتم أنّ عليّ بن ابي طالب ﷺ حرّق الغالية مع أنهم يقولون لا إله إلاّ الله ؟.

أما علمتم أنّ الصحابة ـ رضي الله عنهم ـ قاتلوا الخوارج بأمر نبيّهم ﷺ مع أنّه ﷺ أخبر أنّ الصحابة يحقرون صلاتَهم مع صلاتِهم وصيامَهم مع صيامِهم، وقِراءتَهم مع قراءتِهم وقال: [ أينما لقيتموهم فاقتلوهم ].

أما علمتم أنّ الصحابة قاتلوا بني حنيفة وهم يشهدون أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً رسول الله و يُصَلُّون ويُوذِّنون ؟.

أما علمتم أنّ الصحابة قاتلوا بني يربوعٍ لما منعوا الزكاة، مع أنهم مقرُّن بوجوبها وكانوا قد جمعوا صدقاتهم وأرادوا أن يبعثوا بها إلى أبىبكر فمنعهم مالك بن نويرة. وفي أمر هولاءِ عرضت الشبهة لعمر ـ رضي الله عنه ـ حتى جلاّها الصدّيق ﷺ وقال:

[والله لو منعوني عقالاً ـ وفي روايةٍ عناقاً ـ كانوا يودونها إلى رسول الله ﷺ لقاتلتهم على منعها فقال عمر: فوالله ما هو إلاّ أن رأيتُ اللّه قد شرح صدر أبي بكر للقتال فعرفت أنه الحق.

أما علمتم أن رسول الله ﷺ بعث صاحب الراية إلى رجلٍ تزوّج امرأة أبيه، كما رواه الترمذي... عن البراء قال: مرّ بي خالي أبو بردة ومعه لواء فقلتُ أين تريد ؟ فقال: بعثني رسول الله ﷺ إلى رجلٍ تزوّج امرأة أبيه أن آتِيَهُ برأسه ][1].

(1) حديث حسن غريب.

ولو تتبعنا الآيات والأحاديث والآثار وكلام العلماء في قتال مَنْ قال: لا إله إلاّ الله إذا ترك بعض حقوقها لطال الكلام جدّاً، فكيف بمن ترك الإسلام كلّه،وكذب به، واستهزء به على عمدٍ إلاّ أنّهم يقولون: لا إله إلاّ الله كهولاءِ البوادي)ا . هـ[1].

کەواتە بۆمان دەرکەوت ئەگەر هاتوو کافرێکی موشریك بڵێت: (أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أن محمداً رسول الله) ئەوە بەم شایەتیە دێتە ناو دینی ئیسلام ـ بە زاهیری ـ، بەڵام دوای ئەوە سەیر دەکرێت، ئەگەر هاتوو نوێژیشی کردوو زەکاتیشی داو ئیمانی هێنا بە هەموو ئەو شەریعەتەی کە محمد ﷺ پێی نێرراوە، ئەوا بەیەکجاری لە دونیا خوێن و ماڵی پارێزراو دەبێت. (إلاّ بحقّها) واتە تەنها کاتێك خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێت کە حەقێکی ئیسلامی بکەوێتە سەر، بۆ نمونە بە نوێژ نەکردن و زەکات نەدان خوێنی حەڵاڵ دەبێت. وە هەروەها بە کوشتنی موسڵمانێك بە ناحەقی و دەست درێژی (عمداً عدواناً)، هەر خوێنی حەڵاڵ دەبێت، ئەگەر چی شایەدیش بێنێت و نوێژیش بکات.

وە هەروەها خوێنی حەڵاڵ دەبێت ئەگەر هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام (نواقض الإسلام) بکات وەك:

١. شەریك دانان بۆ خوا لە پەرستندا، کەلەگەڵ خوادا هاوار کردنە پیاوچاکان و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و، کردنیان بە واسیتە لە نێوان خۆیان و خوادا.

٢. یان گاڵتە بە ئیسلام بکات یان جنێو بە ئیسلام بدات.

٣. یان دۆستایەتی کافرو موشریکان بکات و یارمەتیان بدات بۆ سەرخستنی کوفرەکەیان بەسەر ئیسلامدا.

٤. یان بە دروستی بزانێت حوکم بە غەیری ئیسلام بکات.

٥. یان بڵێت ئیسلام بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێت !.

٦. یان ڕقی لە موسڵمانان بێتەوە لەبەر دینەکەیان...

کەواتە هەر کەسێك یەکێك لەم کوفرانە بکات ئەوە بە شایەتمانیەکەی، خوێن و ماڵی ناپارێزرێت، بەڵکو خوێنی حەڵاڵ دەبێت و بە کافریش دادەنرێت،بەڵام دوای ئاگادار کردنەوەو تێگەیاندن (بعد إقامة الحجة عليه).

---

(1) الفواكه العذاب، ص (٨٦ ــ ٨٨).

## شوبهەی نۆزدەهەم

# ئەگەر هاوارکردنە غەیری خوا شیرکە، ئەدی بۆ وەڵامیان دەدرێتەوەو، جار جار داواکاریەکانیان دێنە جێ ؟!.

دوای ئەوەی لە شەرعدا بۆمان دەرکەوت کە:

هەر یەکێك هاوار بکاتە غەیری خوا، ئەوە سەرەڕای گوناه گەیشتن، هیچ قازانجێك ناکات لە داواکاریەکەی؛ چونکە کەس هیچی بەدەست نیەو سودو زیان تەنها بەدەست خوایە. وەفریشتەو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان، هێنانی قازانج و لادانی زەرەریان بەدەست نیە، نەبۆخۆیان وە نەبۆ غەیری خۆشیان. وە ئەگەر هاواریشیان بکرێتێ هاواری کەس نابیستن، وە ئەگەر وای دابنێین ـ فَرضاً ـ بشبیستن، هەر وەڵامیان پێ نادرێتەوە و، داواکاری کەسیان پێ جێ بەجێ ناکرێت !!.

دوای ئەم ڕاستیە، ئایا بۆچی لەواقیعدا دەبینین، یان دەبیستین کە هەندێك لەو شەخس پەرستانەی کە هاوار دەکەنە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکان و دەڵێن (یا محمد، یا شیخ عبدالقادر هاوار...)، دەبینین هەندێك جار وەڵامی داواکاریەکەیان دەدرێتەوە، هەندێك داواکاریان دێتە جێ ؟!.

وە لەوەش زیاتر هەندێك لەوانە بە شمشێر لاشەی خۆی کون کون دەکات و، دەچێتە ناو ئاگر و، شوشە دەخوات، بێ ئەوەی هیچ زیانیشی پێ بکەوێت ؟!.

ئایا ئەم واقیعە چۆن لێك دەدرێتەوەو تەفسیر دەکرێت بەگوێرەی قورئان وسوننەت؟!. وە ئایا ئەو دیادە سەیرو ناعادەتیانە کەرامەت نین، وە نیشانەی ئەوە نین کە ئەوان وەلی خوای پەروەردگارن؟!.

# هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی نۆزدەهەم

لە وەڵامدا ـ بە پشتیوانی خوا ـ دەڵێم: لێکدانەوەی ئەم واقیعەو تێگەیشتنی، پێویستی بە تێگەیشتنی چەند ڕاستیەك (حەقیقەتێك) هەیە، کە وەك پێشەکیەکن بۆ نەتیجەیەك کە وەڵامی پرسیارەکەیە:

چەند پێشەکیەك و ئەنجامێك هەیە:

ڕاستی یەکەم: لە ڕابوردوودا بە بەڵگەکانی شەرع تەواو دڵنیا بوویت ـ إن شاء الله ـ کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان و فریشتەکان، ناتوانن وەڵامی کەس بدەنەوەو داواکاری کەس بەجێ بگەیەنن.

ڕاستی دووەم: زانیت کە هاوارکردنە غەیری خوا شیرکە، وە لە دونیادا واسیتەکردن بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان بۆ نزیك کردنەوەو شەفاعەت بۆ کردن لای خوا، دوای مردنیان کوفرەو، خوا لەم کارە ڕازی نیەو فەرمانی لەسەر نیە.

ڕاستی سێهەم: شەیتانە جنۆکەکان هانی خەڵکی دەدەن، هاوار بکەنە غەیری خوا، وە خەڵکیش بەقسەیان کردوون و، تووشی شیرك بوون و، کەوتونەتە داوی شەیتان، وە شەیتانەکان دەپەرستن، چونکە کە هاواری هەر یەکێك بکەن جگە لە خوا، ئەوە هاوارەکە بەقسەی شەیتانەو نەتیجەشی هەر بۆ شەیتانە. وەك خوا دەفەرموێت:

﴿ إن يدعون من دونه إلا إناثاً وإن يدعون إلا شيطاناً مريداً ﴾ النساء (١١٧)

واتە هاواریان بۆ غەیری خوا بۆ کەس نیە، تەنها بۆ شەیتانێکی یاخی بوو نەبێت.

وە شەیتانە جنۆکەکانیش، بۆ ئەوەی زیاتر خەڵکە گۆڕپەرستەکان دڵیان خۆش بێت بەهاوارکردنە غەیری خواو شەریك بۆ خوا دانان و، بەردەوام بوونیان لەسەر شیرك و، گومڕاکردنی خەڵکانی تریش، کە سادەو بێ ئاگان لە قورئان و حەدیس. جا کاتێ کە خەڵکی هاوار دەکەنە هەر یەکێ جگە لەخوا، یەکسەر شەیتانە جنۆکەکان لەم پێناوەدا هەوڵی جێ بەجێ کردنی داواکاریەکەی دەدەن، ئەگەر لەتوانایاندا هەبێت.

وە بەردەوام شەیتانە جنۆکەکان ئامادەن لای ئەم قەبرانەی کە خەڵکی زیارەتیان دەکەن و، بە ئیعتیقادەوە هاواریان دەکەنێ. وە جاری وا هەیە ڕووناکیەك نیشانی خەڵکەکە دەدەن، یان

دەنگێك دەكەن و قسەیەك دەكەن، یان خۆیان دەخەنە سەر شێوەی مردوە هاوارلێ كراوەكەو، خۆیان نیشانی ئەو كەسە دەدەن كە هاوار دەكاتە مردوەكە، وە هەندێك شتیان پێ دەڵێن بۆ ئەوەی زیاتر گومڕایان بكەن و، وابزانن كە ڕوحیانەتی مردوەكەیە قسەیان لەگەڵ دەكات، یان پیاوچاكەكە زیندووە بە بەردەوامی و ئاگای لە خەڵكەكەیەو، وەڵامیشیان دەداتەوە.

وە خەڵكە نەفامەكە نازانن ئەمە شەیتانەو دەیەوێت گومڕایان بكات. هەروەكو پەروەردگار لە قورئاندا ئەم ڕاستیانەی بۆ دەرخستووین و دەفەرموێت:

﴿ ويوم يحشرهم جميعا يا معشر الجنِّ قد استكثرتم من الإنسِ، وقال أولياوهم من الإنس ربّنا استمتع بعضنا ببعضٍ وبلغنا أجلنا الذي أجّلت لنا قال النار مثواكم خالدين فيها إلاّ ما شاءَ الله إنّ ربّك حكيم عليم وكذلك نولي بعض الظالمين بعضاً بما كانوا يكسبون﴾ الأنعام (١٢٨)

واتە: یادی ئەو ڕۆژە بكە ـ ئەی محمد ـ كە پەروەردگار، كافرەكان و پەرستراوەكانیشیان (لە شەیتانە جنۆكەكان)، كۆدەكاتەوە و پێیان دەفەرموێت:

ئەی كۆمەڵی جنۆكە، خەڵكێكی زۆر لەم مرۆڤانەتان گومڕاكرد. وە مرۆڤە كافرە موشریكەكانیش دیفاع دەكەن و دەڵێن: ئەی پەروەردگار ئێمە هەردوولا سودمان لە یەكتری وەردەگرت؛ كە بەگەورەمان دادەنان و پەنامان پێ دەگرتن و هاوارمان دەكردنێ. وە ئێمەش قازانجی ئەوەمان لێ دەكردن كە جار جار وەڵامیان دەدایینەوەو هەندێك داواكاریان بۆ جێ بەجێ دەكردین)[1].

---

(1) وقال الإمام المفسِّر الحافظ ابن كثير ـــ رحمه الله ـــ:يقول تعالى: واذكر يا محمد فيما تقُصُّه عليهم وتنذرهم به ﴿ويوم يحشرهم جميعا﴾ يعني الجن وأولياؤهم من الإنس الذين كانوا يعبدونهم في الدنيا، ويعوذون بهم ويطيعونهم ويوحي بعضهم إلى بعض زخرف القول غرورا ﴿يامعشر الجنِّ قد استكثرتم من الإنس﴾ أي ثم يقول يا معشر الجن، وسياق الكلام يدلُّ على المحذوف. ومعنى قوله ﴿قد استكثرتم من الإنس﴾ أي من إغوائهم وإضلالهم، كقوله تعالى ﴿ألم أعهد إليكم يا بني آدم ألاّ تعبدوا الشيطان؛ إنه لكم عدوٌّ مبين. وأن اعبدوني هذا صراط مستقيم. ولقد أضل منكم جبلاً كثيرا أفلم تكونوا تعقلون﴾.

﴿وقال أولياوهم من الإنس ربّنا استمتع بعضنا ببعضٍ﴾ يعني أن أولياء الجن من الإنس قالوا مجيبين لله تعالى عن ذلك هذا...قال الحسن: وما كان استمتاع بعضهم ببعض إلاّ أن الجن أمرت، وعملت الإنس. وقال ابن جريج: كان الرجل في الجاهلية ينـزل الأرض، فيقول أعوذ بكبير هذا الوادي. فذلك استمتاعهم، فاعتذروا به يوم القيامة.

وە خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ إنّ الذين اتقوا إذا مسّهم طائفٌ من الشيطان تذكروا فإذا هم مبصرون، وإخوانهم يمدّونهم في الغيّ ثمّ لا يقصرون ﴾ الأعراف (٢٠١ ـ ٢٠٢).

واتە: ئەو کەسانەی کە بە تەقوان و خۆیان لە بێ شەرعی و، تووڕەیی خوا دەپارێزن، ئەگەر وەسوەسەو پیلانی شەیتانیان بۆ بێت، بیرەکەنەوە کە ئەمە لە شەیتانەوەیەو، شەیتانیش دوژمنیانەو دەیەوێت گومڕایان بکات؛ بۆیە یەکسەر سەرپێچی لە فەرمانی شەیتان دەکەن و، خۆیان دەپارێزن لە فێڵەکانی و دوور دەکەونەوە لە داوو وەسوەسەکانی.

بەڵام براکانی شەیتانە جنۆکەکان، کە ئەو کەسانەن هاوار دەکەنە غەیری خواو بەقسەی شەیتان دەکەن و بێ فەرمانی خوا دەکەن - ئەم برایانەی شەیتانەکان، یارمەتیان دەدەن و، مەدەدیان بۆدەهێنن و، لە دویان دەدەن بۆ گومڕاکردن و لاڕێ بوون: ﴿ يمدّونهم في الغيّ ﴾ وە زۆر کاریان بۆ ئەنجام دەدەن.

وە هەروەها هیچ لایەکیان کەمتەرخەمی ناکەن لە یارمەتی دانی یەکتری:

مرۆڤە گۆڕپەرستە سەر لێ شێواوەکان، کەمتەرخەمی ناکەن لە بەقسەکردنی وەحی و فەرمانەکانی شەیتانەکان.

وە جنۆکە شەیتانەکانیش کەمتەرخەمی ناکەن لە یارمەتی دانی دۆستەکانیان لە گومڕایەتی !! .

وە هەروەها پەروەردگار پێی ڕاگەیاندون کە هەرکەسێك واز لە قورئان بهێنێت و بەقسەی قورئان نەکات و، تەنها هاوار نەکاتە خوا؛ ئەوا پەروەردگار شەیتانێکی بۆ تەرخان دەکات و دەیکات بە هاوەڵی. وە ئەم شەیتانەش ئەو مرۆڤە گومڕا دەکات کە لە قورئان پشتی هەڵکردووە، وە لە ڕێگای ڕاست لای دەدات.

---

وأما استمتاع الجن بالإنس، فإنّه كان فيما ذكر ما ينال الجن من الإنس؛ من تعظيمهم إيّاهم في استعانتهم بهم، فيقولون قد سدنا الإنس والجن).إ.هـ المراد منه ((تفسير القرآن العظيم))(٢/١٦٧،١٦٨).

وقال الشيخ المفسِّر عبدالرحمن بن ناصر السعدي ـ رحمه الله ـ في تفسيره لهذه الآية:[ ربّنا استمتع بعضنا ببعضٍ]: أي تمتَّعَ كل من الجنّي والإنسي بصاحبه، وانتفع به. فالجنّي يستمتع بطاعة الإنسي له، وعبادته وتعظيمه، واستعاذته به. والإنسي يستمتع بنيل أغراضه، وبلوغه بسبب خدمة الجنّي له بعض شهواته، فإن الإنسي يعبد الجنّي، فيخدمه الجنّي، ويحصل له منه بعض الحوائج الدنيوية.

﴿ ومَنْ يَعشُ عن ذكرِ الرحمنِ نقيِّضْ له شيطاناً فهو لهُ قرين، وإنهم ليَصُدّونهم عن السبيل ويحسبون أنهم مهتدون﴾ الزخرف (٣٦ ــ ٣٧).

کەواتە لە سزای واز هێنانیان لە قورئان، کە فەرمانی پێ کردبوون تەنها هاوار بکەنە خوا، وە لەگەڵ ئەودا هاوار نەکەنە هیچ یەکێکی تر. وە تەنها ئەو بپەرستن و هیچ شەریکی بۆ دانەنێن لەسزای ئەوە کە فەرمانی خوایان شکاند بۆ فەرمانی شەیتان. خوای گەورە شەیتانێکی بۆ هەر یەکێکیان داناوە کە ببێتە هاوەڵی و بەردەوام لێی جیا نەبێتەوە.جا ئەوکاتە ئەو هاوەڵە شەیتانانەی، زیاتر ئەو کەسانە گومڕا دەکەن و بەشێوەیەکی واش گومڕایەتیەکەیان بۆ دەڕازێننەوە کەوا حیساب بکەن هیدایەت دراون و، لەسەر حەقن.

بۆ نمونە: شیرك و گۆڕپەرستی و هاوەڵ دانان بۆ خوا، دەڕازێنێتەوە لەپێش چاویان، و وای دەردەخات کە کارێکی چاکە و، بەو ڕێگایە لەخوا نزیك دەبنەوەو ئەوە ڕێز گرتنە لە پیاوچاکان!!

وە ئەو شەیتانە جنۆکانە؛ بە ویستی خوای گەورە توانای زۆریان هەیە بۆ نمونە دەتوانن بەزووترین کات و کەمتر لە ڕۆژێك مرۆڤ بفڕێنن لە عیراقەوە بۆ (مەککە) و بیگەڕێننەوە هەروەك چۆن یەکێك لە جنۆکەکانی ژێر دەستی پێغەمبەر(سلێمان) ﷺ وتی: من دەتوانم عەرشی پاشا ئافرەتەکەی(سەبەئ) لە یەمەنەوە بۆ بهێنم بۆ شام (بيت المقدس) پێش ئەوەی تۆ ـ ئەی سلێمان ـ لە جێگای خۆت هەڵسیت.

﴿ قَالَ عِفْرِيتٌ مِنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ﴾ (النمل:٣٩).

وە دەتوانن خۆیان بهێننە سەر شکڵی مرۆڤ و، لە شێوەی پیاوچاکانی غائیب، یان مردوو خۆیان نیشان بدەن.

وە هەروەها دەتوانن بچنە ناو لاشەی مرۆڤ و دەتوانن بەخێرایی لە بۆشایی ئاسمان بێن و بچن. وە بە توانان لەسەر زۆر کاری تر کە بەهیچ شێوەیەك لەتوانای مرۆڤدا نین و جێگای سەرسوڕمانی مرۆڤن.

وە لە پاڵ ئەوەدا کە پەروەردگار ئەم توانا زۆرەی داوە بەجنۆکە، مۆڵەتیشی داون لە دونیادا لەسەر ڕێگای ڕاست دابنیشن و هەوڵی گومڕاکردنی مرۆڤەکان بدەن و لەڕێ لایان بدەن. شەیتان وتی:﴿ لأقعدن لهم صراطك المستقيم ﴾.

بەڵام ناتوانن ئەو بەندانەی خوا گومڕا بکەن کە تەنها بەندەی پەروەردگارن و هاوار لە ئەو دەکەن و پشت بەو دەبەستن. بەڵکو دەسەڵاتیان تەنها بەسەر ئەوانەدا هەیە کە دۆستایەتیان دەکەنەو بە تەنها هاوار ناکەنە خواو، پشت بە غەیری ئەو دەبەستن و، فەرمان لە غەیری ئەو وەردەگرن. وەك لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت:

﴿ فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم، إنّهُ ليس لهُ سلطانٌ على الذين آمنوا وعلى ربّهم يتوكّلون، إنّما سلطانهُ على الذين يتولّونهُ والذين هم به مشركون ﴾ النحل (٩٨ - ١٠٠).

واتە: پەنا تەنها بەخوا بگرە لەشەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی خوا؛ چونکە بەڕاستی شەیتان دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوانەی باوەڕیان هێناوە کە تەنها خوا پەرستارو (معبود)ی حەقەو، بەکردەوەش تەنها هەر پشت بە ئەو دەبەستن و ئیعتیماد دەخەنە سەر ئەو.

بەڵام دەسەڵاتی ئەو تەنها بەسەر ئەوانەدایە، کە گوێ ڕایەڵی دەکەن و بە وەسوەسەی ئەو ئیعتیقادیان بۆ دروست بووە بەغەیری خواو هاوار دەکەنە غەیری خواو پشت بە غەیری خواش دەبەستن. وە بەو گوێ ڕایەڵی کردنەی شەیتان بوونە بەندەی شەیتان و شەیتانیان کردووە بە شەریك بۆ خوا لە گوێ ڕایەڵی کردنی.

کەواتە؛ جنۆکە شەیتانەکان بەهەموو شێوەیەك هەوڵی گومڕا کردنی مرۆڤ دەدەن. وە پەروەردگاریش جۆرێك لە توانای پێ بەخشیون کە ببنە هۆی گومڕا کردنی ئەو مرۆڤانەی شوێن قورئان ناکەون و تەنها پشت بە خوا نابەستن و هاوار دەکەنە غەیری خوا.

**بەڵام ئایا بۆ پەروەردگار مۆڵەتی داون زیاتر خەڵکی گومڕا بکەن؟!. بۆچی پەروەردگار وای کردووە کە مرۆڤ تەنها هاوار بکاتە خوا - ناتوانێت بچێتە ناو ئاگرلە عادەتدا - وە ناتوانێت شوشە بخوات و شمشێر لەخۆی بدات بێ ئەوەی زەرەری لێ بدات، وە زۆر کەسی تەنها لە خوا داواکاریش هەیە بەڵام وەڵامەکەی نابینێت لەواقیعدا ؟.**

**بەڵام کە هاواری کردە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان دەبینین هەندێك لە داواکاریەکانی دێتەجێ، وە دەشتوانێت بچێتە ناو ئاگر و، شمشێریش لەخۆی بدات بێ ئەوەی زیانی بەرکەوێت ؟!**

**لە وەڵامدا:**

زانیمان کە شەیتانە جنۆکەکان یارمەتی ئەو کەسانە دەدەن کە هاوار دەکەنە غەیری خواو شەریکی بۆ پەیدا دەکەن لەپشت پێ بەستن و ئیعتیقاد پێ بوون.

وە پەروەردگار بۆیە مۆڵەتی شەیتانە جنۆکەکانی داوە ئەم یارمەتییەی ئەو جۆرە گۆڕپەرستانە بدەن؛ بۆ ئەوەی خوای گەورە بەندەکانی بە یەکتری تاقی بکاتەوەو تەنها بۆ تاقیکردنەوەش دروستی کردوون.

جنۆکەکان بە مرۆڤەکان تاقی دەکاتەوە؛ ئایا خۆیان لێ دەگۆڕێت بەوە کە هەندێك لە مرۆڤەکان هاواریان دەکەنێ و بەقسەیان دەکەن، ئایا بەوە ڕازی دەبن بکرێن بەشەریکی خوا ؟!

وە هەروەها مرۆڤەکانیش بە جنۆکەکان تاقی دەکرێنەوە ئایا ئەگەر بینیان ئەو کەسانەی هاوار دەکەنە غەیری خوا هەندێك جار وەڵامیان دەدرێتەوەو داواکاریان جێ بەجێ دەبێت و دەتوانن هەندێك شتی ناعادەتی بکەن بەهۆی یارمەتی جنۆکەو شەیتانەکان؛ ئایا مرۆڤەکان کە ئەوەیان بینی باوەڕیان پێ دەکەن و لە تەنها هاوار کردنە خوا لادەدەن بۆ هاوار کردنە غەیری خواو ئیعتیقاد بوون بە غەیری خواو پشت بەستن بەغەیری خوا ؟!

ئا بەم شێوەیە پەروەردگار بەندەکانی تاقی دەکاتەوە، جا ئەوەی خوا پەرست بێت و شوێن کەوتەی قورئان بێت، کاتێك ئەم دیاردانە دەبینێت یەکسەر دەزانێت ئەمە تاقی کردنەوەیە نەك بەخشیش (**فتنةٌ ومِحنةٌ لا مِنْحة**)

* وە دەزانێ ئەمە گومڕاییە نەك ڕێز لێنان (**ضلالة لا كرامة**)؛ چونکە کەرامەت و بەخششی خێری خوایی بۆ ئەو کەسانەیە کە:

١. ئیمانیان بە تەنها پەرستراوێتی خوا هەیە و، هیچ یەکێکی تر بە شیاوی پەرستن نازانن و ناپەرستن و هاواری ناکەنێ.

٢. لە خواش دەترسێن و گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن و خۆ پارێزی دەکەن لە نەهیەکانی. وە پەروەردگار ئەم دوو مەرجەی داناوە بۆ پیاوچاکێتی و خۆشەویستێتی لەلایەن خواوە (الولاية).

﴿ ألا إنّ أولياء الله لا خوفٌ عليهم ولا هم يحزنون الذين آمنوا وكانوا يتقون ﴾.

واتە: خۆشەویستانی خوا (أولیاء الله) نەترسیان لەسەرە وەنە غەمباریش دەبن. ئەوانـەی کـە ئیماندارن و بەتەقوان.

کەواتە کەسێك کە:

١. تەنها ئیمان و ئیعتیقادی بەخوا نەبێت بەڵکو لەگەڵ خوا ئیمان و ئیعتیقادی بەغـەیری خواش هەبێت کە سودو قازانجو زەرەرو زیانی بەدەست بێت.

٢. تەقوای خوا نەکات و فەرمانەکانی جێ بەجێ نەکات کـە گـەورەترین فـەرمانی تـەنها پەرستنیەتی و بەتەنها هاوار کردنە ئەوە. وە کەسێك خۆی لە نەهیەکانی خوا نـەپارێزێت کـە گەورەترین نەهی لە شیرك و هاوار کردنە غەیری خوایە. ئەو کەسەی ئەم سیفەتەی تێدا نەبێت ئەوە لە خۆشەویستانی خوا (أولیاء الله) نیە بەڵکو لە خۆشەویستانی شـەیتانە (أولیاء الشیطان) چونکە بە فەرمانی شەیتان هاوار دەکاتە غەیری ڕەحمان.

وە هەروەکو خوای گەورە یارمـەتی خۆشەویـستانی خـۆی دەدات، هـەروەها شـەیتانیش تـا ڕاددەیەك یارمەتی دۆستانی خۆی دەدات؛ بەجێ بەجێ کردنی داواکاریەکانیان و خەبەر پێدانی هەندێك شتی نادیارو، بۆ ئاسان کردنی هەندێك کاری لە عـادەت بـەدەر بـۆ ئـەوەی زیـاتر گـومڕایان بکات و دڵیان خۆش بکـات بەڕێبازەکـەیان و وابـزانن کـە لەسـەر ڕێـی ڕاسـتن و هیدایەت دراون !!. وە بۆ ئەوەی خەڵکی وابزانن کە بـەهۆی هـاوار کردنـە پیاوچـاکەکە ئـەم ئیشەیان بۆ ئاسان بووەو، جەنابی شێخ وەڵامی داونەتەوەو یارمەتی داون.

وە زانیمان پەروەردگار مۆڵەتی داوەتە شەیتان کە دەور ببینێت بۆ ئەوەی بـەنـدەکانی تاقـی بکاتەوە، وە زۆر جار پەروەردگار بە زۆرشت بەندەکانی تاقی دەکاتەوە بۆئـەوەی دەرکـەوێت کـێ لەسەر حەق دەمێنێتەوە و کێش هەڵدەخەڵەتێ. بۆ نمونەش چەند ئایەتێك دەهێنینەوە:

### نمونەی یەکەم:

١. ﴿واسألهم عن القرية التي كانت حاضرة البحر إذ يعدون في السبت إذ تأتيهم حيتانهم يوم سبتهم شُرَّعاً ويوم لايسبتون لاتأتيهم كذلك نبلوهم بما كانوا يفسقون﴾ ١٦٣ الأعراف.

واتە: ئەی ـ محمد ـ پرسیار بکە لە جولەکەکان لە خەبەری ئەو گوندەی کە لە نزیك دەریای سوور بوو، چۆن بێ فەرمانی خوایان کرد لە ڕۆژانی شەممەدا کە خـوا قەدەغـەی کردبـوو ڕاوی

تێدا بکەن، کاتێك کە خوای گەورە تاقیکردنەوە بەوەی کە ماسیەکان لەو ڕۆژەدا زۆر دەبوون و دەهاتنە قەراغی دەریا. بەڵام کە شەممە دەڕۆیشت و، ڕاویان بۆ حەڵاڵ دەبوو؛ هیچ ماسی نەدەهات، بەم شێوەیە پەروەردگار تاقی کردنەوە بۆ ئەوەی دەرکەوێت؛ ئایا سنوری خوا دەبەزێنن و، لەو ڕۆژە قەدەغەکراوەدا ڕاوی ماسی دەکەن، یان پابەند دەبن بەسنوری خواو، لەتاقی کردنەوەکە سەرکەوتوو دەبن. بەڵام سەرکەوتوو نەبون، بەهۆی دەرچوونیان لە فەرمانی خوا، کە فێڵیان دەکرد لەڕۆژی شەممەدا وە ڕاستەوخۆ ڕاویان نەدەکرد، بەڵکو دەچوون چاڵیان لێدەدا لە جومعەدا بە شێوەیەکی وا کە ماسیەکان بە شەپۆلەکان بکەونە ناو چاڵەکانەوەو نەتوانن بگەڕێنەوە ناو دەریاوە. وە ڕۆژی یەك شەممەش دەهاتن دەیان گرتن و، دەشیان وت ئێمە ڕۆژی شەممە ڕاومان نەکردووە !!.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە پەروەردگار بەوە خەڵکی گوندەکەی تاقی کردەوە کە ئەو شتەی لێی قەدەغە کردبوون بۆشی ئاسان دەکردن و دەیخستە بەردەستیان لە شەمماندا، بۆ ئەوەی دەرکەوێت ئایا گوێڕایەڵی خوا دەکەن، یان بە واقیعەکە دەخەڵەتێن؟!.

بە هەمان شێوەش پەروەردگار حەرامی کردووە هاوار بکرێتە غەیری خۆی، بەڵام بەندەکانیشی بەوە تاقی دەکاتەوە، کە هەندێك لەوانەی هاواریان کردۆتە پیاوچاکان لەناو گۆڕەکانیادا داواکاریەکەیان جێبەجێ بووە !!.

جا دڵ نەخۆشە نەفامەکان بەمە خەڵەتاون و باوەڕیان بەمە کردووە، هەرچەندە خواش حەرامی کردووە، بەڵام شەیتان بۆی ڕازاندونەوە بەناوی واسیتەو شەفاعەت بۆ کردن لای خوا !. هەروەکو خەڵکی گوندەکە(أصحاب السبت) لە جومعە خەندەقیان لێدەداو، لە یەك شەممەدا هەڵیان دەگرتەوە، وە بەم فێڵە وایان دەزانی کە بێ فەرمانی خوایان نەکردووەو خۆیان بەتاوانبار دانەدەنا !.

## ٦- نمونەیەکی تر لەسەر تاقی کردنەوەی خوایی:

(پەروەدگار ماڵێکی زۆری بەخشیوە بەکافران، وە لەزۆر ناڕەحەتیش ڕزگاریان دەکات نەك لەبەرئەوەی خۆشی دەوێن، بەڵکو بۆئەوەی ئەوانیش و بڕوادارانیشی پێ تاقی بکاتەوە. چونکە نەفامی وا هەیە وا گومان دەبات کە خوا خۆشی دەوێن و لێیان ڕازیە بۆیە ئەوانی لەش ساغ و دەوڵەمەند کردووە.

هەروەك پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت: ﴿ ولا تمدنَّ عينيكَ إلى ما متّعنا به أزواجاً منهم زهرةَ الحياة الدنيا لنفتنهم فيه، ورزقُ ربّك خيرٌ وأبقى ﴾ طه (١٣١).

واتە سەیری ئەو نازو خۆشییە مەکە، کە بە موشریکەکانم بەخشیوە؛ چونکە ئەم ڕابواردنەیان تەنها جوانی دونیایە پێمان بەخشیون، بۆئەوەی تاقیان بکەینەوە.

کەواتە بەهەمان شێوەش کە گۆڕپەرستان داواکاریەکانیان لە شێخی مردوو دێنەجێ، وا دەزانن ئەوە نیشانەی شەرعیەت و دروستێتی ئیشەکەیانە. وە وا گومان دەبەن کە شێخ وەلامی داونەتەوەو، کەرامەتە، بەلام لەڕاستیدا کەرامەت نییە، بەلکو تاقی کردنەوەی خوایییەو، زیاتر پێی گومرا دەبن. وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ أيحسبون أنما نمدُّهم به من مالٍ وبنين، نسارعُ لهم من الخيرات؟ بل لا يشعرون ﴾ :(٥٥،٥٦).

واتە: ئایا موشریکەکان وا حیساب دەکەن، کە ئەم ماڵ و منداڵەی پێیان دەدەین، وە ئەو خێرو خۆشیەی توشیان دەکەین، بەخشین و چاکەیان لەگەڵ دەکەین ؟.

نەخێر نیعمەت نییەو نیقمەتە، ڕەحمەت نیەو غەزەبە. وەکەرامەت نییەو گومڕاییە، بەلام هەستی پێ ناکەن.

## ٣ـ نمونەیەکی تر لەسەر تاقی کردنەوەی خوایی:

خوای پەروەردگار حەرامی کردووە لەکاتی حەج و عومرە، کە موسڵمان لە ئیحرام دابێت و دوو پارچە قوماشە سپییەکەی لەبەردایەو خەریکی بەجێ گەیاندنی کارەکانی حەج و عومرەیە - حەرامی کردووە لەو حاڵەتەدا ڕاو بکات. بەلام پەروەردگار ویستی هاوەلانی پێغەمبەر ﷺ تاقی بکاتەوە بەو شتەی کە لێی حەرام کردوون. حەرام کراوەکەش ئەوەبوو کە لە کاتی ئیحرام بەستندا نێچیری وشکانی و ئاسمانی دەهاتە بەر دەستیان و نزیك تیرەکانیان، بەشێوەیەکی وا کە بەدەست دەیانتوانی نێچیری وشکانی بگرن و، بەئاسانیش بە تیرەکانیان نێچیری باڵندەیان دەپێکا؛ بەلام هاوەلانی ﷺ دانیان دەگرت بە نەفسی خۆیانداو نزیك نەدەبوونەوە لەو حەرام کراوە، چونکە دەیانزانی کە ئەمە تاقی کردنەوەیە نەك بەخشین: (فتنةٌ ومِحْنة لا مِنْحة).

وەك پەروەردگار ئەم تاقیکردنەوەیەمان بۆ باس دەکات:

﴿ يا أيها الذين آمنوا ليبلونّكم الله بشيءٍ من الصيد تناله أيديكم ورماحكم ليعلمَ الله من يخافُه بالغيب، فمن اعتدى بعد ذلك فله عذابٌ أليم ﴾ المائدة ٩٤ .

واتە: ئەی بڕوادان پەروەردگار تاقیتان دەکاتەوە بەشتێك لە نێچیر کە دەست و تیرەکانتان دەیگاتێ، بۆ ئەوەش وا لێی نزیك کردونەوەو ئاسانی کردووە تا دەرکەوێت کێ لەخوا ترسەو بێ فەرمانی ناکات. وە هەرکەسێك دەست درێژی بکات و بە فەرمانی خوا نەکات ئەوا سزایەکی بە ئازاری بۆ هەیە.

کەواتە ئەی موسڵمانی تێگەیشتوو:

چاك لات ڕوون بۆوە، کە خوای گەورە حەرامی کردووە هاوار کردنە مردووان و پیاوچاکان و غەیری خۆی، بەڵام ئەو شتەش کە لێی حەرام کردوویت، هەر بەوەش تاقیت دەکاتەوە، کە هەندێك کەس ئەو حەرامەیان کردووەو هاواریان کردۆتە قەبرێك و داواکاریەکەشیان جێ بەجێ بووە، بۆ ئەوەی دەرکەوێت کە ئایا پابەند دەبیت بە فەرمانی خواو خۆت دەپارێزی لە حەرامەکان، یان گوێ نادەیتە فەرمانی خواو بەو دیاردە سەیرە دەخەڵتێیت !!.

## ٤. نموونەیەکی تر لەم جۆرە تاقی کردنەوانە:

﴿ وما أرسلنا من قبلك من رسولٍ ولا نبيٍ إلاّ إذا تمنّي ألقى الشيطان في أُمنيّته فينسخ الله ما يلقى الشيطانُ ثمّ يُحكمُ الله آياته والله عليم حكيم، ليجعلَ ما يُلقي الشيطانُ فتنة للذين في قلوبهم مرضٌ والقاسية قلوبهم وإنّ الظالمين لفي شقاقٍ بعيد، وليعلمَ الذين أُتوا العلمَ أنّهُ الحقُّ من ربّك فيومنوا به فتخبت له قلوبهم. وإنّ الله لهادِ الذين آمنوا إلى صراطٍ مستقيم﴾ الحج (٥٢ـ٥٤)

واتە: پەروەردگار باسی حیکمەت و کار لەجێیی خۆیمان بۆ دەکات کە چۆن بەهۆی تاقی کردنەوەیەکی کەم، کە مۆڵەتی بەشەیتان دا دەوری گومڕا کردن ببینێت و خەڵکی بەم تاقی کردنەوەیە دەرکەوتن و ڕاست و ناڕاست لێك جیابوونەوە.

پەروەردگار خەبەرمان دەداتێ کە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە پێش محمد ﷺ، ئیللا کاتێك کە دەستی کردووە بە خوێندنەوەی پەیامی خوایی بۆ خەڵکی، لەکاتی بانگ کردنیان و ئامۆژگاری کردنیان، شەیتانیش لەوکاتەدا:(ألقى الشيطان في أُمنيّته)، گۆڕانکاری و قسەی خۆی دەخستە ناو خوێندنەوەکەی پێغەمبەرەکە، کە پێچەوانەی ڕتەو بانگەوازی پێغەمبەرانە(عليهم الصلاة والسلام). بەڵام ئەم تێکەڵ کردن و لێ تێکدانە بەردەوام نەدەمایەوە؛ چونکە پەروەردگار پێغەمبەرانی(عليهم الصلاة والسلام) پاراستووە لەوەدا کە لەخواوە دەیگەیەنن بەخەڵکی. کەواتە لێ تێکدانەکە کاتی بوو، بۆ تاقی کردنەوە، بۆیە پەروەردگار یەکسەر وەسوەسەو شوبهەو قسەکانی

شەیتانی ڕەش دەکردەوەو، هەڵی دەوەشاندەوەو، دەری دەخست کە ئەوە لەگەڵ ئەو ئایەتانەی خوا نیە کە پێغەمبەرەکە خوێندویەتیەوە. وە ئایەتەکانی خۆی بە پاکی و تەنهایی و تەواوی و ئاشکرایی دەهێشتەوە، دوور لەوەحی شەیتان. وە پەروەردگار بە توانایە لەسەر ئەم لێک جیاکردنەوەیەو، هێشتنەوەی حەق و، پوچاندنەوەی ناحەق. وە حەکیم و کارلەجێیە، وە لەبەر حیکمەتێك مۆڵەتی شەیتانی دا کە بتوانێت وەسوەسەو شوبهەی خۆی تێکەڵ بە خوێندراوەکەی پێغەمبەرەکە بکات. ئەو حیکمەتەش بریتی بوو لە تاقی کردنەوەی خەڵکەکە، بەشێوەکی وا کە دەرکەوت شوبهەو وەسوەسەکانی شەیتان بوون بە گومڕاکەری دڵ نەخۆشان، ئەوانەی کە ئیمانێکی دامەزراویان نیەو بەچوکترین شوبهە کاریان تێ دەکات و گومڕایان دەکات. وە هەروەها شوبهەکانی شەیتان بوون بە تەواو گومڕاکەری دڵ ڕەقەکانیش، ئەوانەی کە هیچ پەندو ئامۆژگاری و هەڕەشەیەك کاریان تێ ناکات و سود لە حەق وەرناگرن، جا دڵ نەخۆشەکان زیاتر تووشی وەسوەسە بوون بەم کارەی شەیتان، وە دڵ ڕەقەکانیش شوبهەی شەیتانیان کرد بە بەڵگە بۆ ناڕەوایەتی خۆیان، وە بەوە موجادەلەو مل ملانێیان لەگەڵ حەق دەکرد. وە زاڵمان لە عینادی و سەرکەشیەکی دوور لە ڕاستی دان.

جا بە هۆی ئەم تاقی کردنەوەیە، شاراوەی ناو دڵی دڵ نەخۆش و دڵ ڕەقان دەرکەوت. بەڵام زانایان؛ ئەوانەی کە عیلمی شەریعەتیان وەرگرتبوو، بەم تاقی کردنەوەیە تێك نەدەچوون، بەڵکو بەهۆی عیلمەکەیان حەق و ناحەقیان لەیەك جیا دەکردەوەو زانیان کە حەق جێگیرو بەردەوامەو ناحەقیش کاتی و بڕاوەیە.

کەواتە ئەم تاقی کردنەوەیە بۆ ئەوەش بوو کە زانایان حەق و ناحەق لێك بکەنەوەو بشزانن کە ئەم قورئانە حەقەو لەلایەن پەروەردگارەوەیە، وە زیاتر ئیمانی پێ بهێنن کە شەیتان دەسەڵاتی بەسەردا نیە. وە زیاتر مل کەچ و تەسلیم بن بۆ حەق.

*-+-*-+-*-+-*-+-*-+-*-+-*-+-*

**کەواتە لەم نمونانە دەرکەوت کە**

پەروەردگار زۆر حەکیم و داناو زاناو کارلەجێیە، وە بەندەکانی بە جۆرەها شێوە تاقی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بەندەی ڕاستەقینەی باوەڕ دامەزراو، جیا بێتەوە لە بەندەی باوەڕ لاوازو دڵ نەخۆش و بێ ئاگاو نەفام.

**کەواتە وەڵام دانەوەی دوعای گۆڕپەرستانیش لەم بابەتەیەو لەم جۆرەیەو هیچ کەرامەتێکی تێدا نیەو جێگای سەرسوڕمانیش نیە بەڵای زاناو تێگەیشتوان لە قورئان و سوننەت. وە تاوەکو زیاتر گۆڕپەرستان وەڵامیان بدرێتەوەو، زیاتر خۆبخەنە ناو ئاگرو زیاتر شمشێر بەخۆیاندا بکەن؛ زیاتر لای ئەهلی سوننەت دەردەکەوێت کە ئەمە گومڕابوونەو لەدین دەرچوونە.**

بەڵام دڵ نەخۆش و بێ ئاگایان لە قورئان و سوننەت، زۆر بەزوویی تەسلیمی ئەم دیاردانە دەبن و باوەڕیان پێدەکەن و بەکەرامەتی دادەنێن، بەداخەوە!!

وە هەروەها بۆمان دەرکەوت کە زۆرجار پەروەردگار بەهۆی وەسیلەیەکی حەرامەوە ئەنجامەکەت نیشان دەدات، بۆ ئەوەی تاقیت بکاتەوە؛ جا ئەهلی عیلم بە قورئان و سوننەت دەزانن کە وەسیلەی حەرام نابێت بگیرێتە دەست، ئەگەر واش دەرکەوێت بتگەیەنێت بە ئامانج؛ چونکە هەرشتێك بە ڕێگایەکی حەرام وەدەست بکەوێت حەرامەو، ئەوەش کە لەسەر بناغەیەکی ناڕێك دروست بکرێت، هەر ناڕێك دەبێت (ومـا بُنـيَ علـى الفاسـد فاسـدٌ)، وە دەشزانن کە ئەم ئامانجە ڕاست نیەو حەق نیە.وە بەردەوام و جێگیرو ئاخیر خێر نابێت. وە جگە لەوەش بەڵکو زەرەرو زیانی زۆر زیاتر دەبێت لە سوودو قازانجی.

**بۆ نمونە**: ئەو موسڵمانە ساویلکەیەی کە شەیتان فێڵی لێ دەکات و دەیبات بەرەو قەبری پیاوچاکێك و، هاواری پێ دەکاتە خاوەن گۆڕ، وە دواییش شەیتان بۆ خۆی بەناوی خاوەن گۆڕ شێوە وەڵامێکی دەداتەوە.. لێرەدا ئەو موسڵمانە نەفامە قازانجی نەکرد، با داواکاریەکەیشی تا ڕادەیەك دەست کەوتبێت؛ چونکە زۆربەی کات داواکاریەکەی شتێکی دونیاییە کەبێ کەڵکە لە بەرامبەر بەهەشتی خوا. بەڵام زەرەرێکی زۆر زۆر گەورە دەکات، کە ئیمانەکەی لەدەست دەدا، بەو هاوار کردنەی بۆ غەیری خوا تووشی شیرك دەبێت. وە ئەگەر تۆبە نەکات، ئەوە بۆ ناو دۆزەخی نەبڕاوەیە بەبەردەوامی- مەگەر خوا بەڕەحمی خۆی بەزەیی بەنەزانێتی ئەو کەسەدا بێتەوە کە بەتەواوی حەقیقەتی بۆ ڕوون نەکراوەتەوە.

**کەواتە: لەم ڕوون کردنەوەی ڕابردوو چەند ڕاستیەکمان بۆ دەرکەوت:**

١. بۆمان دەرکەوت کە پەروەردگار دونیای بۆ تاقیکردنەوە دروست کردووە، بە جۆرەها شێوەش بەندەکان تاقی دەکاتەوە.

٢. وە مۆڵەت و توانایەكی دیاری كراوی داوە بە شەیتانەكان، بــۆ ئەوەی موسڵمانانیان پێ تاقی بكاتەوە.

٣. وە زانیمان كە شەیتانەكان لەو سنورەی پەروەردگار پێی بەخشیون لــە توانــاو دەســەڵات هەوڵ دەدەن بەندەكان گومڕا بكەن؛ بــەوەی كــە ناحــەقیان بــۆ برازێننــەوەو لەبــەرگی حەقــدا نیشانیان بدەن و، یارمەتیان بدەن بۆ دەست كەوتنی چەند داواكاریەكی كەم و بێ نرخ، یان بــۆ ئەوەی زیاتر باوەڕیان پێ بكەن و، ڕێگای گومڕاییان لا خۆشەویست بكەن.

* پرسیار: ئایا شەیتانەكان وەڵامی داواكاری ئەو گۆڕپەرستانە دەدەنەوە كە هاوار دەكەنە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاكان ؟.

وەڵام: بێگومان هیچ كەسێك ناتوانێت هیچ خەیرو چاكەیەك بۆ كەس بهێنێت و هیچ شــەڕو زەرەرێكی لەسەر لابدات تەنها خوا نەبێت. وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ وإن يَمْسَسْكَ الله بضر فلا كاشفَ له إلا هو، وإن يُردكَ بخير فلا رادّ لفضله ﴾ يونس(١٠٧).

واتە ئەگەر خوا ناڕەحەتی و زیان و ناخۆشیەكت تووش بكات ئەوا لابــەری نیــە تــەنها (الله) نەبێت!. وە ئەگەر خێرێكی بۆت بوێت ئەوا ڕەت كەرەوەی نیە.

كەواتە هێنانی خێرو لادانی شەڕ تــەنها لای خــوای گەورەیــەو، غــەیری ئــەو هــیچ سوودو زیانێكی بەدەست نیە. وەك پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ولا تدع من دون الله ما لا ينفعُكَ ولا يضرُّكَ فإن فعلتَ فإنك إذاً من الظالمين ﴾يونس(١٠٦)

واتە: لەغەیری خوا هاوار مەكە هیچ یەكێكی تر كە نە سودت پێدەگەیەنێت و نە زیان.

كەواتە: مرۆڤ هەر داواكاریەكی بۆ جێ بەجێ بێت؛ لە دەست كەوتنی خۆشــی و لاچــوونی ناخۆشی، تەنها لە خواوەیە، چونكە بەبێ ویستی خوا نەخۆشیت توش دەبێت، وە نە ناخۆشــیت لەسەر لادەچێت. وە هیچ كەسێك ناتوانێت وەڵامی داواكاریت بداتەوە بەبێ ئیزن و ویستی خوا.

* بەڵام مەرج نیە پەروەردگار ڕاستەوخۆ خۆی وەڵامت بداتەوەو داواكاریەكەت بۆ بهێنێتەدی.

* هەروەها مەرجیش نیە كە وەڵامی داواكاری دایتەوە، پێی ڕازی بێت و، لەخۆش ویســتن و ڕازی بوونەوە وەڵامی دابیتەوەو، داواكاریەكەی جێ بەجێ كردبێت. وەئەم دوو مــەرج نەبوونــەش پێویستیان بە ڕوون كردنەوە هەیە بەم شێوەیە ـ إن شاء الله ـ:

وتمان: مەرج نیە پەروەردگار خۆی ڕاستەوخۆ وەڵامت بداتەوە، چونكە:

## داخوازی و داواكاریەكان دوو جۆرن:

**جۆری یەكەم:**

# ئەو داخوازی و داواكاریانەی كە هیچ كەسێك ڕاستەوخۆ لە توانایدا نیە جێ بەجێیان بكات، تەنها پەروەردگـار نەبێت

وەك داوای ژیان و منداڵ بوون و دەوڵەمەند بوون و شیفای نەخۆش نـاردن و صـالح بـوون و باران بارین و... وێنەی ئەمانەش كە تەنها پەروەردگار خۆی دەتوانێت جێ بەجێیان بكات.

وە هیچ پێغەمبەرێك و پیاوچاكێك و فریشتەیەك توانای جێ بەجێ كردنی ئەم داوا كاریانەی نیـە، وە هەروەها هیچ جنۆكەو شەیتانێكیش ناتوانێت هیچ كام لەمانەی پێشوو بكات.

بەڵام ـ لەوانەیە بگوترێـت: **كـەوابوو بۆچـی نـەخۆش و شـێت براونەتـە لای گـۆڕی فـڵان پیاوچاكەو هاوار كراوەتە پیاوچاكەكە بۆ شیفا ناردن یان بۆ پاڕانەوە لە خـوا. دوای ئـەوە یەكسەر نەخۆشەكە چاك بۆتەوەو شێتەكە هاتۆتـەوە هـۆش خـۆی. وە فڵانـە ژنـە منـداڵی نەدەبوو منداڵی بوو دوای كەڕانەوەی لەسەر گۆڕی فڵان وەلی (پیاوچاك) ؟.**

لە وەڵامدا دەڵێین: زۆربەی ئەو قسانە تەنها پڕوپاگەندەو ئیددیعای درۆیەو، دوره لـە واقیـع. وە كەسانێك ئەم پڕوپاگەندانە دەكەن كە:

١. تێ نەگەیشتوون و بە هەموو سەرابێك دەڵێن ئاو. وە هەموو تاقیكردنەوەو فیتنەیەك بـە بەخشش و ڕێزلێنان و كەرامەت دادەنێن!.

٢. یاخود ئەو كەسانەن كە بەرژەوەندیان لەوەدایە خەڵكی ڕوو لەو قەبرانە بكەن بـۆ ئـەوەی داهاتێكیان دەست كەوێت؛ وەك ئەو حەرام خۆرانەی دەوروی ئەو قەبرانەی خەڵكی ڕوویـان تـێ دەكەن، كە شـەوو ڕۆژ ئـەو گۆڕپەرسـتانە دەوری قەبرەكـە بـەرنادەن و بـوون بـە دەرگـەوان و خزمەتكاری قەبرەكە. وە خـەڵكی فێـر دەكـەن چۆن هاوارکەنـە شـێخ لەگۆڕەكەیداو، چـۆن بەدەوریدا بسوڕێنەوەو تەواف بكەن و، چۆن پاشەو پاش بگەڕێنەوە دواوە بۆ دەرگای دەرەوە !!.

جا ئەم تاغوتانە بەرژەوەندیان لەوەدایە خەڵكی ڕوو بكەنە سەر ئـەو قـەبرەو، پـارەو نـەزرو قوربانی بۆ بكەن، بۆ ئەوەی دوایی خۆیان بیخۆن، یان بەهۆی خاوە گۆڕەكەوە پارەیەكیش بدرێت بەمان؛ چونكە خزمەتكارو دەرگەوان و قورئان خوێن و فێركەری سەر گۆڕی پیاوچاكەكەن !!.

ئەم تاغوتانە درۆی گەورە گەورە بۆ خاوەن قەبرەکەیان دەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی زیاتر ڕووی تیّ بکەن. وە بە خەڵکە سەر لیّ شیّواوەکان دەڵیّن: ئەم شیّخەی کە لەم قەبرەدایەو ئیّوە هاتوونەتە زیارەتی، کەڕامەتی زۆری هەیە، وە چەندان شیّت و نەخۆشی چاك کردۆتەوە، وە چەندان ئافرەت منداڵیان نەدەبوو دوای زیارەت منداڵیان بووە، وە چەندان درۆی تریش دەکەن بۆ ڕەواج دان بە پەرستگاکەیان کە لە کۆمپانیا داهاتی زیاترە بۆ ئەوان!!.

جا خوشك و برای بەڕێز: زۆربەی ئەم دەنگ و باسە درۆیانە، ئەم درۆزنە حەرام خۆرانە دروستی دەکەن و خەڵکی سادەو نا تێگەیشتووش بڵاوی دەکەنەوە.

٣. وە هەروەها دەستەی سێهەمیش هەیە کە دەوری زۆریان هەیە لە بڵاوکردنەوەی ئەم درۆیانە، کە بریتین لە دوژمنانی دین؛ لە جولەکەو گاورو مونافیقان؛ کە هەرچەندە خۆیان باوەڕیان بەم شتە خوڕافیەتانە نیە بەڵام بۆ ئەوەی موسڵمانان بکەن بە موشریك و لە تەنها خوا پەرستی لایان بدەن، ئەوە ئەم ئیددیعایانە بڵاودەکەنەوەو دەڵێن:

شێخ فلان تایبەتە بۆ عیلاجی نەخۆشی باداری.

وە قەبری شێخ فلان تایبەتە بە نەخۆشی پشت ئێشان،

وە شێخ فلان شێت چاك دەکاتەوە،

بەم شێوەیە قەبری ئەم شێخانەیان کردوون بە (عیاداتي تَخَصُّصي) واتە هەر قەبرەی بۆردو دکتۆرای لە جۆرە نەخۆشیەك هێناوەتەوە.

وە هەندێکیشیان دکتۆری گشتین (طبیب عام) واتە بۆ هەموو جۆرە نەخۆشیەك خەڵکی ڕوویان تێدەکەن !!.

بەم شێوەیە دوژمنانی دین، موسڵمانانی ناتێگەیشتوو، بێ عەقڵ دەکەن و، بەم خوڕافەت و دواکەوتوویییە بەنجیان دەکەن، لە دواییشدا گاڵتەیان پێ دەکەن[1].

---

(1) ويقصد شياطين الجن شياطين الإنس من سدنة القبور وغيرهم فيقولون: إن الولي فعل وفعل، يرغبوهم فيه، ويحذِّروهم منه، وترى العامّة ملوك الأقطار و ولاة الأمصار معززين لذلك، ويولون العمّال لقبض النذور، وقد يتولّها مَنْ يحسنون فيه الظنّ من عالم أو قاضٍ أو مفتٍ أو شيخٍ فيتم التدليس للإبليس وتقرّ عينه بهذا التلبيس !).
( تطهير الاعتقاد عن أدران الإلحاد).

سبحان الله، شێخ پێش مردنی كە نەخۆش دەبوو نەیدەتوانی شیفا بۆ خۆی بهێنێت لە بچوكترین نەخۆشی، كەچی دوای مردنی ماجستێرو دكتۆرای وەرگرتووە لەناو قەبردا لە چارەسەركردنی نەخۆشی خەڵك !.

موسڵمانی تێگەیشتوو - وتمان زۆربەی ئەم دەنگ و باسانە درۆن و هەڵبەستراون لەلایەن چەندان لایەنەوە، وە بۆ چەندان مەبەست. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئینكاری ئەوە ناكەین كە جاری وا بووە نەخۆش لای قەبرەكە چاك بۆتەوەو، شێت هاتۆتەوە سەر خۆی و، ژن منداڵی بووە. بەڵام !!

ئایا شێخ ئەمانەی كرد؟!. ئایا بەهۆی هاوار كردنی مردووەكە ئەمانە هاتنەدی؟!.

نەخێر، وتمان ئەم كارانە تەنها خوای گەورە جێ بەجێیان دەكات" وە كەس ئەمانەی لەتوانادا نیە، بەڵام بە قەزاو قەدەری خوا لەو شوێنە شیفای بۆ هاتووە، واتە وا ڕێك كەوتووە - إتّفاقاً - بە ویستی خوا، كە لەم شوێنە فڵان نەخۆشە چاك ببێتەوە، لەبەر حیكمەتێكی خوایی، بۆ تاقی كردنەوەی خەڵكی" ئایا خەڵكی دوای ئەم دیاردەیە گومڕا دەبن و ئیعتیقادیان دەچێتە سەر قەبرەكە ؟ یان تێدەگەن و بە تاقی كردنەوەی خوایی دەزانن ؟!.

أ. جا ئەوانەی كە تێگەیشتوون و شوێن كەوتەی قورئان و سوننەتن، زیاتر ئیمانیان بەخوا پەیدا دەبێت و، دەزانن كە ئەمە تاقی كردنەوەیەكی خواییە. ئەو شیفایەش كە لای قەبرەكە (عند القبر) بۆ نەخۆشەكە هاتووە؛ ئەوە هەر لەلایەن خواوەیە، نەك لەلایەن شێخەوە. وە دەڵێن ئەوە بە ئیرادەی خوا، شیفای هاتبوو لای قەبرەكە (عِنْدَ الشیخ)، نەك شیفای هاتبێت بەهۆی شێخ (بالشیخ)!.

ب. بەڵام ئەوانەی كە ناتێگەیشتوون و، بەڕواڵەت دەخەڵەتێن، دەڵێن ئەوە شێخ وەڵامی داوەتەوەو شیفای بۆ ناردووە، یان بۆی لە خوا پاڕاوەتەوەو شیفای بۆ وەرگرتووە لەخوا!. وە زیاتر بەم دیاردەیە گومڕاتر دەبن و ئیعتیقادیان بەخوا لاواز دەبێت و بەشێخ پتەو دەبێت. واتە وایان لێ دێت كە هاوار كردنە خوا، لایان بێ سودەو ئیعتیقادی ئەوەیان بۆ دروست دەبێت كە هاوار كردنە خوار داوای شیفا لێ كردنی لە ماڵی خۆیانەوە، هیچ دووری نیەو شیفا نایەت. بەڵام هاواركردنە شێخ و، هاتنە سەر گۆڕەكەی و پاڕانەوە لێی، ئەوەیان بەسودە !. وە لەوەش زیاتر

هەر لە دووری چەندان قارەوە هاوار بکەنە شێخ عبدالقادرالگیلانی و بڵێن: یا حەزرەتی غەوس هاوار!. ئەوەیان بەلاوە چاکترەو، وەڵامدانەوەی شێخ بەلایانەوە نزیکترو فەوری ترو ئەکید ترە لە خوایەك کە لە شاڕەگی ملمان نزیکترە، بەبیستن و ئاگالێ بوون.

سبحان الله، بەم تاقی کردنەوەیە زۆر کەسی نەفام و دوور لە قورئان و سوننەت گومڕا دەبن!. بەهۆی گوێ نەگرتنیان لە قورئان و سوننەت و نەگەڕانەوەیان بۆلای زانایانی ئەهلی سوننەت !!

بەڵام ئایا ئەم نەخۆشانەی کە خوا شیفای بۆ ناردوون لای قەبر زۆرن یان دەگمەنن ؟!.

بێگومان زۆر بە دەگمەن پەروەردگار وای کردووە، ئەمەش ڕەحمی خوایە؛ چونکە ئەگەر هەموو، یان زۆربەی نەخۆشەکان لە لای قەبرەکان شیفایان بۆ هاتبا؛ ئەوا زۆربەی خەڵکی خوێندەواریش گومڕا دەبوون و باوەڕیان پێ دەکردن، وە تەنها ئەهلی تەوحیدو سوننەت دەمانەوە، جا سوپاس بۆ خوا حاڵەتی وەها کەمەو زۆر نیە [1].

کەواتە پوختەی ئەم جۆرە داواکاریانە ئەوە بوو کە پەروەردگار خۆی بە تەنها لە توانایدا هەیە ئەم جۆرە داواکاریانە جێ بەجێ بکات، وە هەر ئەو خۆشی دەهێنێت و ناخۆشیش هەر خۆی لای دەبات، جا بە تەنها داوای لە خوا کردبێت یان بە شەراکەت:

چونکە: (أ) جاری وا هەیە زۆر زۆر بە دڵ شکاوی و دڵ گەرمی و ئیخلاسەوە لای گۆڕەکە داوا لە خوا دەکەن بە تەنها. بۆیە پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوە ئەگەر لە بنەڕەتدا موشریك و کافریش بن، هەروەك چۆن پەروەردگار وەڵامی موشریکەکانیشی دەدایەوە :

---

(١) وە شێخ الإسلام ابن تیمیە ـ رحمه الله ـ دەفەرموێت:

(ومن رحمة الله تعالى: أنّ الدعاء المتضمن شركاً، كدعاء غيرِه أن يفعل، أو دعاءِه أن يدعو الله، ونحو ذلك: لا يحصل به غرضُ صاحبه. ولا يورثُ حصول الغرض شبهةً إلا في الأمور الحقيرة. فأمّا الأمور العظيمة: كإنزال الغيث عند القحوط، وكشف العذاب النازل فلا ينفع فيه هذا الشرك كما قال تعالى:

[ قل ادعوا الذين زعمتم من دونه فلا يملكون كشف الضرِّ عنكم ولا تحويلاً ].الإسراء:٥٦.

[أم مَنْ يجيب المضطر إذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الأرض أءلهٌ مع الله؟]النمل:٦٢.

فكون هذه المطالب العظيمة لا يستجيب فيها إلا هو سبحانه؛ دلَّ على توحيدِه وقطع شبهة مَنْ أشرك به. وعُلِمَ بذلك أنَّ ما دون هذا أيضاً من الإجابات إنّما حصوله منه وحده لا شريك له، وإن كانت تجري بأسباب محرمة أو مباحة... فخالق السببِ التام خالق للمسبب لا محالة) اقتضاء الصراط المستقيم، ص (٣٥٦).

﴿وإذا مسكم الضرُّ في البحر ضل مَنْ تدعون إلا إياهُ فلما نجاكم إلى البرّ أعرضتم وكان الإنسان كفورا﴾ الإسراء - ٦٧ -

واتە: ئەگەر ناڕەحەتی و تەنگانەتان تووش بووبایە لەناو دەریـادا، ئـەوا لـەو تەنگانەیـەدا هاوارتان نـەدەکردە پەرسـتراوە (آلهـة)کانتـان، بـەڵکو تـەنها هاوارتـان دەکـردە خـوا. وە کـە پەروەردگاریش وەڵامی دەدانەوەو، ئەهاتنەوە وشکانی، پشتتان هەڵدەکردەوە لەخوا، وە دەگەڕانەوە سەر هاوارکردنە غەیری خوا !!.

وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

[ وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ] (لقمان: ٣٢)

واتە: ئەگەر موشریکەکان سواری کەشتی و بەلەم بونایە لە دەریادا، وە شـەپۆلی وەك کێـو گەورەو، وەك هەور بەرز دەوری دابان؛ ئەوە هاواریان دەکردە خوا زۆر بە ئیخلاسـی، وە هاواریـان نەدەکردە کەسی تر. وە کاتێکیش خوای گەورە نەجاتی دەدان بۆ وشکانی ئەو کاتە کەمتەرخـەم دەبوون لە سوپاس کردنی خوا و، ئەم چاکەیەیان بـە هـی پـەروەردگار نـەدەزانی و ئینکاریـان دەکرد. وە کەسیش ئینکاری دەسەڵات و تواناو فریاگوزاری و نیشانەکانی خـوا ناکـات ئەگـەر غەدداریکی سپڵە نەبێت.

وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿ أمَن يجيبُ المضطرّ إذا دعاهُ ويكشفُ السوء ويجعلكم خلفاء الأرض أءلهٌ مع الله﴾ النمل

واتە: کێیە ئـەوەی وەڵامـی لێ قـەوماو دەداتـەوەو ناڕەحـەتی و ناخۆشـی و زەرەری لەسـەر لادەدات ؟! ئایا هیچ پەرستاوێکی تر هەیە لەگەڵ خوا وەڵامی لێ قەوماو بداتـەوەو ناڕەحـەتی لەسەر لابەرێت ؟!.

موشریکەکانیش باوەڕیان وابور کـە کـەس نیـە لەگـەڵ خـوا وەڵامـی لێ قـەوماو بداتـەوە وناڕەحەتی لەسەر لابەرێت.

واتە: هەرکەسێك ـ موسڵمان بێت یان کافر، خـوا بەتـەنها پەرسـت (موحـد) بێـت، یـان موشریك ـ ئەگەر توشی لێ قەومان و تەنگانە بوو، وە هاواری کـردە خـوا، ئـەوە خـوا وەڵامـی دەداتەوە؛ چونکە خوای کافرو موسڵمانەو پەروەردگاری هەموو جیهانەو کەس بێ بـەش نابێـت لەو میهرەبانە.

کەواتە: ئەو کەسەی دەچێتە سەر گۆڕێك و لای شێخێك و پیاوچاکێك و لەوێ دەپاڕێتەوەو داوای ڕزگار بوون دەکات لە ناڕەحەتی، وە وەڵامی دەدرێتەوەو، ناڕەحەتیەکەی لەسەر لادەچێت. ئەوە ئەگەر هاواری کردبێتە خوا بە ئیخلاسی، خوا وەڵامی دەداتەوە، هەرچەندە کە پەروەردگار ڕازیش نیە لەلای قەبری هیچ کەسێك داوای لێ بکەیت، ـ بەو نیەتەی کە لای ئەو قەبرە دوعا قەبووڵ ترە، یان بەو بیروباوەڕەی کە بەهۆی ئەوەوە خوا وەڵام دەداتەوە ـ. واتە هەر چەندە خوا لەکاری گۆڕپەرستەکە ڕازی نیە، بەڵام چونکە لێ قەوماو داماوەو هاواری کردە خوا، پەروەردگار وەڵامی دایەوە؛ چونکە پەروەردگاری کافرو موشریکەکانیشە ، نەك تەنها هی موسڵمانان ، ئەگەرچی بەتەنها پەرستراوی خۆشیانی دانەنێن.[1]

وتمان جاری وا هەیە وەڵام دانەوەکەیان بەهۆی ئەو هاوارکردنە ئیخلاسەیان بووە بۆ خوا.

(ب) بەڵام جاری واش هەیە کە بە ئیخلاس هاوار ناکەنە خوا، بەڵکو لەگەڵ خوا هاوار دەکەنە پیاوچاکە مردووەکەی ناو قەبرەکەش و، داوای یارمەتی لەویش دەکەن. وە وەڵامیشیان دەدرێتەوە لەو داواکاریانەدا کە وەڵام دانەوەیان تەنها لە دەسەڵاتی خوا دایە.

وتمان ئەو جۆرەیان زۆر بە دەگمەن ڕوو دەدات ـ سوپاس بۆ خوا ـ وە کە ڕوو دەدات هەر لە خواوەیە، بە ئیرادەو قەزاو قەدەری خوا داواکاریەکەی دێتە جێ. لەو کاتەدا، نەك بەهۆی دوعایە شیرکیەکەیەوە جێ بەجێ بوبێت، وە نەك لەبەر ئەوە بێت کە شێخ وەڵامی دابێتەوە، یاخود واسیتەی بۆ کردبێت لای خوا، وە نەك لەبەر ئەوە بێت کە خوا ئەم شێوە هاوار کردنەیانی پێ باش بێت !!.

نەخێر لەبەر هیچ کام لەو هۆیانە نیە، بەڵکو تاقی کردنەوەی خواییە کە بۆ حیکمەتی خۆی لەو کاتەدا داواکاری کابرای گۆڕپەرست جێ بەجێ بوو لەو شوێنەدا، بۆ لێك

---

(1) (شیخ الإسلام ابن تیمیة ) دەفەرموێت: ( ثم سبب قضاء حاجة بعض هؤلاء الداعین الأدعیة المحرمة: أنّ الرجل منهم قد یكون مضطراً اضطراراً، لو دعا الله بها مشركٌ عند وثنٍ لاستجیب له. لصدق توجُّهِهِ إلى الله، وإن كان تحرّي الدعاء عند الوثنِ شركاً !، ولو استجیب له على ید المتوسل به صاحب القبر أو غیره لاستغاثته، فإنّه یعاقب على ذلك ویهوى في النار إذا لم یعفُ اللهُ عنه ) إقتضاء الصراط المستقیم (ص۔ ٣٤٨ )

جیاکردنەوەی تەنها خوا پەرستان (الموحدون) لە گۆڕپەرست وشەخس پەرستان. وەك لەپێشتر باسمان کرد.[١]

*-+-*-+-*-+-*-+-*-+-*-+-*

**پرسیار**: ئایا ئەگەر یەکێک بڵێت باشە باوەڕمان هێنا کە تەنها خوای گەورە داواکاریەکەی جێ بەجێ کردوو، نارەحەتیەکەی لادا، بەڵام ناکرێ بڵێین چوونە لای قەبری شێخەکەو داوا کردن لێی بوو بەهۆی ئەوەی پەروەردگار وەڵاممان بداتەوە ؟!

وەڵام: ڕاستە دوعاو پاڕانەوە لە خوا سەبەبی دەست کەوتنی خێرو لابردنی شەڕە. چونکە پەروەردگار بە سەبەبی وەڵام دانەوەی داناوە کە فەرموویەتی ﴿ وقال ربكم ادعوني استجب لكم﴾ واتە داوام لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە.

کەواتە پەروەردگار خۆی، دوعای بەندەکانی کردۆتە هۆی وەڵام دانەوەی خۆی، بە ویست و ئیرادەی خۆی.

بەڵام لە هیچ ئایەت و حەدیسێکی (صحیح)دا نەهاتووە، کە پەروەردگار:

---

(١) وە زانای بەناو بانگ شێخ محمد بن صالح العثيمين ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەفەرمووێت لە ( فتاوى العقيدة ص:٢٣-٢٥) دا: ( وليعلم أن الله عزّ وجل قد يفتن الإنسان بشيءٍ من مثل هذه الأمور. فقد يتعلّق الإنسان بالقبر فيدعو صاحبه أو يأخذ من ترابه يتبرك به فيحصل مطلبه ويكون ذلك فتنة من الله عز وجل لهذا الرجل، لأنّنا نعلم أنّ هذا القبر لا يجيب الدعاء وأنّ هذا التراب لا يكون سبباً لزوال ضررٍ أو جلبِ نفعٍ... والآيات في هذا المعنى كثيرةٌ تدلّ على انّ كلّ من دُعيَ من دون الله فلن يستجيب الدعاء، ولن ينفع الداعي، ولكن قد يحصل المطلوب المدعو به عند دعاء غير الله فتنةً وامتحاناً.

ونقول: إنّه حصل هذا الشيءُ عند الدعاءِ ــ أي عند دعاء هذا الذي دعيَ من دون الله ــ لا بدعاءِه. **وفرقٌ بين حصول الشيء بالشيء، وبين حصول الشيء عند الشيء .**

فإننا نعلمُ علم اليقينِ أنّ دعاءَ غير الله ليس سبباً لجلبِ النفعِ أو دفعِ الضرر بالآيات الكثيرة التي ذكرها الله عز وجل في كتابه، **ولكن قد يحصل الشيءُ عند هذا الدعاء فتنةً وامتحاناً**، والله تعالى قد يبتلي الإنسانَ بأسبابِ المعصية؛ ليعلم سبحانه وتعالى مَنْ كان عبداً لله، ومَنْ كان عبداً لهواه... وهكذا يجب على المرءِ إذا هيّئتْ له أسبابُ الفعلِ المحرّم، أن يتّقي الله عز وجل، وأن لا يُقدِم على فعل هذا المحرم، وأن يعلمَ أنّ تيسيرَ أسبابهِ من باب الإبتلاءِ والامتحان، فليحجمْ وليصبر فإنّ العاقبة للمتقين ) .

- هاوار کردنە غەیری خۆی کردبێت بە سەبەبی وەڵام دانەوە.
- یان چوونە سەر قەبری پیاوچاکان و پاڕانەوە لای ئەوان لە خوا ڕاستەوخۆ.
- یان واسیتەی ئەوانی کردبێتە هۆی وەڵام دانەوەی دوعاو، جێ بەجێ کردنی داواکاری.

وە هەر شتێکیش قورئان و حەدیس نەیان کردبێت بە سەبەبی ئامانجێك، ئێمە بە هەواو ئارەزوو، و عەقڵ و تەجروبەی خۆمان ناتوانین بیکەین بە سەبەب، هەرچەند جاری واش ڕووی دابێت ـ بە قەدەری خوا ـ یان هەرچەندە جاری واش ڕووی دابێت بە کردنی ئەو بەناو سەبەبە، نەتیجە دەست کەوتبێت !!

چونکە پەروەردگار بەردەوام لەبەڕێوەبردنی پێداویستی خەڵکیدایە و، کاتێکیش کە کارێکی بۆ ئاسان دەکات، هەر خۆی دەزانێت بەهۆی چیەوە بۆی ئاسان کردووەو چی بووە بە سەبەب، لەوانەیە شتێك بێت کە ئێمە هەر بە خەیاڵیشماندا نەهاتبێت!.

وە کە جارێك لە جاران نەتیجەیەکت دەستکەوێت، دوای کردنی کارێك؛ ئەوە ناتوانیت ئەم کارە بکەیت بە سەبەبی دەست کەوتنی نەتیجەکەت؛ چونکە دەیەها جاری تر هەمان کار کراوەو ئەم نەتیجەشی نەبووە !.

وە هەروەها چۆن دەبێت گۆڕپەرستان باوەڕیان وابێت کە هاوارکردنە غەیری خوا، بووە بە سەبەبی دەست کەوتنی داواکاریەکانیان؟!، لەکاتێکدا کە قورئان بەیەقینی پێمان دەفەرموێت غەیری خوا ناتوانێت هیچ بۆ خەڵکی دابین بکات، وە سودو زەرەرو خۆشی و ناخۆشی، تەنها لای خوای گەورەیە، وە مردووی گۆڕستان هیچیان بە دەست نیە بۆخۆشیان چجای بۆ خەڵکی تر؟!.

کەواتە گومانی تێدا نیە کەکاری بێ شەرعی وەك:

- چونە سەر گۆڕی پیاو چاکێك بۆ پاڕانەوە لەو،
- یان لە خوا بە هۆی ئەوەوە،
- یان لە خوا ڕاستەوخۆ لای قەبری پیاو چاکەکە ـ

گومانی تێدا نیە کە ئەم کارە ناشەرعیە سەبەبی وەڵامدانەوەی داواکاریەکە نیەو، بەهۆی ئەم کارە ناشەرعیەوە داواکاریەکەیان جێبەجێ نەبووە.

بەڵام نەفام و گومڕایان هەر بەگومانی خۆیان، کاری ناشەرعی دەکەن بە سەبەبی گەیشتن بە ئاواتەکانیان. هەروەکو چۆن لای زۆربەی خەڵکی وایە کە نەزرکردن (لەخۆگرتن) سەبەبی لاچوونی بەڵاو ناڕەحەتییە، بۆیە ئەگەر ناخۆشیەکیان تووش هات دەچن بۆ سەر گۆڕی شێخ، وە بڕێك لە ماڵەکەیان دەکەنە نەزرو دەڵێن: ئەی حەزرەتی شێخ ئەگەر لەو بەڵایە ڕزگارم بێت ئەوەندەم خێر بێت ؟ جا کەجارێك لە جاران بەقەزار قەدەری خوا بەڵایەکی لەسەر لاچوو، دەڵێت: ئەوە نەزرەکەی سەر گۆڕی شێخ بۆی کردم !.

ئاوا زیاتر گومڕا دەبێت، وە نازانێت کە نەزرکردن هیچ خێرێکی پێ دابین نابێت، وە هیچ بەڵایەکی پێ لاناچێت، ئەگەرچی نەزرەکە بۆ خوای گەورەش بکرێت بە تەنها؛ چونکە پێغەمبەر - ﷺ - دەفەرموێت:

﴿ إنّ النذر لا يقرِّب من ابن آدم شيئاً لم يكن الله قدَّره له. ولكن النذرُ يوافقُ القدرَ، فيخرج بذلك مِن البخيل ما لم يكن البخيل يريد أن يخرجه ﴾[1]

واتە: نەزر هیچ ئاواتێکی مرۆڤ نزیك ناکاتەوە کە خوا بۆی تەقدیر نەکردبێت (واتە پێشتر لە قەدەردا بڕیاری بۆ نەدرا بێت)، (ولكن النذرُ يوافقُ القدر)واتە: بەڵام جاری وا هەیە کە نەرکردنەکەی لەگەڵ قەزار قەدەری خوا دێتەجێ، جا ئەو مرۆڤە نەفامە بێ ئاگایە لە قەدەری خوا، وا گومان دەبات کە نەزرەکەی داواکاریەکەی بۆ دابین کرد، یا بە هۆی نەزرەکەیەوە بووە![2]. کە لە ڕاستیشدا دەستکەوتنی داواکاریەکەی تەنها بە قەزار قەدەری خوا بووەو هیچ

(1) صحيح البخاري: (٦٦٩٤). وصحيح مسلم: (١٦٤٠).

(2) قال الحافظ ابن حجر العسقلاني في شرح هذا الحديث: (وجزم القرطبي في ((المُفهِم)) بحمل ما ورد في الأحاديث من النهي ـــ على نذر المجازاة، فقال: هذا النهي محلّه: أن يقول ـــ مثلاً ـــ:إن شفى الله مريضي، فعليَّ صدقةٌ. ووجه الكراهة: أنه لمّا وقف فعل القربة المذكورة على حصول الغرض المذكور، ظهر أنه لم يتمحَّض له نيّة التقرُّبِ إلى الله بِما صدر منه، بل سلك فيها مسلك المعوضة، ويُوضّحه: أنه لو لم يشف مريضه، لم يتصدّق بما علقه على شفائه، وهذه حالة البخيل، فإنه لايخرج من ماله شيئاً إلاّ بِعوضٍ عاجلٍ يزيد على ما أخرج غالباً. وهذا المعنى هو المشار إليه بقوله: (إنما يُستخرج بذلك مِن البخيل) قال: وقد ينضم إلى هذا اعتقاد جاهل يظن: ١. أن النذر يُوجب حصول ذلك الغرض، أو، ٢. أن الله تعالى يفعل معه ذلك الغرض لأجل ذلك النذر،... والحالة الأولى تُقارب الكفر، والثانية خطأٌ صريحٌ. قلت ـــ أي الحافظ ـــ:بل تقرب من الكفر. ثم نقل القرطبي عن

العلماء: حمل النهي الوارد على الكراهة، وقال: والذي يظهر لي: أنه على التحريم في حق من يُخاف عليه ذلك الاعتقاد الفاسد، فيكون إقدامه على ذلك محرماً، والكراهة في حق من لم يعتقد ذلك. قال الحافظ: وهو تفصيل حسن. ((فتح الباري١٣/٤٣٧)).

**قال الطيبي**: أن النذر المنهي عنه هو: النذر المقيد، الذي يُعتقد أنه يَغني عن القدر بنفسه ــ كما زعموا ــ، وكم نرى في عهدنا جماعة يعتقدون ذلك، لما شاهدوا من غالب الأحوال حصول المطالب بالنذر. ((تحفة الأحوذي ٥/١٢٦)).

**وقال عبدالله بن عبدالرحمن البسام**: النذر لا يردّ من قضاء الله شيئاً، ولكن ربما لو صادف أن النذر وافق حصول مطلوب أو دفع مكروه، ظن الناذر أن هذا بسبب نذره الذي علّق القيام به على حصول مطلوبه أو دفع مكروهه.

وقال: النذر المكروه هو إذا كان لطاعة الله، **فأما النذر للموتى وللقبور والطواغيت والشياطين وغيرهم، فهذا هو الشرك** نعوذ بالله تعالى من غضبه وأسباب غضبه. وقال شيخ الإسلام النذر للقبور أو لأهل القبور أو للشيخ فلان، نذر معصية لايجوز الوفاء به. (( توضيح الأحكام من بلوغ المرام ٦/١٠١-١٠٣)).

**وقال الرافعي في شرح المنهاج**: ((وأما النذر للمشاهد التي على قبر ولي أو شيخ أو على أسم من حلها من الأولياء أو تردد في تلك البقعة من الأولياء والصالحين فإن قصد الناذر بذلك -وهو الغالب أو الواقع قصود العامة-تعظيم البقعة أو المشهد أو الزاوية أو تعظيم من دفن بها أو نسب إليه أو بنيت على اسمه، فهذا النذر باطل غير منعقد فإن معتقدهم أن لهذا الأماكن خصوصيات ويرون أنها مما يدفع بها البلاء، ويستجلب بها النعماء، ويستشفى بالنذر لها من الأدواء حتى إنهم ينذرون لبعض الأحجار لما قيل لهم إنه استند إليها عبد صالح، وينذرون لبعض القبور السرج والزيت، ويقولون: القبر الفلاني أو المكان الفلاني يقبل النذر، يعنون بذلك أنه يحصل به الغرض المأمول من شفاء مريض، أو قدوم غائب، أو سلامة مال، وغير ذلك من أنواع نذر المجازات، فهذا النذر على هذا الوجه باطل لا شك فيه، بل نذر الزيت والشمس ونحوهما للقبور باطل مطلقاً، ومن ذلك نذر الشموع الكثيرة العظيمة وغيرها لقبر الخليل، عليه السلام، ولقبر غيره من الأنبياء والأولياء، فإن الناذر لا يقصد على القبر إلا تبركاً وتعظيماً ظاناً أن ذلك قربة، فهذا مما لا ريب في بطلانه، والإيقاد المذكور محرّم سواءً انتفع به هناك منتفع أم لا)) فتح المجيد ص (٢١٣).

**وقال النووي**: ((إذا نذر المشي إلى مسجد غير المساجد الثلاثة، وهي: المسجد الحرام، والمدينة، والأقصى لم يلزمه ولا ينعقد نذره عندنا)) المجموع (٨/٤٧١).

**وقال أحمد بن حجر آل بوطامي الشافعي**: ((أي لا ينذروا لغير الله، ولا يطوفوا بغير البيت العتيق، فلا يجوز النذر للأولياء ولا للصالحين ولا الطواف بقبورهم كما يفعله الجاهلون بقبر الجيلاني، والحسين، والبدوي، والدسوقي، وغيرهم فإن هذا شرك لا مراء فيه، وكثير من المبتدعين الجاهلين ينذر للصالحين، وبعضهم يرسل أموالاً ... للسدنة ولتعمير القباب كما يفعل ذلك الكثير من الهنود والباكستانيين بنذرهم لعبدالقادر الجيلاني، وإرسالهم إلى ضريحه أموالاً وافرة، هذا ممن زعم أنه من أهل السنة وأما شيعة الهنود والباكستانيين والإيرانيين فإنهم ينذرون أموالاً بقبورهم أهل البيت في النجف وكربلاء وخراسان وقم، ويشدون الرحال من مختلف الأقطار إلى تلك القبور للطواف بها، والاستغاثة بساكنها وطلب قضاء الحاجات وتفريج الكربات مما لا يقدر عليه إلا خالق الأرض والسماوات، وكذلك لايجوز النذر لقبور الأولياء والصالحين، فكذا لايجوز الوقف من بيوت وعقار على قبورهم، فمن نذر لغير الله فلا يجب عليه الوفاء، بل يستغفر الله،

پەيوەندىيەكى بە نەزرەكەيەوە نىيە، بەڵام دەورى نەزركردنەكەى تەنها ئەوەيە كە بەهۆى نەزرەوە مرۆڤ ماڵێك دەبەخشێت كە بێ نەزر نەيدەبەخشى، واتە لە دەستى ئەو پيسكەيە نەدەهاتە دەر ئەو خێرە بكات، ئەگەر لەسەر خۆى نەزر نەكردبايە!.

كەواتە پێغەمبەرى خوا ـ ﷺ ـ پێى ڕاگەياندين كەهيچ كارێك بەهۆى نەزرەوە جێ بەجێ نابێت، ئەگەر نەزرەكەيشى بۆ خوا بێت. وە ئەگەر هەر شتێكيش بووبێت ئەوە بەقەزاو قەدەرى خوا بووە، نەك بەهى نەزر كردنەكە.

بەڵام نەفام و گۆڕپەرستان گومڕايەتيان لە هيچ سنورێك نەوەستاوە؛ بۆيە نەزر بەلايانەوە سەبەبێكى دابينكەرى ئاواتەكانيانە، ئەگەر نەزرەكەشيان بۆ غەيرى خوا بێت كە شيركە!.

كەواتە زانيمان پێغەمبەرى خوا ﷺ خۆى فەرموويەتى نەزر سەبەب نىيە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەفامان هەر بە سەبەبى دادەنێن.

وە بەهەمان شێوەش چوونە سەر گۆڕو، پاڕانەوە لايان و لێيان سەبەب نين، بەڵام هەر بەسەبەبى دادەنێن و بەردەوامن لەسەرى. وە شەيتانيش زياتر بۆيان دەڕازێنێتەوە، بەهۆى ئەوەى كە پەروەردگار جار جار داواكاريەكانيان جێ بەجێ دەكات بۆ تاقى كردنەوەيان. خوا هۆشيارمان بكاتەوەو بمان پارێزێت لە گومڕايى.

---

ويتوب إليه، ويأتي بالشهادتين لأنه مرتد إن علم أن النذر لغير الله شرك، ومن وقف عقاراً أو حيواناً على قبور الأولياء فوقف باطل، أو وصّى لها فوصيته فوصيَّته باطلة، وذلك العقار أو الحيوان لا زال على ملك صاحبه، نسأل الله لنا ولهم التوفيق.

وقول بعضهم: إن النذر لله والثواب للولي كلام باطل وضلال عاطل؛ فأيُّ شيءٍ أدخل الولي هنا ؟! إن كان قصده الصدقة فليتصدق على الفقراء عن نفسه وعن أبويه وأقاربه، وما يدريه بأن صاحب هذا القبر ولي ! والأمور بخواتيمها فقد يكون ظاهره صديقاً، وباطنه زنديقاً، ويظهر كذبهم وضلالهم أنهم يأخذون الأغنام ويذبحونها عند القبر، فإذا أنكرت عليهم قالوا الذبح لله والثواب للولي، وليس القصد من هذا إلا التلبيس وقلب الحقائق، وهم لم يقصدوا إلا الولي. على أن العلماء قد صرَّحوا أن لا يذبح لله بمكان يذبح فيه لغير الله للحديث عن ثابت بن الضحاك قال: ((نذر رجل أن ينحر إبلاً بِبُوانةَ فسأل النبي ﷺ فقال هل كان فيه وثن من أوثان الجاهلية يُعبَد؟)) قالوا: لا، فقال رسول الله ﷺ: أوف بنذرك فإنه لا وفاء للنذر في معصية الله ولا فيما لا يملك ابن آدم)) أخرجه أبو داود كتاب الأيمان والنذور باب ما يؤمر به من الوفاء بالنذر (٣/٦٠٧) ح (٣٣١٣) والبيهقي في السنن (١٠/٨٣) والطبراني في الكبير ح (١٣٤١) من حديث ثابت بن الضحاك وصححه الحافظ ابن حجر في تلخيص الحبير (٣١-٣٢).)) تطهير الجنان ص (٣١-٣٢)

**وە شێخ الاسلام. فەرموویەتی:**

فأما غالب هذه الأدعية التي ليست مشروعة: فلا تكون هي السبب في حصول المطلــوب، ولا جزءاً منه. ولا يعلم ذلك، بل لا يتوهم إلا وهما كاذباً كالنذر سواء، فإن في الصحيح عن ابن عمر عن النبي ﷺ [ أنه نَهى عن النذر. قال: أنه لا يأتي بخيرٍ.وإنما يُستخرجُ به من البخيل ].

فقد أخبر النبي ﷺ أن النذر لا يأتي بخير، وأنه ليس من الأسباب الجالبة لخير، أو الدافعة لشرٍّ أصلاً، وإنما يوافق القدر موافقةً كما توافقه سائر الاسباب فيخرج من البخيل حينئذٍ مالم يكن يخرجــه قبــل ذلك.

ومع هذا: فأنت ترى الذين يحكون أنهم وقعوا في شدائد فنذروا نذراً لكشف شدائدهم أكثــر أو قريباً من الذين يزعمون أنهم دعوا عند القبور أو غيرها فقضيت حوائجهم بل من كثرة اغترار الضالين المضلين بذلك صارت النذور المحرمة في الشرع، فأكل الكثير من السدنة والمجاورين العــاكفين علــى القبور أو غيرها، يأخذون من الأموال شيئاً كثيراً.

وأولئك الناذرون... قد قام بنفوسهم: أن هذه النذور هي السبب في حــصول مطلــوبهم ودفــع مرهوبهم، وقد أخبر الصادق المصدوق أن نذر طاعة الله ــ فضلاً عن معصيته ــ ليس سبباً لحــصول الخير، وإنما الخير الذي يحصُل للناذر يوافقهُ موافقةً، كما يوافق سائر الاسباب، فما هذه الأدعية غــير المشروعة في حصول المطلوب بأكثر من هذه النذور في حصول المطلوب...

بل إذا كان المبطلون يُضيفون قضاء حوائجهم إلى خصوص نذر المعصية، مع أن جنس النذر لا أثر له في ذلك لم يبعد منهم إذا أضافوا حصول غرضهم إلى خصوص الدعاء بمكان لا خــصوص لــه في الشرع. لأن جنس الدعاء هنا موثر. فالإضافة اليه ممكنة، بخلاف جنس النذر؛ فإنّه لا يوثر.

والغرض بأن يُعرف أن الشيطان إذا زَيّن لهم نسبة الأثر إلى مالا يُؤثرُ نوعاً ولا وصفاً، فنسبتُهُ إلى وصف قد ثبت تأثيرُ نوعِهِ أولى أن يُزيّنهُ لهم. ثم كما لم يكن ذلك الاعتقاد منهم صحيحاً فكذلك هذا، إذْ كلاهما مخالف للشرع.

ومما يوضحُ ذلك: أن اعتقاد المعتقد أن هذا الدعاء، أو هذا النذر هو سبب أو بعض الــسبب في حصول المطلوب لابد له من دلالة. ولا دليل على ذلك في الغالب إلا الاقتــران أحيانــاً. أعــني وجودهما جميعاً، إن تراخى أحدهما عن الآخر مكاناً أو زماناً.مع الانتقاض أضعاف أضعاف الاقتران.

ومجرد اقتران الشيء بالشيء بعض الاوقات، مع انتقاضه، ليس دليلاً على العلّة باتفاق العقــلاء إذا كان هنالك سبب آخر صالح، تخلف الاثر يدُلّ على عدم العِلّية.

فإن قيل: إن التخلف لفوات شرطه أو لوجود مانع.

قيل: بل الاقتران لوجود سبب آخر. وهذا هو الراجح؛ فإنا نرى الله في كلّ وقتٍ يقضي الحاجات، ويُفرج الكربات بأنواع من الاسباب لا يقضيها إلا هو. وما رأيناه يحدث المطلوب مع وجــود هــذا الدعاء المبتدع إلا نادراً. فإذا رأيناه قد أحدث شيئاً ـ وكان الدعاء المبتدع قد وجد ـ كــان إحالــة حدوث الحادث على ما عُلم من الاسباب التي لايحصيها إلا الله أولى من إحالتِهِ على ما لم يثبت كونــه سبباً.

((ثم الاقتران إنْ كان دليلاً على العلّة فالانتقاض دليلٌ على عدمها)).

((ويكفيك أنّ جُلّ ما يُظنُّ أنه سبب لحصول المطالب مما حرّمتهُ الشريعة من دعاءٍ أو غيرهِ، لابد فيه من أحد أمرين:

– إما أن لا يكون سبباً صحيحاً، كدعاء مالا يسمع ولا يُبصر ولا يُغني عنك شيئاً، وإما أن يكون ضرره أكثر من نفعه.

– فأما ماكان سبباً صحيحاً، منفعتُهُ أكثر من مَضَرّتِهِ: فلا ينهى عنه الشرعُ بحالٍ. وكلُّ ما لم يشرع من العبارات مع قيام المقتضي لفعلِهِ من غير مانعٍ فإنه من باب النهي عنه))[1]

(١) باختصار من (اقتضاء الصراط المستقيم) ص (٣٥٤، ٣٦٣،٣٥٨).

## جۆری دووەم لە داواكاریەكان:

# ئەو داواكاریانەی كە دابین كردنیان لەتوانای مرۆڤ، و جنۆكەدا هەیە، بەئیزن وئیرادەی خوا:

ئەم جۆرە داواكاریانە كە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكرێن دوای مردنی، یان لە پیاوچاكێك بكرێن لەسەر قەبرەكەی، یان لە دوورەوە. وە وەڵامی داواكاریەكان بێتەجێ؛ ئەوە جنۆكە شەیتانەكان پێی هەڵدەستن و داواكاری گۆڕپەرستان دێننەجێ، بۆ ئەوەی زیاتر گومڕایان بكەن و لە ڕێگای ڕاستی تەنها خواپەرستی لایان بدەن. وە وەڵام دانەوەی شەیتانەكانیش بۆ گۆڕپەرستان هەر بەویستی قەدەریی (الارادة القدرية)ی خوایەو، لەو سنورەدایە كە پەروەردگار داینارە بۆ شەیتانەكان. چونكە ئەگەر پەروەردگار ویستی لەسەر ئەوە نەبێت شەیتانەكان وەڵامیان بدەنەوە، ناتوانن وەڵامیان بدەنەوە. كەواتە ئەم جۆرە وەڵام دانەوەیەش هەر بە ئیرادەو ویستی خوایە بەڵام نەك ئیرادەو ویستنی دینی و شەرعی (الارادة الشرعية)و، لێ ڕازی بوون و، پێ خۆش بوون و، پەسندكردن؛ بەڵكو ئیرادەو ویستی قەدەرییە، كە پەیوەندی نیە بە لێ ڕازی بوونی.

چونكە هەر شتێك لەم بوونەوەرەدا ڕوو بدات؛ لە چاكەو خراپە و، ئیمان و كوفر، هەمووی هەر بە ویستی قەدەری خوایە. واتە خوا لە قەدەردا ویستویەتی ببێت، بەڵام مەرج نیە هەرچی لەقەدەردا ویستبێتی ببێت، لای پەسندو خۆشەویست بێت و فەرمانیشی پێ كردبێت و، ویستی شەرعی و دینیشی لەسەر بێت.

بەڵكو ئەوەی (چاكەیەو ئیمانەو پاكە) ئەوە خوا لە قەدەردا ویستوویەتی ببێت واتە ئیرادەی قەدەری (الإرادة القدرية)ی لەسەرە. وە هەروەها لە شەرعیشدا فەرمانی پێ كردووەو لە دینیشدا ویستوویەتی ببێت و، پێی خۆشە بكرێت، واتە ئیرادەی شەرعی و دینیشی لەسەرە (الإرادة الشرعية و الدينية).

بەڵام ئەوەی (كوفرەو خراپەیەو پیسە) پەروەردگار ویستی قەدەری (الإرادة القدرية)ی لەسەر بووە. واتە لە قەدەردا ویستوویەتی ببێت، ئەگینا هەر لە بنەڕەتدا نەدەبوو؛ چونكە هەر شتێك كە خوا نەیەوێت ببێت، نابێت و، ئەوەش كە بیەوێت ببێت ـ بە ویستنێكی قەدەری ـ ئەوە هەر

دەبێت. جا پەروەردگار ویستی قەدەری بووە لەسەر بوونی ئەو شتە خراپانە، بۆیە بوون. بەڵام ویستی شەرعی و دینی لەسەر نین، وە ڕازی نیە کە بکرێن و، نەهی کردووە لە کردنیان. بۆ نمونە:

ئیمانی بڕوادار خوا ویستوویەتی ببێت بە هەردوو ویستنەکەی؛ ویستنی قەدەری و ویستنی شەرعی و دینی.

واتە ئیمانی کابرای بڕوادار بە ویست و ئیرادەی قەدەری خوا هاتۆتە بوون. وە هەروەك هاتۆتە بوون، خوا پێشی خۆشە بێتە بوون و، فەرمانیشی کردووە بەبوونی و ئیرادەو ویستی لەسەر بونیەتی لە شەرعدا.

واتە لە شەرع و دیندا خوا ئەمری کردووە بە خەڵکی ئیمانی هەبێت.

بەڵام کوفری کافر هەرچەندە ویستی قەدەری خوای لەسەرە ئەگینا نەدەبوو بەڵام ویستی شەرعی ئەوی لەسەر نیە، واتە لە شەرعدا خوا لە کوفر ڕازی نیەو، فەرمانی پێ نەکردووە، بەڵکو ویست و ئیرادەی لەسەر نەبوونیەتی، بەڵام کافرەکە بە ویستی شەرعی خوا ناکات بەڵکو بێ فەرمانی دەکات و کوفر هەڵدەبژێرێت بە ئارزوو ئیرادەی خۆی.

کەواتە دوای ڕوون کردنەوەی دوو جۆر ئیرادەکەی پەروەردگار (الإرادة القدرية. والإرادة الشرعية)، بۆمان دەرکەوت کە هیچ شتێك؛ چاك یان خراپ لە بوونەوەردا ڕوو نادات بەبێ ئیرادەی قەدەری خوای گەورە؛ چونکە مەملەکەتی خۆیەتی و، هەر شتێك کە ئەو لە قەدەردا نەیویستبێت ببێت نابێت بەهیچ شێوەیەك.

بەڵام ویست و ئیرادەی قەدەری نیشانەی ویستی شەرعی و ڕەزا بوونی خوا نیە. واتە مەرج نیە هەر شتێك لە بوونەوەردا ڕوو بدات بە ئیرادەی خوا ئەوە خوا لێی ڕازی بێت و پەسندی کردبێت لە شەرعدا.

بۆ نمونە: خوا ویستوویەتی شەیتان ببێت بۆ تاقی کردنەوەی خەڵکی، وە ویستوویەتی لە قەدەردا کافرو موشریك ببن بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانان تا موسڵمانان، بە ناخۆشی تاقی بکاتەوە، وە ویستوویەتی لە قەدەردا کە مارو دووپشك و گورگ و شێرو پڵنگ و جۆرەها دڕندەی تر ببن، بەڵام پەروەردگار هیچ کام لەم شتانەی خۆش ناوێت و پێی ڕازی نیە لە شەرعدا، بەڵکو بۆ تاقی کردنەوەی بەندەکانیەتی و چەندان حیکمەتی تریشی هەیە لە بونیان.

وە خوای گەورە لە قەدەردا وای كردووە كە بەهۆی دزی كردنیشەوە ماڵ كۆ بكرێتەوە، بەڵام لەم هۆیە(كە دزی كردنە) ڕازی نیە، وە ویستی شەرعی لەسەر نیە وە وای كردووە كە بە زیناكردنیش ئارەزووی ژن و پیاو دابمركێتەوە، بەڵام زینا كردنی حەرام كردووە، وە ویستی شەرعی لەسەر نیەو هۆیەكی بێ شەرعییە.

كەواتە بەهەمان شێوەش پەروەردگار لە قەدەردا ویستی وابووە كە جنۆكە شەیتانەكان وەڵامی داواكاری گۆڕپەرستان ونەفامان و بت پەرستان و گاور پەرستان بدەنەوە بۆ ئەوەی زیاتر گومڕا بن؛ چونكە شوێن پێغەمبەرەكەی ﷺ نەدەكەوتن و باوەڕیان بە قورئان و حەدیس نەدەهێنا كە وەحی(الله) بەڵام باوەڕیان هەبوو بەوەی كە وەحی شەیتانە !!

كەواتە ـ لەبەر حیكمەتێكی گەورەی پەروەردگار ـ مۆڵەت دراوە بە شەیتانەكان وەڵامی دۆستەكانیان بدەنەوە، بەڵام ئەم مۆڵەت دانەی پەروەردگار بە شەیتانەكان نیشانەی ئەوە نیە كە پەروەردگار لەو كارە ڕازیەو ئیشەكەی ئیشێكی شەرعییەو داواكردن لە پیاوچاكان هۆیەكی شەرعییە.

نەخێر كارەكەیان شیركەو، پەروەردگار لێی ڕازی نیەو، هۆیەكەش بێ شەرعییە!!

وە هەر داواكاریەكیش كە بە هۆیەكی (سەبەبێكی) بێ شەرعی و حەرامەوە دەست بكەوێت، ئەوە زەرەری زیاترە لە قازانجی و، قازانجەكەیشی بەردەوام نابێت و تا سەر نیە.

لەوانەیە داواكاریەكی بێ نرخی بێ سودی دەست كەوێت لەو ڕێگایە ناشەرعییەو بەو سەبەبە حەرام كراوە كە هاوار كردنە شێخ و پیاوچاكانە. بەڵام زەرەرێك دەكات كە بەردەوامەو بەرەو دۆزەخی دەبات ئەگەر تۆبەی لێ نەكات وە زەرەرەكەش بریتییە لە كافر بوون بە شەریك بۆ خوا دانان و، ئیعتیقاد بە قەبر بوون، كە سودی پێ گەیاندوەو زەرەری لێ لاداوە!.

جا ئایا هەر كەسێ تۆزێك عەقڵی هەبێت بۆ ئەو قازانجە كەم و بڕاوەیە، ئەم زەرەرە گەورە نەبڕاوەیە توشی خۆی دەكات ؟![1].

---

(1) شَيْخُ الاسلام دەفەرموێت:

وإذا قيل: إن الله يفعَلُهُ بذلك السبب. فإذا كان السبب محرّماً لم يَجُزْ... وقد يكون الدعاء المحرم في نفسهِ دعـاء لغير الله، وأن يدعو الله مستشفعاً بغيره إليه ... وقد يكون دعاءً لله، لكنه توسل إليه بما لا يُحِبّ أن يتوسل به إليه. كما يفعل المشركون الذين يتوسلون إلى الله بأوثانهم.

## ئایا ئەگەر یەکێك بڵێت: وەڵام درانەوەیان بەئیزنی خوا، نیشانەی لێ ڕازی بوونی خوایە! چۆنە؟.

**وەڵام:**

ڕوونمان کردەوە کە ئیزنی قەدەری خوا نەبەستراوەتەوە بە ئیزنی شەرعی و دینی و ڕەزابوونی خوا. چونکە زۆر شت هەیە کە بە ئیزن و ئیرادەی قەدەری خوایە بەڵام لێیشی ڕازی نیەو پێیشی خۆش نیە.

بۆ نمونە: پەروەردگار لەقەدەردا دایناوە (واتە ئیرادەی بووە) کە مرۆڤ بە زینا کردنیش شەهوەتی دامرکێنێتەوە، بەڵام ئیرادەی شەرعی لەسەر ئەو وەسیلە بێ شەرعیە نیەو پێی ڕازی نیە؛ بۆیە ویستی شەرعی لەسەر ئەوەیە گەنج ژن بهێنێت بە ڕێگایەکی شەرعی و پاك. وە ئەگەر نەشی توانی ژن بهێنێت، ئەوە با ڕۆژوو بگرێت؛ (فإنّهُ لهُ وِجاءٌ) واتە ڕۆژوو شکێنەری شەهوەتەو دامرکێنەرەوەیەتی.

کەواتە: ئەگەر ئیرادەو ویستی قەدەری خوا، لەسەر ئەوە بێت کە گۆڕپەرستان وەڵامی داوا شیرکیەکانیان بدرێتەوە جار جار لەڕێگای جنۆکە شەیتانەکانەوە، ئەوە نیشانەی پێ خۆش بوون و لێ ڕازی بوونی خوا نیە؛ چونکە ئیرادەی شەرعی خوا لەسەر هاوار کردنە غەیری خوا نیە؛ بەڵکو ئیرادەی شەرعی لەسەر ئەوەیە کە تەنها هاوار بکرێتە (الله) وهاوار نەکرێتە کەسی تر.

---

فهذه الأدعية ونحوها ــ وإن كان قد يحصُلُ لصاحبها أحياناً غرضه ــ لكنها محرَّمة، لما فيها من الفساد الذي يربو على منفعتها ... ولهذا كانت هذه فتنة في حق من لم يهده الله، ويُنور قلبهُ فيفرق بين أمر التكوين وأمر التشريع، ويفرق بين أمر القدر وأمر الشرع، ويعلم أن الأقسام ثلاثة:

أمور قدرها الله، وهو لا يُحبّها ولا يرضاها. فإن الاسباب المُحصِّلة لهذه تكون محرمة موجبة لعقابه.

وأمور شرعها فهو من العبادة ويرضاها ولكن لم يُعِنْهُ على حصولها. فهذه محمودة عنده مرضيّةٌ وإن لم توجد.

والقسم الثالث: أن يعين الله العبد على ما يُحبُّهُ منه.

فالأوّلُ: إعانةُ الله. والثاني: عبادة الله. والثالث: جمع له بين العبادة والإعانة، كما قال تعالى: ﴿ إياك نعبد وإياك نستعين﴾

فما كان من الدعاء غير المباح ذا أثرٍ: فهو من باب الإعانة لا العبادة. كدُعاء سائر الكفار والمنافقين والفُسّاق). اقتضاء الصراط المستقيم ـ ص (٣٥٥).

**وە ئەگەر ئەوە نیشانەی ڕەزامەندی خوا بێت ئەوا دەبێت گۆڕپەرستان باوەڕیـان وا بێـت کـە خوا لە هیندۆسە گا پەرستەکان و، جولەکەو گاورەکان و موشریکە بت پەرستەکانیش ڕازییە؛ چونکە ئەوانیش جاری وا هەیە کە لای بت و پەرستراوەکانیان هـاوار دەکـەن، داواکاریـەکانیان دێنەجێ.**

**وە هەرکەسێکیش وەڵام درانەوە بە نیشانەی ڕازی بوونی خوا دابنێت؛ دەبێت بڵێـت خـوا لـە هەموو کافرو موشریکەکان ڕازییە، وە هەر کەسێکیش ئەمە بڵێت کافر دەبێت پەنا بە خـوای گەورە.**

**وە کە بڵێن ئەم وەڵام دانەوەیە لەکەرامەتی شێخە، دەڵێین: کەوابوو دیارە بت و سەنەم و گای هیندۆسەکانیش کەرامەتیان هەیە !!** (1).

**وە بۆ زیاتر حاڵی بوون لەو دیـاردە سـەیرو ناعادەتیانـەی بەکەرامـەتیان دادەنـێن، بڕوانـە وەڵامی شوبهەی بیست. بۆ ئەوەی کەڕامەت و گومڕاییەت لێك جیاکەیتەوە. وە بـشزانیت کـێن دۆستانی خوا ﴿أولياء الرحمن﴾، کە خاوەنی کەڕامەتن. وە کـێش دۆسـتانی شـەیتانن ﴿أوليـاء الشيطان﴾، کە خاوەنی گومڕاییەتن !.**

---

(1) **وە ڕوونکردنەوەی زانایانیش لەم بارەیەوە زۆرە:**

١. **شیخ الاسلام دەفەرموێت:** (فإن اليهود والنصارى عندهم من الحكايات والقياسات من هذا النمط كثير، بل المشركون الذين بعث اليهم رسول الله ـ ﷺ ـ كانوا يدعون عند أوثانهم فيستجاب لهم أحياناً، كما قد يستجاب لهؤلاء أحياناً وفي وقتنا هذا عند النصارى من هذا طائفة.

فإن كان هذا وحده دليلاً على أن الله يرضى ذلك ويحبهُ فليطّرد الدليل. وذلك كفرٌ متناقض)اقتضاء ص:٣٤٤.

٢. **وە ئیمامی (الصنعاني) دەفەرموێت:** (فإن قلت: ان الناذر قد يدرك النفع ودفع الضرر بسبب إخراجه للنذر وبذله. قلت: كذلك الأصنام قد يدرك ما هو أبلغ من هذا، وهو الخطاب من جوفها والإخبار ببعض ما ينمه الإنسان. فإن كان هذا دليلاً على حقيّة القبور وصحة الإعتقاد فيها، فليكن دليلاً على حقيّة الأصنام. وهذا هدمٌ للإسلام وتشييدٌ لأركان الأصنام.

والتحقيق أنّ لإبليس وجنوده من الجنّ والإنس أعظم العناية في إضلال العباد. وقد مكّن الله إبليس من الدخول في الأبـدان والوسوسة في الصدور والتقام القلب بخرطومه، فكذلك يدخل أجواف الأصنام ويلقي الكلامَ في أسماع الأقوام، ومثله يـصنعه في عقائد القبوريين، فإن الله تعالى قد أذن له أن يجلب بخيله ورجله على بني آدم، وأن يشاركهم في الأموال والأولاد.

وثبت في الأحاديث (أن الشيطان يسترق السمع بالأمر الذي يحدثه الله فيلقيه إلى الكهان وهم الذين يخبرون بالمغيبات ويزيدون فيما يلقي الشيطان من عند أنفسهم مائة كذبة). ( تطهير الاعتقاد عن أدران الإلحاد).

# شوبهەی بیست

# ئایا دیاردە ناعادەتیەکانیان ﴿خوارق العادة﴾ بە کەرامەت دانانرێن؟!
# وە نیشانەی ئەوە نین کە خاوەنەکانیان وەلی و خۆشەویستی پەروەردگار بن ؟!

دەڵێن: بەڵێ بۆمان روون بۆوە لە رابردوودا بە بەڵگەی نەقلی و[1]عەقلی، کە ئیعتیقادبوون بە غەیری خوا، کە هیچ لە زەرەرو زیان و سودو قازانجی بەدەست بێت شیرکە. وە هەروەها نابێت هاوار بکرێتە غەیری خوا. وە ئەوانەش کە هاوار دەکەنە غەیری خوا وە بەهۆی هاوارەکەیان جار جار وەڵامیان دەست دەکەوێت، ئەوە تاقیکردنەوەیە لەلایەن خواوەو، گومراکردنە لە لایەن شەیتانەکانەوە.

**بەڵام** ئایا ئەو دیاردە سەیرەی کە لەو کەسانەدا دەیبینین: وەك شمشێر لەخۆدان و ئاگر قوت دان و چوونە ناو ئاگرو، گرتنی مارو دووپشك و خەبەری غەیب زانین و، شوێن هەڵگرتن و دز کەشف کردن؛ ئایا ئەم دیاردانە بە کەرامەت دانانرێن و، نیشانەی ئەوە نین کە ئەمانە وەلی و خۆشەویست و دۆستی پەروەردگار بن؟!:

هەرچەندە زۆریش پابەند نین بە نوێژو جەماعەت و مزگەوت؟!.

وە زیکرو عیبادەتەکانیشیان موافیقی قورئان و سوننەت نین ؟!.

وە هەرچەندە خوێندەوارو تێگەیشتوش نین لە قورئان و سوننەت و شەریعەتی ئیسلام ؟!.

## وەڵام

لە وەڵامدا دەڵێم، ئەی موسڵمانی حەق ویست و، شوێن کەوتەی بەڵگە:

---

(1) بەڵگەی نەقلی: بریتییە لەو بەڵگەیەی کە دەگێڕدرێتەوەو نەقڵ دەکرێت لە کەلامی خواو کەلامی پێغەمبەر ﷺ واتە لە (قورئان و سوننەت).

ئەم دیاردەیەی پرسیاری بۆ کراوە گەورەترین شوبهەی نەفامەکانەو، بەوە چاوی خەڵکی دەبەستن و، قەناعەتیان پێ دەکەن. وە بگرە نەك تەنها قەناعەتیان بە خەڵکی سادەو نەخوێندەوار کردبێت، بەڵکو زۆر لە خوێندەواری دینیش باوەڕی پێ هێناون کە کاتێك ئەم دیاردە سەیرەی بینیوەو، نەیتوانیوە هیچ تەفسیرێکی ڕاستی بۆ بکات، ناچار تەسلیمی واقیعەکە بووەو، دیاردەکەی کردۆتە کەرامەت و نیشانەی وەلییتی خاوەنەکەی. هەرچەندە زۆر جاریش بینیویانە کە کابرای شمشێر لەخۆدەر، نوێژیش ناکات و، حەرامیش دەخوات و، مرۆڤێکی فاسقیشە، بەڵام دیسان شەیتان فێڵی لێ کردوون و چاو بەستەکێی پێ کردوون لەوەش، کە گوایە هەرچەندە شمشێر لەخۆدەر فاسقە بەڵام ـ کەرامەتەکە هی حەزرەتی سەروی خۆیەتی!!.

وە جاری وا هەیە سەروی خۆشی حەرام خۆرو نەفام و کەم دینە، بەڵام شەیتان دیسان بە فریایان دەکەوێت و دەڵێت: کێشە نیە، چونکە کەرامەتەکە هی شێخی گەورەیە، وە بەم شێوەیە تا دەیانگەیەنێت بە پێغەمبەر ﷺ .

واتە بەهەموو شێوەیەك شەیتان هەوڵ دەدات جێگیر بوون (استقامة) یان بداتێ لەسەر باوەڕکردن بەو دیاردەیەو، بەکەرامەت دانانی و، کردنی بە نیشانەی ئەوەی کە ئەو شەخسەی کە توانی شمشێر لە خۆی بدات و دیاردەی سەیر بنوێنێت دوای هاوارکردنی بۆ غەیری خوا، ئەوە وەلی خوایە؛ بۆیە خوا ئەم کەرامەتەی پێ بەخشیوە!.

بەڵام برای ژیرو تێ گەیشتوو ـ ئەگەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین، کە ڕاست ترین کەلامە چونکە کەلامی خوایە، دەبینین پەروەردگار باسی دوو جۆر(وەلی)مان بۆ دەکات.

جۆری یەکەم: (وەلی خوا) واتە دۆست و خۆشەویستی خوا.

جۆری دووەکەم: (وەلی شەیتان) واتە دۆست و خۆشەویستی شەیتان.

## وەلی خوا کێیە ؟ وە سیفەتەکانی چین ؟

بەو کەسانەی کە دۆست و خۆشەویستی خوا بن دەوترێت (أولیاء الرحمن) واتە دۆستان و خۆشەویستانی ڕەحمان کە خوای بە ڕەحم و بەزەییە.

بەڵام با بزانین دۆستانی خوا (أولياء الله) كێن و سیفەتەكانیان چین، بە گوێرەی قورئان و سوننەت:

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ ألا إن أولياء الله لا خوف عليهم ولا هم يحزنون، الذين آمنوا وكانوا يتقون ﴾

واتە: بزانن کە دۆستان و خۆشەویستانی خوا (أولياء الله) نە ترسیان لەسەرە، وە نە غەمبارو دڵ تەنگ دەبن. ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو تەقوای خواش دەکەن.

کەواتە: (أولياء الله) ئەوانەن کە ئەم دوو سیفەتەیان هەیە:

١. الذين آمنوا: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە.

٢. وكانوا يتقون: وە تەقوای خواش دەکەن، بە کردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکانی.

کەواتە: هەر کەسێك ئەم دوو سیفەتەی پێکڕا تێدا نەبێت، بە(أولياء الله)دانانرێت لای خوا.
بەڵام با کەمێك ئەم دوو سیفەتە ڕوون بکەینەوە.

سیفەتی یەکەم: کە (ئیمانە): بریتییە لە ئیمان بوون بە خوای پەروەردگارو، بە هەموو شتێکیش کە لەلایەن ئەوەوە هاتووەو، فەرمانی کردووە کە باوەڕمان پێی بێت، وەك ئیمان بە فریشتەکان و پەڕاوە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و ڕۆژی دوایی وقەزاو قەدەر.
بەڵام پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان ئیمان بوون بەخوا، لەگەڵ ئیمان بوون بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ؛ چونکە:

**ئیمان بوون بەخوا بە سێ شت دەکرێت:**

١ـ ئیمانت هەبێت بە پەروەردگاریەتی خوا بە تەنها؛ واتە تەنها ئەو بە پەروەردگار دابنێیت؛ کە ئەوەش پێی دەوترێت (الإيمان بتوحيد الربوبية).

واتە ئیعتیقادت وابێت تەنها (الله) پەروەردگارەو خالیقەو ڕازقەو زیندووکارو مرێنەرو مالیکەو، شەریعەت دانەرەو، هیچ شەریکی نیە لەم کردارانەدا.

٢ـ ئیمانت هەبێت کە هەر ئەو بە تەواوی و بەردەوامی خاوەنی هەموو سیفاتێکی بەرز و جوانە، وە هیچ کەسێک وێنەو هاوشێوەی خوا نیە، لە هیچ کام لە سیفاتەکانی وەك بیستن و بینین و ژیان و دەوڵەمەندی و دەسەڵات و تواناو، وەڵام دانەوەو، باقی سیفاتەکانی تریش.

وە تەنها ئەو سودو قازانج و زەرەرو زیانی بەدەستە، واتە (النافع والضار).

وە هەرکەسێك باوەڕی وابێت کە غەیری خوا سودو قازانج و زەرەرو زیانی بە دەستە، ئەوە شەریکی بۆ خوا داناوە، یان باوەڕی وابێت پیاوچاکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەردەم زیندوون و نامرن. یان بڵێت لە دووریشەوە، وە لە ژێر گۆڕیشەوە هەر دەبیستن و دەبینن وەك دونیا، وە توانای وەڵام دانەوەیان هەیە؛ ئەوە ئیمانی تەنها بە خوا نیە، بەڵکو ئیمانی بە غەیری خواش هەیەو شەریکی بۆ خوا داناوە؛ چونکە تەنها خوا خاوەنی ئەم سیفاتە بەرزانەی پێشووە.

وە هەر سیفەتێك لە قورئان و سوننەتدا هاتبێت، پێویستە باوەڕمان پێی بێت وەکو خۆی بێ گۆڕین و دەستکاری کردن و لابردن و بێ چواندنیشی بە سیفاتی دروست کراوان، وە هەرکەسێك باوەڕی بەم شێوەیە نەبێت ئەوە ئیمانی تەواو نیە.

ئەم جۆرە ئیمانەش پێی دەوترێت: ( الإيمان بتوحيد الأسماء والصفات).

٣- وە هەروەها ئیمانت ببێت بەوەی کە تەنها (الله) پەرستراوو مەعبود(إله)ی حەقە، وە غەیری ئەو ئەگەر پەرستنیشیان بۆ بکرێت، وەك دوعاو پاڕانەوەو داوا لێ کردن و نەزر بۆکردن و ماڵ لەپێناو بەخشین و، سوێند پێ خواردن و، ئیعتیقاد پێ بوون؛ ئەوە بە ناحەقی و ناڕەوایی پەرستنی بۆ کراوە، چونکە غەیری خوا هەر پەرستراوێکی تر کە خەڵکی داینابێت هەر ناحەقە(باطل)ـە؛ چونکە (لا إله الاّ الله) واتە هیچ مەعبودو پەرستراوێك حەق نیە تەنها (الله) نەبێت. ﴿ذلك بأنّ الله هو الحقُّ. وأنّ ما يدعون من دونه هو الباطلُ﴾

وە ئەم جۆرەش پێی دەوترێت (الإيمان بتوحيد الأُلوهية) (تەنها پەرستراویتی خوا).

جا هەر کەسێك بەم سێ شێوەیەی پێشوو باوەڕی بە خوا هەبێت ئەوا بڕواداراو ئیمانەکەی ڕاست و دروستە ،بەڵام کە خەلەل لە شێوەیەك لەم سێ شێوەیەدا هەبوو،ئەوە خەلەل دەکەوێتە ئیمانەکەی و ئیمانێکی ڕاستی نابێت.

**بەڵام ئیمان بوون بە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە دەبێت:**

١. بە نێردراوی خوای دابنێیت.
٢. بە ڕاستی دانێیت لە هەموو باس و هەواڵێکی.
٣. گوێڕایەڵی بکەیت لە فەرمانەکانی.

٤. دوور بكەویتەوە لە نەهیەكانی .

٥. خوا پەرستی بكەیت بە گوێرەی سوننەتەكانی .

٦. بیكەیتە حەكەم لەهەموو كێشەیەك .

٧. خۆشت بوێت .

٨. بە عەبدو بەندەو خۆشەویستی خوای بزانیت، نەك بەشەریك و هاوەڵی خوا لە سیفەت و تایبەتمەندیەكانی!.

كەواتە: دروست نیە چۆن ئیمانت بە خوا هەیە، تاواش بە هەمان شێوە ئیمانت بە پێغەمبەرەكەی ﷺ هەبێت!!.

چونكە وا باوەڕمان بە خوا هەیە كە خالقەو پەروەردگارەو، سودو قازانج و زەرەرو زیانی بە دەستەو، تەنها پەرستراوی حەقەو، پەرستن تەنها بۆ ئەو دەكەین.

بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەم جۆرە باوەڕەمان نیە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ؛ چونكە ئەو بەندەی خوایەو عەبدە، نەك مەعبود؛ بۆیە پەرستنی بۆ ناكەین و هاواری ناكەینێ و سوێندی پێ ناخۆین و ناشڵێین: بەناوی خواو پێغەمبەر ﷺ، یان بە پشتیوانی خواو پێغەمبەر !!؛ چونكە ئەوە بەرزكردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ سەروی ئاستی خۆی، بۆ ئاستی خوایەتی و شەریكایەتی لەگەڵ خوا، پەنا بەخوا.

كەواتە: ئیمان بوون بە پەروەردگاریەتی وپەرستراوێتی خوا دەبێت بە تەنهایی(توحید) بێت؛ بۆیە (إبراهیم) ـ علیه السلام ـ كێشەی لەگەڵ قەومەكەی ئەوە بوو كە ئیمان هێنانیان (تەنها) بە خوا نەبوو. ئەویش دەیفەرموو: من بەریم لێتان و دوژمنتانم:

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ، إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ: إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ، وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ، كَفَرْنَا بِكُمْ، وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا، حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ﴾(الممتحنة:٤)

واتە تاوەكو ئیمان دێنن بە خوا بە تەنهایی !! .

كەواتە: ئەگەر ئیمانیشت بەخوا ببێت، بەڵام كە بە تەنها (باللهِ وَحْدَهُ) نەبوو، بێ كەڵكەو سودی نیە؛ چونكە زۆر لە خەڵكی ئیمانیان بە خوا هەیە، بەڵام بە هەمان شێوەش ئیمانیان بە غەیری خوا هەیە لە پەرستن بۆ كردن و هاوار بۆ كردن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ ﴾ (يوسف:١٠٦).

واتە: زۆربەی خەڵکی ئیمان هێنانیان تەنها بەخوا نیە بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا کە ئیمانیان بەخوا هەیە کە خالق و مالك و پەروەردگارە، بەڵام باوەڕیان بە غەیری ئەویش هەیە کە لەگەڵ خوا شایستەیە هاواری بکەینێ و داوای لێ بکەین و پشتی پێ ببەستین و لێی بترسین و بە گەورەی دابنێین و سوێندی پێ بخۆین و نەزری بۆ بکەین!!.

بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی ئیمانیان بەخوا هەیە موشریکن وەك خوا فەرمووی؛چونکە ئیمانەکەیان تەنها بەخوا نیە، واتە (بالله وحده) نیە، بەڵکو بەخوایەو بە غەیری خواشە، وەك پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان...

هەر بەوەش تەواو نابێت کە بڵێیت باوەڕم بەخوا هەیە، بەڵکو دەبێت باوەڕ بوونەکەت پێی بە تەنهایی (وَحْدَهُ) بێت.

* وە سیفەتی دووەمی (أولياء الله) ئەوەیە کە بە تەقوا بن و تەقوای خوا بکەن:

تەقوای خواش ئەوە نیە لە مزگەوت، یان لە تەکیە، یان لە بازاڕ تەسبیحێکی درێژ بە دەستەوە بگریت و بەسەر بادان و چاو نوقاندنەوە بڵێیت: الله، الله، الله، یاخود بڵێیت: یا هو، یا هو، یان یا حي، یا حي !!.

بەڵکو تەقوای خوا، بەم شێوەیە دەبێت کە پێشەوای تابیعی: (طلق بن حبيب) ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ فەرموویەتی: کە لێیان پرسی: ما التقوى ؟. واتە تەقوا چیە؟. وتی:

**١. أن تعمل بطاعة الله، على نور من الله، ترجو ثواب الله،**

**٢. و أن تترك معصية الله، على نور من الله، تخافُ عقاب الله** [١].

واتە: تەقوا بریتیە لە دوو بڕگە:

**بڕگەی یەکەمی پێناسەی تەقوا :**

تعمل بطاعة الله: واتە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکەیت، بەڵام چۆن فەرمانەکان جێ بەجێ بکەیت و عیبادەتەکەت بکەیت ؟.

(١) بڕوانە (الزهد لـ(ابن المبارك)، ص (٤٧٣).

علي نور من الله: واتە بەپێی ڕووناکیەك کە لە خواوە هاتووە،کە وەحی قورئان و سوننەتە، واتە بەپێی قورئان و سوننەت فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەیت، نەك بەگوێرەی هەوای نەفس و عادەتی خەڵك و سیاسەتی ڕۆژگارو لاسایی کردنەوەی کوێرانە!.

وە کە لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت فەرمانەکانی خوات بەجێ گەیاند، ئایا بە چ نیەتێکیش تۆ ئاوا بەجێیاندەگەیەنیت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەیت ؟! ئایا بە نیەتی ڕیایی و پێش چاوی و شوهرەت و دونیا ؟، یان تەنها بە نیەتی ڕازی کردنی خواو بە ئەمەلی پاداشتی خوایی ؟ بۆیە وتی:

ترجو ثواب الله: واتە ئەم گوێڕایەڵیە بۆ ئەوە بکەیت پاداشتی خوات دەست کەوێت و، ڕەجای پاداشتەکەی بیت. واتە تەنها بۆ خاتری خوا بیکەیت و هیچ نیەتێکی ترت نەبێت لە عیبادەت و پەرستن و نوێژ کردن و... هتد. تا ئێرە بڕگەی یەکەمی تەقوا بوو.

وە بڕگەی دووەمی تەقوا ماوە کە بریتیە لە:

وأن تترك معصية الله: واتە وازیش بهێنیت لە تاوان و گوناهو کاری حەرام و سەرپێچی کردن (معصية). وەك شیرك و بیدعەو زیناو دزی و، کوشتنی نا حەق و درۆو بۆهتان و جاسوسی و دونیا خواردن بەناوی دین و فێڵ کردن و چەتەیی...، بەڵام چۆن واز بهێنیت لەم تاوانانە، چۆن خۆتیان لێ بە دوور بگریت ؟!

علي نور من الله: واتە بەپێی ئەم ڕۆشنایی قورئان و سوننەتەوە کە لە خواوە هاتووە، واز بهێنن لە حەرام. واتە دوور کەوتنەوەکەشت لە حەرام، با هەر بەپێی قورئان و سوننەت بێت و، لەژێر ڕۆشنایی وەحی خوایی بێت. نەك بەپێی هەوای نەفس و عادەتی خەڵك و سیاسەتی وڵات و بڕیاری عەقڵ.

چونکە قورئان و سوننەت بۆت دیاری دەکەن کە چ شتێك تاوانەو حەرامە، وە تا چ ئەندازەیەك و حەجمی تاوانەکەش چەندە.وە چۆنیش خۆمانی لێ بەدوور بگرین، بەڵام غەیری قورئان و سوننەت بە ڕاستی و تەواوی ئەم شتانەت بۆ ڕوون ناکاتەوە.

بۆ نمونە: پەروەردگار زینای بە حەرام داناوە، وە چۆنیەتی خۆ لێ پاراستنیشی بۆ ڕوون کردویتەوە؛ کە بەوە دەبێت خۆت بپارێزیت لە سەبەبەکانی وەك: سەیرکردنی ئافرەتی بێگانەو،

تێکەڵاوی ژن و پیاو(الاختلاط)، وە هەروەها تەنها بوون لەگەڵ ئافرەتێك (الخلوة). پەروەردگار فەرمانی کردووە خۆت لەمانە بپارێزیت بۆ ئەوەی دوور بکەویتەوە لە زینا. وە هەروەها فەرمانیشت پێ کراوە ژن بهێنیت ـ ئەگەر توانیت ـ بۆ ئەوەی لە بنەڕەتدا بیری زینا کردنت کپ بێتەوە، وە کە نەشت توانی ڕێگایەکی ترت بۆ دانراوە کە بریتییە لە ڕۆژوو گرتن؛ چونکە ڕۆژوو شەهوەت لاواز دەکات و دوورت دەخاتەوە لە زینا کردن.

بەم شێوە حەکیمانەیە قورئان و سوننەت ڕێگای واز هێنان لە زینا کردنیان بۆ داناویت. بەڵام کە لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت واز نەهێنیت لەو حەرامەی کە زینایە بۆ نمونە: ئەوە پەنا دەبەیتە بەر ڕێگایەکی حەرام بۆ خۆ پاراستن لە حەرامێکی تر کە زینایە. وە ئەو شێوە حەرامەش کە زۆر لە گەنجی ئیمان لاواز گرتویەتییە بەر بۆ خۆپاراستن لە زینا بریتییە لە (الاستمناء) واتە: ئاو هێنانەوە، مرۆڤ زینا لەگەڵ دەستی خۆی بکات ـ پەنا بەخوا ـ بۆ ئەوەی شەهوەتەکەی دابمرکێتەوەو توشی زینا نەبێت.

بەڵام بەداخەوە شێوەی لە حەرام دوورکەوتنەوەکەی حەرامە؛ چونکە بەپێی قورئان و سوننەت دوورنەکەوتەوە لە حەرامەکە بەڵکو بەگوێرەی هەوای نەفس و، عادەتی گەنجی فاسق ویستی خۆی بپارێزێت لە زینا.

کەواتە: هەروەك چۆن پێویستە واز بهێنیت لە حەرام، بەهەمان شێوەش پێویستە واز هێنانەکەت وازهێنانێکی شەرعی بێت و، بەگوێرەی قورئان و حەدیسی (صحیح) بێت. ئەگینا قەرزدار دەبێتەوە لەسەری.

وە کە وازیشمان هێنا لە حەرام بەشێوەیەکی شەرعی ئایا بۆچی وازمان هێناو، بە چ نیەتێك دوورکەوتینەوە لە حەرام ؟:

ئایا لەبەر ئەوە بوو دەستمان نەکەوت!. و هەڵنەسوڕا ـ وەك زۆر کەس کە زینا ناکەن یان دزی ناکەن لەبەر ئەوە نایکەن چونکە دەستیان ناکەویت ـ!.

نەخێر پێویستە وازهێنانەکەمان لە حەرام لە ترسی عیقاب و سزای خوا بێت، بۆ ئەوەی توشی غەزەب و عیقابی خوا نەبین، بۆیە وازمان هێنا لە حەرام.

بۆیە فەرمووی: (تخافُ عقابَ الله). واتە: چونکە لە عیقابی خوا دەترسیت بۆیە دوور کەوتیتەوە لەو شتەی کە خوا حەرامی کردووە.

کەواتە: بە پوختی و بە کورتی (تەقوا) بریتییە لـە: گوێڕایـەڵی کردنـی خـوا بـە کردنـی فەرمانەکانی و، واز هێنان لە نەهیەکانی، بەم شێوەیەی کـە خـۆی ڕێی بـۆ دانـاوین لەسـەر زمانی پێغەمبەر ﷺ وە گوێڕایەڵیەکەشمان تەنها لەبەر خاتری خوا بێت .

کەواتـە:① پێویـستە کـردەوە(عمـل)ت هـەبێت. ② وە بـە نیـەت و مەبەسـتێکی پـاك (اخلاص)یش بێت بۆ خوا. ③ وە موافیقی سونـەتی پێغەمبەریش ﷺ بێت (الاتباع).

کەواتە: هەرکەسێك:

① فەرمانەکانی خوا جێ بەجێ نەکات

② وە دووریش نەکەوێتەوە لە شتە حەرامەکان

③ یاخود بە خالیسی نیەتی خوا نەبێت

④ یاخود موافیقی قورئان و سوننەت نەبێت.

ئەوە تەقوای خوای تەواو نیەو خەلەلی تێدایە بەم شێوەیەی خوارەوە:

* ئەگەر خەلەل لە نیەتەکەیدا هەبوو ئەوە تووشی ڕیاو شیرك دەبێت پەنا بەخوا.

* ئەگەر خەلەل لە موافەقەی قورئان و سوننەت دابـوو، واتـە گوێڕایەڵیـەکـەی موافیـق نەبوو لەگەڵ قورئان و سوننەت؛ ئەوە توشی (ابتداع) بیدعە دەبێت و گومڕا دەبێت.

* ئەگەر واجباتەکان هەمووی نەکات، یان حەرامـەکان هـەمووی واز لێ نـەهێنێت ئـەوە بەرەو فاسق بوون دەچێت و، توشی تاوان و گوناه (معصية) دەبێت پەنا بەخوا.

کەواتە: دوای ئەم ڕوون کردنەوەیە زانیمان کە دۆسـتانی خـوا (أوليـاء الله) دوو سـیفەتیان تێدایە:

① ئیمانی تەنها بەخوا (الإيمان بالله وحده).

② تەقوای خوا بەم شێوەی باسمان کرد.

کەواتە: هەر موسڵمانێك ئەم دوو سیفەتەی تێدا بێت ئەوە یەکێکە لە (أولياء الله) ئەگـەر کرێکارێکیش بێت، یان کەنناسێکیش بێت.

چونکە تەنها بەم دوو مـەرجە موسڵمان دەبێتە وەلی، نەك بە چوونە ناو ئەشکەوت بۆ ماوەی چل ڕۆژ دوور لە مزگەوت و جەماعەت و جومعە !! وە خواردنی دەنکە خورمایەك ڕۆژانە!.

نەخێر لە هیچ ئایەت و حەدیسێکدا نەهاتووە کە بەم مەرجە خەڵك ببێت بە وەلی خوا. یان بە شمشێر لە خۆدان و هاوار کردنە غەیری خوا.

بەڵام پێویستە بزانین کە دۆستان و خۆشەویستانی خوا، هەموویان لە یەك پلەدا نین، بەڵکو بەرزی و نزمی هەیە لە نێوانیاندا. وە تاوەکو مرۆڤ دوو مەرجی وەلییێتی (الایمان والتقوی)ی بە تەواوی تێدا بێت، ئەوە زیاتر لەخوا نزیك دەبێتەوەو، پلەی بەرزتر دەبێت.

## * پرسیار: ئایا هەر موسڵمانێك واجبەکان بکات و دوور بکەوێتەوە لە حەرامەکان وەلی خوایە ؟

وەلام: بەڵێ بەڵام بە مەرجی (ئیخلاص) و (إتباع): واتە بە خالیسی بۆ خوا واجبەکانی کردبن و دوورکەوتبێتەوە لە حەرامەکان. وە هەروەها شوێن کەوتەی پێغەمبەریش ﷺ بوو بێت لەو واجبە بەجێ گەیاندن و دوور کەوتنەوەیەی لە حەرام. واتە چۆن پێغەمبەر ﷺ واجبەکەی کردووە ئەویش ئاوا، واتە بەگوێرەی قورئان و سوننەت.

## پرسیار: ئایا بە چ شتێکی تر مرۆڤ زیاتر لەخوا نزیك دەبێتەوەو، چاکتر دەبێتە وەلی خوا ؟!

وەلام: بە کردنی سوننەتەکان، نوێژی سوننەت، ڕۆژووی سوننەت، خێری سوننەت، حەجی سوننەت... بەڵام بە مەرجێك (ئیخلاص و إتباع)ی لەگەڵ بێت.

پێغەمبەر ـ ﷺ ـ لە حەدیسێکدا فەرمووی خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ مَنْ عادى لي وليّاً فقد بارزني بالمحاربة ـ أو فقد آذنتُهُ بالحرب ـ وما يتقرب اليّ بمثل أداء ما افترضتُ عليه، ولا يزال عبدي يتقربُ إليّ بالنوافل حتى أُحِبّهُ، فاذا أحْبَبْتُهُ كنتُ سمعُهُ الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به، ويده التي يبطشُ بها، ورجله التي يمشي بها، فبي يسمع وبي يُبصِرُ وبي يبطِشُ وبي يمشي. ولئِن سألني لَأُعْطِيَنَّهُ، ولَئِن استعاذ بي لَأُعيذَنّهُ، وما ترددتُ عن شيءٍ أنا فاعلُهُ ترددي عن قبض نفس عبدي المومن، يكره الموت وأكرهُ مساءتهُ ولابد لهُ منه ﴾[1]

(١) صحيح البخاري.

واتە پەروەردگار فەرموویەتی: هەر کەسێك دوژمنایەتی خۆشەویست و دۆستێکی من بکات، ئەوە ئیعلانی جەنگی لە دژ دەکەم و، خۆم دژایەتی دەکەم، وە بەندەی من بە هیچ وەسیلەیەك لەمن نزیك نابێتەوە، وەك بەکردنی فەرزەکان لێم نزیك دەبێتەوە!.

وە بەردەوام بەندەی من لێم نزیك دەبێتەوە بە کردنی سوننەتەکانیش، سەرەڕای فەرزەکان، تا خۆشم دەوێت.

وە کە خۆشیشم ویست دەیپارێزم لەهەموو خراپەیەك، وە سەرکەوتووی دەکەم بۆ هەموو چاکەیەك بەشێوەیەکی وا؛ بیستن و بینین و گرتن و هەنگاونانی بەگوێرەی ڕەزامەندی من دەبێت؛ چونکە بەگوێرەی ویستی من دەبیستێت و دەبینێت و دەگرێت و هەنگاو دەنێت. واتە چیم پێخۆش بێت وادەکات و چیم پێ ناخۆش بێت نایکات. واتە خۆشەویستی و ناخۆشەویستی، وە هەروەها دۆستایەتی و دوژمنایەتی، وە هەروەها بەخشین و گرتنەوەی لە ڕەزامەندی مندا دەبێت. ئەو کاتە ئەگەر داوام لێ بکات پێی دەبەخشم و، پەنام پێ بگرێت پەنای دەگرم...)

**تێبینی:**

لەم حەدیسە قودسیە پیرۆزەدا دەرکەوت کە کێ دۆست و خۆشەویستی (وەلی) خوایە. وە بەچ وەسیلەیەك لەخوا نزیك دەبێتەوەو، دەبێت بە خۆشەویستی خواو، وەڵامی دەدرێتەوە.وە کەی خوا ڕێزی لێ دەنێت و کەرامەتی پێ دەبەخشێت.

بەڵام ئەم مەرجانەی (أولیاء الرحمن) ئەوە ناگەیەنێت کە بڕوامان وابێت هەڵە ناکەن و، پارێزراون (معصوم) لە هەڵەو، هیچ کاتێك تاوان ناکەن.

نەخێر ئەگەر هەڵەو تاوانیشی کردبێت، بەڵام تەوبەی کردبێت لێی، ئەوا هەر بە وەلی خوا دادەنرێت.

کەواتە ئەو کەسانەی کە وا گومان دەبەن دەبێت (وەلی) مەعصوم بێت. گومانەکەیان هەڵەیە؛ چونکە بەگوێرەی ئەو گومانە هیچ موسڵمانێکیان نەهێشتۆتەوە بە خۆشەویست و وەلی خوا.

وە بە پێچەوانەی ئەوانیش کەسانێکی نەفام هەن، کە بڕوایان وایە ئەوەی وەلی بێت قەت هەڵە ناکات و، قسەکانی هەموو حەقن و، کردەوەکانی هەموو چاکن !!. ئەم بۆچوونەش دیسان

هەڵەیە؛ چونکە هیچ کەسێك تەرازووی حەق ناسی نیە، تەنها پێغەمبەری خوا نەبێت. ئەویش لەبەر ئەوەی ﴿وما ینطق عن الهوى إن هو إلاّ وحيٌ یوحى﴾ واتە لەخۆیەوە قسەی نەدەکرد بەڵکو لەوەحیەوە بوو. وە هەروەها ﴿ كان خُلُقُهُ القرآن﴾ واتە ڕەوشتی قورئانی بوو[1].

کەواتە: بە بەڵگەی قورئان و حەدیس، بۆمان دەرکەوت کە ئەمانەی خوارەوە وەلی خوا نین:

جولەکەو گاورو ئاگر پەرست (مەجوسی) و گـا پەرستەکان (هینـدۆس)و، بـت پەرسـت و شەخس پەرسـت و گۆڕپەرستەکان؛ چونکە ئەمانە هەموویان شیرکیان هەیەو بە تەنها ئیمانیان بەخوا نیە (بە تەوحیدی).

وەهەروەها تەقوای خوایان نەکردووە؛ چونکە خوای گـەورە گـەورەترین فـەرمانی (واعبـدوا الله)یە، واتە بە تەنها خوا بپەرستن بە تەوحیدی. وە گەورەترین نەهی (ولا تشركْ بهِ شیئاً)ە، واتە هیچ شەریکی بۆ دامەنێن.

بەڵام گۆڕپەرست ونەفامان فەرمانەکـەیان بـەجێ نەگەیانـدووەو، لـە نەهیەکـەش خۆیـان نەپاراستووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە جوڵاونەوە، کە بە تەنها خوایان نەپەرسـتووەو شەریکیـشیان بۆ داناوە لە پەرستن و هاوار کردن و ماڵ بەخشین و نەزرکردن و سەربڕین و پشت پـێ بەسـتن و ڕەجا لێ کردن و ئیعتیقاد پێ بوون...

وە هەروەها هیچ عیبادەتێکیان لـە ژێـر ڕۆشـنایی قورئـان و سـوننەت و شـوێن کـەوتنی پێغەمبەر ـ ﷺ ـ نیە، لەکاتێکدا کە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ آل عمران:٣١)

واتە ئەی محمد بەو خەڵکە بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت و دۆستی ئەون، ئەوە شوێنی من بکەون، ئەوکاتە خواش خۆشی دەوێن و لە تاوانتان دەبوورێت. کەواتە هەر کەسـێك شـوێن پێغەمبەر ﷺ و سوننەتەکانی نەکەوێت، ئەوە خوا خۆشی ناوێت و خۆشەویست و دۆسـتی خـوا نیـە واتە (وەلی) خوا نیە .

(1) تێبینی پێغەمبەر ﷺ بیروباوەڕو ڕەوشت و هەڵسوکەوتی قورئانی بوو، نـەك خـۆی قورئانێـك بووبێـت و بەسەر زەویدا ڕۆیشتبێت. وەك هەندێ چیرۆك گێـڕەرەوەی نـەفام بـە عەقیـدەی ئیـسلام لـە وتارەکانیانـدا وا حەدیسەکە لێك دەدەنەوە! . (النبي ﷺ مخلوقٌ والقرآن غیرُ مخلوق).

*** کەوابوو ئەم شەخس پەرست و گۆڕپەرستە پشت هەڵکردووانە لە سوننەتی پێغەمبەر ـ ﷺ ـ وەلی کێن ؟!.**

بێگومان وەلی شەیتانن (أولیاء الشیطان)؛ چونکە بەفەرمانی شەیتان شەریکیان بۆ خوا داناوەو، وازیان لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هێناوە. وە پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ ﴾(الأعراف:٣٠).

واتە: ئەوان شەیتانیان گرتووە بە دۆستی خۆیان لە حەقیقەتدا، بەڵام خۆیان ـ ئەوەندە نەفامن ـ وا دەزانن کە هیدایەت دراون و لەسەر ڕێبازی ڕاستن و لە(أولیاء الرحمن)ن !!.

تا ئەو ئەندازەیە شەیتان گومڕای کردوون، کە ئەو دەپەرستن و هەستیش بەوە ناکەن، بەڵکو وادەزانن کە خوا دەپەرستن و دۆست و وەلی ئەون.

وە لە چەندان ئایەتی تریشدا پەروەردگار باسی (أولیاء الشیطان)ی کردووە وەك:

﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾ (الأنعام: من الآية١٢١).

﴿يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِنَ الرَّحْمَنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيّاً ﴾ (مريم:٤٥).

﴿إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾(آل عمران:١٧٥).

﴿ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً ﴾ (النساء: من الآية٧٦).

## جیاوازی لە نێوان

| أولياء الشيطان | أولياء الرحمن |
|---|---|
| ١. الذين أشركوا بالله غيره:<br>ئەوانەن کە ئیمانیان تەنها بە خوا نیە بەڵکو لەگەڵ خوا ئیمانیشیان بە کەسان و شتی تریش هەیە کە هاواری بکرێتێ و ئیعتیقادت پێی بێت و داوای لێ بکەن و لێی بترسێن و بە گەورەی دابنێن:<br>(وما يومن أكثرهم بالله إلاّ وهم مشركون) | ١. الذين آمنوا بالله وحده:<br>ئەوانەن کە باوەڕیان بە خوا هەیە کە تەنها ئەو پەروەردگارو پەرستراوی حەق و ڕاستەو، هەر ئەو سودو زیانی بە دەستە. لەبەرئەوە هەر هاوار دەکەنە ئەوو ئیعتیقادیان تەنها بەوە. |
| ٢. آمنوا بأنّ محمداً يُعبَدُ مع الله ولايتّبع في شريعته.<br>واتە بەگوێرەی کردەوە کانیان باوەڕیان وایە کە محمد ﷺ دەپەرسترێت و هاواری دەکرێتێ. بەڵام شوێنیشی ناکەون لە شەریعەتەکەی. واتە وەکو ئەو خوا پەرستی ناکەن بە گوێرەی قورئان و سونەت، بەڵکو بەگوێرەی هەوار ئارەزوو. | ٢. آمنوا بأنّ محمداً عبدالله ورسوله:<br>عبدٌ (لايُعْبدُ)، ورسول (لايُعْصى).<br>واتە باوەڕیان وایە (محمد) بەندەو نێرراوی خوایە. بۆیە نەیان بردۆتە ڕیزی مەعبود (پەرستراو) و هاواری ناکەنێ و پەرستنی بۆ ناکەن، چونکە خۆی عەبدە نەك مەعبود. بەڵام شوێنی دەکەون لە شەریعەتەکەی، چونکە نێرراوی خوایە (رسوله). بۆیە وەکو ئەو خوا پەرستی دەکەن. واتە پێغەمبەر بەواسیتەی ڕاگەیاندن دادەنێن نەك بەواسیتەی لەخوا نزیك کردنەوە. |
| ٣. يفعلون المحظور، ويتركون المأمور:<br>گەورەترین خراپە کەخوا نەهی لێ کردووە، کە شیرکە دەیکەن. وە گەورەترین فەرمانی خوا ئیهمال دەکەن کە تەوحیدە (خوا بە تەنها پەرستنە). | ٣.[وكانوا يتقون]<br>خۆپارێزی دەکەن لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوا، وە لە نزیك بونەوە لە نەهیەکانی. |
| ٤. فەرزەکانیش وەکو خۆی ئەنجام نادەن. وە دوورن لە جەماعەت و مزگەوت. | ٤. سەرەڕای فەرزەکان سونەتەکانیش دەکەن بە گوێرەی توانا. وە ئەهلی جەماعەتن. |

| | |
|---|---|
| ٥. زۆر پابەندن بە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ . | ٥. بیدعە پیشەیانەو، سوننەتیش غەریبە لە ناویاندا. |
| ٦. دۆستی دۆستانی خوان لە ئەهلی تەوحید و سوننەت. وە هەر شتێك کە خواو پێغەمبەر پێیان خۆش بێت ئەوانیش ئەوەیان پێ خۆشە. وە دوژمنی دوژمنانی خوان. | ٦. دژی ئەهلی سوننەت و تەوحیدن، وە ڕقیان لە باسکردنی سوننەتە. وە دۆستی ئەو کەسانەن کە پارەو دەسەڵاتیان دەدەنێ ئەگەر کافریش بن و دوژمنی دینەکەی خواش بن!. ﴾[1] |
| ٧. پیرۆزترین پەرستگایان مزگەوتەکانن. | ٧. پیرۆزترین پەرستگایان ئەزرگاو مەزارو سەر قەبری پیاوچاکانە.[2] |
| ٨.ڕێز لە پێغەمبەران وپیاوچاکان دەگرن بە گوێرەی شەرع، بێ زیادو کەم، وە لە سنوری عەبدێتی بەرزیان ناکەنەوە بۆ مەعبودێتی. وە گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان دەکەن و خۆشیان دەوێن. | ٨. ڕێز گرتن لە پێغەمبەران بەوە تێگەیشتوون کە لە پلەی عەبدێتی بەرزیان بکەنەوە بۆ ئاستی مەعبودێتی. وە زێدەڕەویش لە مەنزیلەتی پیاوچاکاندا دەکەن. |
| ٩. هۆی کەرامەتەکانیان ، تەقواکردن و گوێڕایەڵی کردنیانە بۆ خوا.. | ٩. هۆی دیاردە ناعادەتیە بەناو کەرامەتەکانیان، یا شەریك بۆ خوا دانان و هاوارکردە غەیری خوایە ، وە یا بیدعەیە .[1] |

(١) ((وهؤلاء أهل الأحوال الشيطانية في التلبيس يمحقون البركات، ويقوون المخافات، ويأكلون أموال النـاس بالباطل، لا يأمرون بالمعروف، ولا ينهون عن المنكر، ولا يجاهدون في سبيل الله، بل هُم مع من أعطاهم وأطعَمَهُم وعظَّمَهُم، وإن كان تتريًا؛ بل يرجحون التتر على المسلمين، ويكونون من أعوانهم و نُصَرائهم الملاعـين)) { ١ / ٨٤}.

(٢) ((ولهذا لما كانت عبادة المسلمين المشروعة في المساجد التي هي بيوت الله كان عمار المساجد أبعـد عـن الأحوال الشيطانيه، وكان أهل الشرك والبدع يُعظِّمون القبور ومشاهد الموتى فيدعون الميت أو يـدعون بـه أو يعتقدون أن الدعاء عنده مستجاب أقرب إلى الأحوال الشيطانية، فإنه ثبت في الصحيحين عن النبي ـ ﷺ ـ أنـه قال: [ لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد))المجموع (١١ / ٢٩٠)

(١) ((وأيضاً كراماتُ الأولياء لابُدّ أن يكون سببها الإيمان والتقوى؛ فما كان سببه الكفر والفسوق والعـصيان فهو من خوارق أعداء الله لا من كراماتِ أولياء الله، فمن كانت خوارقه لا تحصُل بالصلاة والقراءة والذكر وقيام

| | |
|---|---|
| ١٠. کەرامەتەکانیان و ڕێز لێنانیان لە لایەن خواوەیە. | ١٠. دیاردە ناعادەتییەکانیان لە شەیتانەکانەوەیە. |
| ١١. کەرامەتەکانیان سوودی دونیاو دینی تێدایە. وەك زیاد بوونی خۆرا و ئاو لە کاتی پێویستیدا، وەهەروەها باران بارین و، سەرکەوتن بەسەر دوژمندا. | ١١. دیاردە ناعادەتییەکانیان دزێو ناشیرین و پیس و زەرەرمەندن لە دین و دونیا. وەك خواردنی مارو قوتدانی ئاگرو لەخۆدانی شمشێرو...(٢) |
| ١٢.قورئان خوێندن خۆشترین شتە بەلایانەوە. | ١٢.گۆرانی و مۆسیقاو ڕەقس و هەڵپەڕکێ توێشوی بەناو کەرامەتەکانیانە. بەڵام حەز لە قورئان ناکەن؛ چونکە سیحرەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە، بە تایبەتیش آیة الكرسي . |

---

الليل والدعاء، وأنما تحصل عند الشرك، مثل دعاء الميت والغائب، أو بالفسق والعصيان وأكل المحرمات: كالحيّات والزنابير والخنافس والدم وغيره من النجاسات، ومثل الغناء والرقص؛ لا سيما مع النسوة الاجانب والمردان، وحالة خوارقه تنقصُ عند سماع القرآن وتقوى عند سماع مزامير الشيطان فيرقص ليلاً طويلاً، فإذا جاءت الصلاة صلى قاعداً أو ينفر عنه ويتكلّفهُ، ليس له فيه محبة ولا ذوق ولا لذة عند وجده، ويُحِبُّ سماع المكاء والتصدية ويجد عنده مواجيد. فهذه أحوال شيطانيه وهو ممن يتناوله قوله تعالى:

[ومَنْ يعشُ عن ذكر الرحمن نُقَيض له شيطاناً فهو له قرين ] المجموع (١١ / ٣٠٢).

[ لكن لا تقترن بهم الشياطين الإ مع نوع من البدعة، إما كفر، وإما فسق، وإما جهلٍ بالشرع، فإن الشيطان قصده اغواء قدرته، فإن قدر على أن يجعلهم كفّاراً جعلهم كفاراً، وإن لم يقدر إلا على جعلهم فُسّاقاً، أو عُصاةً، وإن لم يقدر إلاّ على نقص عملهم ودينهم، ببدعة يرتكبها يخالفون بها الشريعة التي بعث الله بها رسولهﷺ فينتفع منهم بذلك ] ولا يأتيهم الحال إلا عند مُؤَذِّن الشيطان وقرآنهِ، فَمُوذِّنُهُ المزمارُ، وقرآنه الغناءُ. ولا يأتيهم الحال عند الصلاة والذكر والدُّعاء والقراءة. (مجموع الفتاوى)

(٢) قال شيخ الإسلام: (( فلا لهذه الأحوال فائدةٌ في الدين ولا في الدنيا، ولوكانت أحوالهم من جنس عباد الله الصالحين وأولياء الله المتقين. لكانت تحصلُ عند ما أمر الله به من العبادات الدينية، ولكان فيها فائدة في الدين والدنيا لتكثير الطعام والشراب عند الفاقات، واستنزال المطر عند الحاجات، والنصر على الاعداء عند المخافات)). [ فالأحوال الرحمانية كرامات أوليائه المتقين يكون سببُهُ الايمان فإن هذه حال أوليائه... وتكون نعمةً لله على عبدهِ المومن في دينه ودنياه، فتكون حجةً في الدين وحاجة في الدنيا للمومنين ] (١ / ٨٤) .

## شەیتانەكان چۆن یارمەتی دۆستەكانیان دەدەن ؟

* هەندێكیان چ خواردنێك داوا بكات بۆی دەهێنن.
* دەیبەن بۆ شارێكی دوور بە ئاسماندا دەیفڕێنن. وە لەسەر ئاو دەیڕوێنن.
* دەیبەنە ناو ئاگر بێ ئەوەی ئاگری بەر بكەوێت یان بسوتێت.
* شوشەی پێ دەخۆن بێ ئەوەی برینداربێت.
* ماری پێ دەگرن و پێی دەخۆن بێ ئەوەی زەرەریان لێ بدات.
* خەبەری هەندێك شتی نادیاری پێ دەڵێن.
* شمشێری پێ لەخۆ دەدەن بێ ئەوەی زیانی لێ بدات و چەندەها دیاردەی شەیتانی تریشن، كە بێ سودن و لەگومڕا كردنی خەڵكی زیاتر هیچ سودێكیان نیە.

وە هەركەسێك ئەم دیاردانە بە كەرامەت بزانێت و بیانكات بە نیشانەی وەلییێتی خوا (أولياء الرحمن) ئەوە گومڕاو نەفام و گێلە.

چونكە كافرو موشریك و گاپەرست و بت پەرستەكانیش ئەم دیاردە نا عادەتیانەیان هەیەو، شەیتان زیاتریش یارمەتی ئەوان دەدات. كەواتە دەبێت ئەوانیش كەرامەتیان هەبێت و وەلی خوا بن[١]!. پەنا بەخوا لەم گومڕاییيە.

نیشانەی (أولياء الرحمن) تەنها خوا پەرستی و تەواو شوێن كەوتنی پێغەمبەرە ﷺ نەك بێ باڵ فڕین و مار خواردن و چوونە ناو ئاگر!!.

شێخ الإسلام ابن تيمية ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ زۆر بە جوانی و ئاشكرایی دینی (أولياء الشيطان)ی بۆ باس كردووین لە چەندان كتابیدا بۆیە شوێنی پێویستی لێ باس دەكەین: دەفەرموێت:

( وهؤلاء المشركون قد تتمثّل لهم الشياطين؛ قد تخاطبهم بكلام، وقد تحمل أحدهم في الهواء، وقد تخبره ببعض الأمور الغائبة، وقد تأتيه بنفقةٍ أو طعامٍ، أو كسوة، أو غير ذلك، كما جرى مثل

---

(١) بڕوانە مجموع الفتاوى (١ / ١٧٦).

ذلك لعُبَّاد الأصنام من العرب وغير العرب، وهذا كثير موجود في هذا الزمان، وغير هذا الزمـــان، للظالمين المبتدعين المخالفين للكتاب والسنّة، إمّا بعبادة غير الله، وإمّا بعبادة لم يشرعها الله)[١].

(ولا يجوز لأحدٍ أن يستغيث بأحدٍ من المشايخ الغائبين ولا الميّتين...بل كل هذا من الشرك الذي حرم الله ورسوله، وتحريمه مما يُعلم بالإضطرار من دين الاسلام، وهؤلاء المستغيثون بالغائبين والميّتين عند قبورهم وغير قبورهم ـ لما كانوا من جنس عباد الأوثان ـ صار الشيطان يُضلّهم، ويغويهم كما يضلُّ عباد الأوثان ويغويهم، فتتصور الشياطين في صورة ذلك المستغاث به وتخاطبهم بأشياء علـــى سبيل المكاشفة، كما تخاطب الشياطين الكهّان، وبعض ذلك صدقٌ، لكن لابد أن يكون في ذلك ما هو كذبٌ بل الكذب أغلب عليه من الصدقِ).

وقد تقضي الشيطان بعض حاجاتهم، وتدفع عنهم بعض ما يكرهونه،، فيظنّ أحدهم أن الشيخ هو الذي جاء من الغيب حتى فعل ذلك، أو يظن أن الله تعالى صور ملكا ــ على صورته ــ فعـــل ذلك، ويقول أحدهم: هذا سِرّ الشيخ وحاله ! وإنما هو الشيطان تمثل على صورته ليُضِلّ المـــشرك المستغيث به))[٢].

((وهؤلاء الذين يستغيثون بالأموات من الأنبياء، والصالحين، والشيوخ، وأهل بيت النبي ﷺ فآية أحدهم أن يجري له بعض هذه الأمور، أو يحكي لهم بعض هذه الأمور، فيظن أن ذلـــك كرامـــة، وخرق عادة بسبب هذا العمل. ومن هؤلاء مَنْ يأتي إلى قبر الشيخ الذي يشرك به ويـــستغيث بـــه فينـــزل عليه من الهواء طعامٌ، أو نفقة، أو سلاح، أو غير ذلك مما يطلبه فيظن ذلك كرامة لـــشيخه، وإنما ذلك كله من الشياطين. وهذا من أعظم الاسباب التي عبدتْ بها الاوثان))[٣].

((والأسود العنسي الذي ادّعى النبوّة كان له من الشياطين مَنْ يُخبرُهُ ببعض الأمور المغيبة، فلما قاتلهُ المسلمون كانوا يخافون من الشياطين أن يخبره بما يقولون فيه: حتى أعانَتْهم عليه امرأته لما تبيّن لها كفره فقتلوه.

وكذلك مسيلمة الكذاب كان معه من الشياطين مَنْ يُخبرهُ بالمغيبات ويُعينه على بعض الأمور، وأمثال هؤلاء كثيرون مثل: [ الحارث الدمشقي ] الذي خرج بالشام زمن عبدالملك بـــن مـــروان

(١) مجموع الفتاوى (٨٣ / ١).

(٢) مجموع (٣٥٩).

(٣) مجموع (٣٦٠ــ ٣٦١).

وادعى النبوّة وكانت الشياطين يخرجون رجليه من القيد، وتمنع السلاح أن ينفذَ فيه، وتُسبح الرخامة إذا مسحها بيده، وكان يرى الناس رجالاً و ركباناً على خيلٍ من الهواء ويقول: هي الملائكة، وإنما كانوا جنّاً، ولما أمْسَكَهُ المسلمون ليقتلوه طعَنهُ الطاعنُ بالرُّمحِ فلم ينفذ فيه، فقال له عبدالملك: إنّك لم تُسَمِّ اللهَ فسَمّى الله فطعَنَه فقتله.

وهكذا أهل الأحوال الشيطانيه تنصرف عنهم شياطينهم إذا ذُكر عندهم ما يطردها مثل آية الكرسي))[١].

((ولهذا لما كانت عبادة المسلمين المشروعة في المساجد التي هي بيوت الله كان عمار المساجد أبعد عن الأحوال الشيطانيه، وكان أهل الشرك والبدع يُعظّمون القبور ومشاهد الموتى فيدعون الميت أو يدعون به أو يعتقدون أن الدعاء عنده مستجاب أقرب إلى الأحوال الشيطانية، فإنه ثبت في الصحيحين عن النبي ﷺ أنه قال: [ لعن اللهُ اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد))[٢].

((ويَرْوون حديثاً هو كذبٌ باتفاقِ أهل المعرفة وهو: (إذا أعيتكم الأمور فعليكم بأصحاب القبور) وإنما هذا وضع من فتح باب الشرك.

ويوجد لِأهل البدع وأهل الشرك المتشبهين بهم من عباد الاصنام والنصارى والضلال من المسلمين أحوال عند المشاهد يظنونها كرامات وهي من الشياطين مثل أن يوضع عنده مصروع فيرون شيطانه قد فارقه، يفعل الشيطان هذا ليضلّهم))[٣].

((فالعبادات و الزهاداتُ والمقالات والتورعات الخارجة عن سبيل الله ــ وهو الصراط المستقيم: الذي أمرنا الله أن نسأله هدايته، وهو ما دلّ عليه السنّة ــ هي سُبُل الشيطان، ولو كان لِأحدهم من الخوارق ماكان، فليس أحدهم بأعظم من مقدمهم الدجال الذي يقول للسماء: أمطري فتمطر وللأرضِ أنبتي فتنبت، وللخربة أظهري كنوزك فتخرج معَهُ كنوز الذهب والفضّة. وهو مع هذا عدوالله، كافرٌ بالله. وأولياء الله هم المذكورون في قوله: ﴿ألا إنّ أولياء الله لاخوفٌ عليهم ولاهُمْ يحزنون. الذين آمنوا وكانوا يتّقون ] فهم المؤمنون المتّقون، والتقوى فعل ما أمرالله به، وترك ما نهى الله عنه، فمن ترك ما أمر الله، واتخذ عبادةً نهى الله عنها، كيف يكون من هؤلاء ؟!) (المجموع ١١ / ٦١٨، ٦١٩)..

---

(١) المجموع (١١ / ٢٨٥)
(٢) المجموع (١١ / ٢٩٠)
(٣) المجموع (١١ / ٢٩٣)

((ولهذا قال أهل العلم والدين ـ كأبي يزيد البسطامي ونحوه ـــ: لو رأيتم الرجُلَ يطير في الهواء، أو يمشي على الماء فلا تغترّوا به حتى تنظروا وقوفه عند الامر والنهي.

وقال الشافعي: لو رأيتم صاحب بدعة يطير في الهواء، فلا تغترّوا به، فأولياء الله المتقون هم المتبعون لكتاب الله، و سنّة رسول الله ﷺ .

وأما أهل الشرك والبدع والفجور فأحوالهم من جنسِ أحوال مسيلمة الكذاب والأسود العنسي اللَّذَينِ ادّعيا النبوة في آخر أيام النبي ﷺ وكان لكل منهما شياطين تخبره وتُعينه))[١].

((ومن الشرك أن يدعوا العبدُ غيرَ الله، كمن يـستغيثُ في المخـاوف والأمـراض والفاقـات بالأموات، والغائبين.

وهؤلاء المشركون قد يتمثلُ لِأحدهم صورة الشيخ الذي استغاث به. فيظن أنه الشيخ، أو ملَكٌ جاءَ على صورته، وإنما هو شيطان تمثل له لِيُضلّهُ ويغويه لما دعا غير الله؛ كما كان نصيب المشركين الذين يعبدون الاصنام تخاطبهم الشياطين. وتتراءى لهم، وتخبرهم به من الكذب مـا يـبين أنهـم شياطين. قال تعالى: ﴿ هل أنبّئكم على مَنْ تنـزّلُ الشياطين ؟ تنـزّلُ على كُلّ أفـاكٍ أثـيم ﴾ وهؤلاء كثيرون في المشركين: من الهند والترك، والحبشة، وفي المتشبّهين هم من الضلال المنتسبين إلى الاسلام... منهم من يدخل النار، ويأكل الحيات، ومنهم من يصرخ في بعض الناس فيمرض، أو يموت.

وهذه الأحوال تعرض لهم عند فعل ما يأمر به الشيطان، مثل السماع البدعي، سماع المكـاء والتـصدية، وغير ذلك؛ فإن الذين يتخذون ذلك قربة وديناً تتحرك به قلوبهم. ويحصل لهم عنده من الوجل والصياح مـا تنـزل معه الشياطين. كما يدخل الشيطان في بدن المصروع؛ ولهذا يزبدُ أحدهم كازبادٌ المصروع، ويصيح كصياحِهِ. وذلك صياح الشياطين على ألسنتهم؛ ولهذا لا يدري أحدٌ ما جرى منه حـتى يفيـق، ويـتكلم الشيطان على لِسان أحدهم بكلام لا يعرفه الانسان، ويدخل أحدهم النار، وقد لبسهُ الشيطان ويحصل ذلك لقوم من النصارى بالمغرب، وغيرهم. تلبسهم الشياطين، فيحصل لهم مثل ذلك.

فهؤلاء المبتدعون المخالفون للكتاب والسنّة أحوالهم ليست من كرامات الصالحين؛ فإن كراماتِ الصالحين إنما تكون لِأولياء الله المتّقين))[٢]

---

(١) المجموع (١١ / ٦٦٦)

(٢) المجموع (١١ / ٦٦٤-٦٦٥).

* دوای ئەوەی بۆمان دەركەوت ئەوانەی هـاوار دەكەنـە شـێخێكی زینـدووی غائیـب یـان مردووی ناو گۆڕ ئەوانە (أولیاء الرحمن) نین، بەڵكو (أولیاء الشیطان)ن.

وە ئەو دیاردە سەیرە ناعادەتیانەش كە لێیان دەبینرێت كەرامەت نیەو، نیـشانەی وەلییێتـی نیە، بەڵكو گومڕاییەو هۆیەكەی شیرك و بیدعەو سەرپێچیە.

## * با بزانین ئایا دیاردە سەیرەكانیان چەند جۆرن و چۆن دەیكەن؟

وەڵام: ئەم دیاردە سەیرە ناعادەتیانە (خارق العادة). لە دوو جۆر تێپەڕ ناكەن:

١. حالٌ شیطانيّ، ٢. ومحالٌ بُهتانيّ . یاخود بە عیبارەتێكی تر:

١. حالٌ إبلیسيّ ، ٢. ومحالٌ تلبیسيّ .

## جۆری یەكەم: (حال شیطاني) او (حال إبلیسي):

واتە: دیاردەكە حاڵەتێكی شەیتانیەو جنۆكە شەیتانەكان یارمەتیان دەدەن و ئەو حاڵەتەیان پێ دەكەن.

واتە جنۆكە دەچێتە بەر ئەو مرۆڤەو ناو لەشیەوە، جابەهۆی ئەوەوە دەچێتە ناو ئـاگر، بـەڵام ئاگر لاشەی مرۆڤەكە ناسوتێنێت؛ چونكە بەری ناكەوێت و جنۆكەكە داپۆشیوە. وە هـەروەها مارو دووپشك دەخۆن، بەڵام جنۆكەكەی ناوی خواردوویەتی نەك مرۆڤەكە.

وە شیشەی سورەوە كراوی تیـژ بـەزمانی دادەهێنێـت و ناسوتێت چـونكە بـەر جنۆكەكـە دەكەوێت. نەك زمانی مرۆڤەكە وە چەندان حاڵەتی سەیرتریش كە شەیتانەكان بۆیان دەكەن و، خەڵكی وا دەزانێت مرۆڤەكە كردوویەتی، هەروەك چۆن كەسێكی نەخۆش كە جنۆكە چـووبێتە ناو لەشی و توشی (مَسّ) بووبێت، دەبیـنین چارەسـەركەر لـە مرۆڤەكـە دەدات بـۆ دەركردنـی جنۆكەكە، بەڵام لێدانەكە بەر جنۆكەكە دەكەوێت، بۆیە دوای دەرچوونی جنۆكەكـە، مرۆڤەكـە هەست بە لێدان ناكات ودەڵێی لەویش نەدراوە !.[1]

---

(١) بڕوانە: مجموع الفتاوی (١١ / ٤٩٥) .

## جۆری دووەم: (محال بُهتانيّ، او تلْبيسي):

واتە ئەم دیاردە سەیرانە لە ئەنجامی فێڵی دروست کراوی سەر لێ شێوێنەر دروست دەبن. واتە بە چەند فێڵێکی تایبەت ئەم دیاردە سەیرانە ئەنجام دەدەن.

بۆ نموونە:

* هەندێکیان جۆرە شتێك دەخواتەوە کە کاریگەری ژەهری مار ناهێڵێت، بۆیە گاڵتە لەگەڵ مار دەکات ودەیگرێت بێ ترس؛ چونکە ئەگەر پێشی وەدات زەرەری پێ ناکەوێت.

* یان ڕاهێنان دەکەن لەسەر گرتنی مار بە شێوەیەکی فێڵ بازانە، کە نەهێڵن مارەکە بەوە ڕابگات، پێیان وەدات.

* وە لە(٧٠ ٪)ی مار ژەهری نیەو، لە(٣٠ ٪) ژەهریان هەیە. وە ئەوان دەیان ناسن و لێکیان جیا دەکەنەوە، بۆیە هەندێ جار کە ماری ژەهراوی دەبینن، دەڵێن ئەوە ماری بێ ئیجازەیە!. یان بەو مارانە دەڵێن کە دۆستایەتی شەیتانانەیان لەگەڵیاندا نیە.

* یان ماری ئاوی دەگرن.

* وە یان پێستی مار دادەدڕن و پڕی دەکەن لە خواردن، وە لە پێش چاوی خەڵك دەیخۆن و خەڵك وا دەزانێت ماری ڕاستی دەخوات !!.

* وە هەیانە جۆرە دەرمانێك دروست دەکات کە کاتێ لە خۆی دەدات، ئاگر نایگرێت و نایسوتێنێت. بۆیە بەسەر ئاگرەکەدا دەڕوات.

* وە هەیانە گوڵاو لە دەستی دێت، یان هەنگوین دروست دەکات ...

* وە چەندەها فێڵی تریشیان هەیە کە فێڵ و سیحر لە چاوی خەڵکی دەکەن. وە لە ئەفلامی سێرکی جیهانی دیاردەی زۆر لەمانەش سەیرتر دەبینرێن کە لە لایەن کەسانێکەوە دەکرێن کە هەر لە بنەڕەتەوە کافرن و هیچ ئیمانیشیان بە خوا نیە، کە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ فێڵی ون و وردو شاراوە ، یان جادوو و سیحربازی. بەڵام بەدووری نازانم کە نەفامەکان ئەو کافرانەش بە ئەولیای خوا دابنێن و دیاردەکانیشیان بە کەرامەت !.

وە کە زانیت ئەم دیاردە سەیرانە چۆن دەکەن، دڵنیا دەبێت کە ئەمانە بە ڕاستی (أولياء الشيطان)ن.

وە زانايانى ئيسلام پەردەيان لاداوە لەسەر ئەم حاڵەتە شەيتانيەو، فێڵە سيحريانە.وە بۆ خەڵكيان ئاشكرا كردووە كە ئەم دياردانە كەرامەت نين و نيشانەى(أولياء الرحمن)نين. وە با بگەڕێينەوە بۆلاى شێخ الاسلام-ڕەحمەتى خواى لێبێت - بزانين چۆن وەسفى ئەم دياردە ناعادەتيانەى بۆ كردووين:

((كرامات الأولياء لا تكون بما نهى الله عنه ورسوله ... كما لا تكون بترك الواجبات، وإنما هذه المخارق التي يفعلُها هؤلاء المبتدعون: من الدخول في النار، وأخذِ الحياتِ، وإخراج اللاذن، والسكر، والدم، وماء الورد. هي نوعان:

((أحدهما)) أن يفعلوا ذلك بحيل طبيعيّة: مثل أدهان معروفة، يذهبون ويمشون في النار، ومثل ما يشربه أحدهم مما يمنع سُم الحيّة ومثل أن يُمْسكها بعنقصتها حتى لا تضُرّهُ، ومثل أن يُمسك الحيّة المائيّة، ومثل أن يسلَخَ جلد الحيّةِ ويحشوها طعاماً، وكم قتلَت الحيّاتُ من أتباع هؤلاء.[ وما يصنعونه من السكر واللاذن، وماء الورد وماء الزعفران والدم، فكل ذلك حيل وشعوذةٌ يعرفها الخبير بهذه الأمور ][1].

[ وإن عامّة ذلك عن حيل معروفة وأسبابٍ مصنوعة ][2].

((النوع الثاني)) وهم أعظم: عندهم أحوال شيطانية تعتريهم عند السماع الشيطاني، فتنزل الشياطين عليهم، كما تدخل في بدن المصروع ويزبد أحدهم كما يزبد المصروع، وحينئذٍ يباشر النار، والحيات، والعقارب، ويكون الشيطان هو الذي يفعل ذلك،كما يفعل ذلك من تقترن هم الشياطين من إخوانهم، الذين هم شرّ الخلق عند الناس، من الطائفة التي تطلبهم الناس لعلاج المصروع، وهم من شر الخلق عند الناس، فإذا طلبوا تحلّوا بحلية المقاتلة، ويدخل فيهم الجن، فيحارب مثل الجن الداخل في المصروع، ويسمع الناس أصواتاً، ويرون حجارةً يُرمى بها، ولا يرون من يفعل ذلك، ويُرى الإنس واقفاً على رأس الرُّمح الطويل. وإنما الواقف الشيطان، ويرى الناسُ ناراً تحمي. ويضع فيها الفووسَ والمساحي، ثم إنّ الإنس يلحسها بلسانهِ، وإنما يفعل ذلك الشيطان الذي دخل فيه، ويرى الناسُ هؤلاء يباشرون الحيات والأفاعي وغير ذلك...

---

(١) (١١ / ٤٩٦) .

(٢) (١١ / ٤٤٧)

**والجهال لأجل هذه الأحوال الشيطانيّة، والطبيعيّة، يظنّونهم أولياء الله؛ وإنما هذه الأحوال من جنسِ أحوال أعداء اللهِ الكافرين، والفاسقين))**[1]

(( وهؤلاء إذا أظهر أحدهم شيئاً خارقاً للعادة لم يخرج عن أن يكون حالاً شيطانيّاً أو محالاً بُهتانيّاً ))[2]

*** وە هەروەها ئیمامی الصنعانی بەم شێوەیە وەسفی كردوون دەفەرموێت:**

((قلتُ: هذه أحوالٌ شيطانية، وإنّك لَمُلَبِّسٌ عليك إنْ ظننْتها كرامات للأموات أو حسنات للأحياء؛ لما هتف هذا الضال بأسمائهم جعلهم أنداداً وشركاء لله تعالى في الخلق والأمر. فهؤلاء الموتى أنت تفرض أنهم أولياء الله تعالى، فهل يرضى ولي الله أن يجعله المجذوب أو السالك شريكاً له تعالى وندّا ؟!:

❶ إن زعمت ذلك فقد جئتَ شيئاً إدّاً. وصيّرت هؤلاء الأموات مشركين، وأخرجتهم ـ وحاشاهم عن ذلك ـ عن دائرة الإسلام والدين، حيث جعلتهم أنداداً لله راضين فرحين.

❷ و إنْ زَعمت أن هذه كراماتٌ لهؤلاء المجاذيب الضلال المشركين التابعين لكل باطل، المنغمسين في بحار الرذائل، لا يذكرون الله وحده، فإنْ زعمتَ هذا فقد أثبتّ الكرامات للمشركين الكافرين وللمجانين، وهدمت بذلك ضوابط الاسلام وقواعد الدين المبين، والشرع المتين.

وإذا عرفت بطلان هذين الأمرين علمت: **أن هذه أحوال وأفعالٌ طاغوتيّة وأعمالٌ إبليسيّة يفعلها الشياطين لإخوانهم من هؤلاء الضالّين معاونةً من الفريقين**. وقد ثبت في الأحاديث أن الشياطين والجانّ يتشكلون بأشكال الحيّة والثعبان. وهذا أمرٌ مقطوعٌ بوقوعِه. فهم الثعابين التي يشاهدها الإنسان في أيدي المجاذيب.

**وقد يكون ذلك من باب السحر**، وهو أنواع وتعلّمُهُ ليس بالعسير، بل بابه الأعظم هو الكفر بالله، وإهانةُ ما عظّمَهُ اللهُ مِن جعله في كنيفٍ ونحوه.

فلا يغتر مَنْ يشاهد ما يعظم في عينيه من أحوال المجاذيب من الأمور التي يراها خوارق فإن للسحر تأثيراً عظيماً في الأفعال.

(1) (١١/ ٦١٠ ـ ٦١١).
(2) {المجموع١ / ٨٢ }.

وهكذا الذين يقلبون الأعيان بالاسحار وغيرها. وقد ملأسحرة فرعون الوادي بالثعابين والحيّات حتى أوجس في نفسه خيفة موسى ـ عليه السلام ـ وقد وصفه الله بأنه سحر عظيم.

وأخرج البيهقي في السنن الكبرى. فذكر بسنده إلى الأسود: أن الوليد بن عقبة كان بالعراق يلعبُ بين يديه ساحرٌ، فكان يضربُ رأس الرجل ثم يصيحُ به فيقول صارحاً فيرد اليه رأسه.

فقال الناس: سبحان الله ! يُحْيِ الموتى !!.

ورآهُ رجلٌ من صالحي المهاجرين، فلما كان من الغد اشتمل على سيفه. فيذهب يلعب لعبه ذلك. فاخترط الرجل سيفه فضرب عُنُقَهُ وقال: إن كان صادقاً فَلْيُحْيِ نفسهُ !!..انتهى

فالأحوال الشيطانيه لا تنحصر. وكفى بما يأتي به الدجال[1]. والمعيارُ اتباع الكتاب والسنة ومخالفتهما. انتهى

**وە لێرەدا هەروەك چۆن ئیمامی ( الصنعانی ) بەوە كۆتایی هێنا بە كتابەكەی ئێمەش هەر بەوە كۆتایی دەهێنین بەم نوسراوەی بەردەستت، كە داواكارم لە پەروەردگار لێم قەبوڵ بكات و، بۆم بە ئەجر بنوسێت و، تەنها لەبەر خاتری ئەوم بووبێت و، موافیقی حەق بووبم لە نوسینەكەمدا. وە خوای گەورە بیكات بە جیاكەرەوەی نێوان دینی تەنها خوا پەرستان و دینی هاوبەشی پەیداكەران. وە سود بگەیەنێت بە هەموو موسڵمانێكی كورد زوبان بەهۆی ئەم نوسراوەو، ئەوانیش دوعای بەخێرم بۆ بكەن لەبەرامبەری.**

وسبحان ربك رب العزّة عما يصفون. وسلامٌ على المرسلين
والحمد لله رب العالمين

ليلة الخميس
١٦ / ربيع الثاني / ١٤٢٣ هـ
٢٧ / ٦ / ٢٠٠٢ م
أبو عبد الحق عبداللطيف أحمد مصطفى ـ وفّقه الله ـ

(1) بڕوانە نامیلكەی (چیرۆكی مەسیحی دەججال) . نوسینی نوسەری ئەم كتێبە.

## سەرچاوە گرنگەکان ﴿المصادر والمراجع﴾


١. القرآن الكريم.مع التفاسير .
٢. كتب الحديث الشريف. مع الشروح.
٣. كشف الشبهات .
٤. فتح المجيد شرح كتاب التوحيد.
٥. قرة عيون الموحدين.
٦. القول المفيد على كتاب التوحيد — ابن عثيمين.
٧. القول السديد شرح كتاب التوحيد. — عبدالرحمن بن ناصر السعدي.
٨. مجموع الفتاوى . — ابن تيمية
٩. معارج القبول — الحافظ الحكمي.
١٠. أعلام السنة المنشورة — الحافظ الحكمي.
١١. إغاثة اللهفان — ابن قيم الجوزية.
١٢. الجواب الكافي — ابن قيم الجوزية.
١٣. الضياء الشارق في رد شبهات الماذق المارق — سليمان بن سحمان.
١٤. المدخل لدراسة العقيدة الاسلامية. — إبراهيم البريكان.
١٥. تجريد التوحيد المفيد. — أحمد بن علي المقريزي.
١٦. فتاوى اللجنة الدائمة.
١٧. تطهير الاعتقاد — الصنعاني.
١٨. تطهير الجنان والأركان عن درن الشرك والكفران.أحمد بن حجر آل بوطامي.
١٩. الآيات البينات في عدم سماع الأموات — نعمان ابن المفسر الآلوسي.
٢٠. هذه مفاهيمنا — صالح بن عبدالعزيز آل الشيخ.
٢١. التوسل أنواعه وأحكامه — الألباني.
٢٢. السلسلتان: الصحيحة والضعيفة. — الألباني.

# پوختەو ناوەڕۆکی کتابەکە

**لە وەڵامی ئەم بۆچوونە هەڵەیەدا دەڵێین: ئەم جۆرە بیروباوەڕو بۆچوونە سەرچاوەكەی زۆر تاوانێكی گەورەیە چونكە لەوەوە سەری هەڵداوە كە تەشبیهی خوای پەروەردگار كراوە بە دەسەڵات دارێكی دروست كراو. واتە خوای پەروەردگار چوێنراوە (شُبِّهَ) بە بەندەی دروستكراو. وە ئەم وێچواندن و تەشبیەكردنەش:**

**أ- لەلایەكەوە شیرك بڕیاردانە بۆ خواو، هاوشێوەو هاوەڵ دانانە بۆ پەروەردگار ؛ كە وەك كاربەدەستێك بڕوامان پێی بێت، واتە چۆن پێویستیمان بە واسیتە هەیە بۆلای كاربەدەستێكی (زاڵم) یان (بێ ئاگا) یان (بێ دەسەڵات)، بەهەمان شێوەش وابزانرێت پێویست بە واسیتە دەكات بۆلای خوای (عادڵ) (بە ئاگای) (بە دەسەڵات).**

**ب-وە لەلایەكی تریشەوە دابەزاندنی ڕێزو قەدرو گەورەیی خوایە كە (تەشبیە) بكرێت بە كاربەدەستێك لەوەدا كە پێویست بە واسیتە بكرێت بۆلای و بەبێ واسیتە وەڵامان نەداتەوەو یارمەتیمان نەدات ، وە بە هۆی واسیتە بتوانرێت كاریگەری لەسەر بكرێت و واسیتەكە تەئسیری لێ بكات !!. سبحان الله پەروەردگار زۆر پاك و بەرزترە لەم جۆرە باوەڕو بۆچوونەی نەفامان.**

**شوبهەی دوانزەهەم ( الشفاعة ): دەڵێن: هەموو موسڵمانێك باوەڕی وایە كە پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاكان شەفاعەت دەكەن بۆ موسڵمانان لە ڕۆژی قیامەتدا. كەوابوو ئێمە هەر لە دونیادا بەزوویی داوای ئەو شەفاعەتەیان لێ دەكەین كە خوا پێی بەخشیون. وە دەڵێین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەفاعەتمان بۆ بكە لای خوا. وە ئەی شێخ عبدالقادری گەیلانی شەفاعەتمان بۆ بكە لای خوا. چونكە هەروەكو لە قیامەتدا داوای**